

# سەرەتایەک
# فەلسەفەی کلاسیکی یۆنانی

حەمید عەزیز

# سەرەتایەك
# لە فەلسەفەی كلاسیكی یۆنان

حەمید عەزیز

چاپی سێیەم

كوردستان - هەولێر ٢٠٠٨

ناوی کتێب: سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان
بابەت: فەلسەفە
نووسەر: حەمید عەزیز
بەرگ : ئاگری باڵەکی
شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم: ١٩٧٩
چاپی دووەم: ٢٠٠٥
چاپی سێیەم: ٢٠٠٨ ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئاوێر
ژمارەی سپاردن: ژمارە (٤٩١)ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

نرخی (٤) چوار هەزار دینارە

# پێشەکی

هیچ لە خوێنەر ناشارمەوە ئەگەر بڵێم لە نووسینی ئەم کتێبەی ئێستاکە لەبەردەستدایە پرۆژەی چەند ساڵ و کۆششێکی زۆرە و چەندین کۆسپ و کێشەم هاتوونەتە ڕێگا، بەپێی توانا و شارەزایی خۆم و ئەو درفەتەی بۆم هەڵکەوتووە کۆششی تەخت کردنیانم کردووە، هەندێکیانم چارەسەر کرد و لە هەندێکی تردا نە شیش بسووتێ و نە کەباب و لە بەشی سێیەمدا وەك خۆیان بە کراوەیی هێشتمنەوە بۆ ئەوەی وەك گرێکوێرە لە بواری نووسینەکاندا پتر سەرەنجی خوێنەر رابکێشن و بیهێننە گۆڕەپانی بیرکردنەوە.

یەکەم کێشە کە دەستەویەخەم بوو لە بەرگی ئەم پرسیارەدا خۆی بینییەوە: چۆن و لە کوێیوە دەست پێ بکەم؟

هەوڵمدا، بەدوای نووسراوی کوردیدا گەڕام، کتێبخانەکانم پشکنی تەنانەت سۆراخی ۆ تاکە کتێبێکم بۆ نەکرا کە پێی بوترێ فەلسەفە و بە راستی ئەوم وشەیە پڕ بە پێستی خۆی بێ و بە زمانی کوردی نووسرابێ، بتوانێ لەم ڕێگایەی هات و نەهاتدا هەر نەبێ تۆزێك ڕێنوماییم بکات.

ناچار دەستم بە دامێنی ئەو ڕێبازەوە گرتەوە کە لە زانستگا و کۆمەڵە و کۆڕەکانی فەلسەفەدا رەچاو ئەکرێ و کە لە بەشی فەلسەفەی کۆلێجی ئادابی زانستگای بەغدا خۆم خوێندوومە.. شانم دایە بەری و دەستم کرد بە خوێندنەوەی سەرچاوە و گەڕان بە شوێن بەرهەمی فەیلەسووفەکاندا چ بە زمانی عەرەبی یاخود بە ئینگلیزی بووبێ.. هەندێ بەرهەم و سەرچاوەی باشم دەسکەوت و لە هەدێکی تردا ناکام بووم.. لەم دۆخەدا پەنام بردە بەر بەرهەم و کتێبی هەندێ نووسەر کە دەربارەی فەیلەسووف و فەلسەفەیان نووسیوە بۆ سوودلێوەرگرتن و پڕکردنەوەی ئەو کەلەبەرەی لە ئەنجامی دەستگیرنەبوونی هەندێ سەرچاوەی بنچینەییدا هاتبوو بەردەمم.

ناوەرۆك و بابەتەکانی کتێبەکە چۆن دابڕێژم، بۆچوونەکانم چۆن بن؟ بەو شێوەیە بن کە خۆم ئەمەوێ؟ یان وابن کە بەلای خوێنەرەوە پەسند بن؟ یاخود وەك یەکەم کتێبی مێژووی فەلسەفە کە بە کوردی ئەنووسرێ لە نیمچە ئینسکلۆپیدیایەك بچێ، با دوور و درێژ لە چەند بەرگێکدا بێ، بۆ ئەوەی هەر نەبێ جێگای خۆی لە کتێبخانەی

کوردیدا بگرێ و سەنگ و ڕەنگێکی هەبێ و ئەو کەلەبەرە پڕ بکاتەوە، خۆ ئەگەر خوێنەری کورد بەدوای فەیلەسووف و ڕێبازێکدا بگەڕێ ئەوا پێویستی بە سەرچاوەی زمانی بێگانە نەبێ و بە ئاسانی لەم بابەتە شتێکی لەو کتێبەدا دەستگیر ببێ.

"قسەی سێیەمیانم پەسند کرد. بڕیارمدا کتێبەکە لە چوار بەرگدا بێت و بەپێی چوار قۆناخەکەی پەرەسەندنی بیری فەلسەفە ڕەنگی بۆ بڕێژم... ئەم کتێبەش کە ئێستا لەبەر دەستت دایە بەرگی یەکەمیەتی و باسی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان ئەکات... کە لە سەدەی شەشەمی پێش زایینەوە دەست پێ ئەکات.

ڕێبازی کتێبەکە چۆن بێت؟ ئەم پرسیارەش کاتێکی زۆری ویست تاوەکو توانیم وەڵامێك لە مێشکمدا گەڵاڵە بکەم و ڕێبازێکی تایبەتی هەڵبژێرم و لە نووسینەکاندا پەیڕەوی بکەم. بۆو لەبەرچی، چۆن؟ لە وەڵامدا ئەڵێم: بۆیە و لەبەر ئەوە و چونکە چەند ڕێبازێك لە نووسینی بابەتەکانی فەلسەفەدا لەبەر دەست دایە کە بە تێکڕایی ئەکرێن بە سێ بەشەوە و هەر بە شەش نووسەر و لایەنگیری خۆی هەیە و داکۆکی لێ ئەکات و قسەی لایەنەکەی تر ڕەت ئەکاتەوە، سێ بەشەکەش ئەمانەن:

١. کتێبەکە بریتی بێ لە مێژووی فەلسەفە و باسێکی ڕێکوپێکی مێژوویی دەربارەی چۆنێتی سەرهەڵدان و پەرەسەندن و گەشەکردنی فەلسەفە و بیروڕای فەیلەسووفەکانی تێدا بێ.

٢. باسکردنی ڕێباز و کێشە و قوتابخانە سەرە گرنگەکانی فەلسەفە بەبێ گوێدانە قۆناخ و پەیوەندی کات و شوێن و زنجیرەی پەرەسەندنیان.

٣. تێکەڵاوکردنی هەردوو ڕێبازەکەی تر، واتە کتێبەکە مێژووی فەلسەفە بێت و ڕێباز و کێشەکانیش باس بکا.

بە باوەڕی من هەرسێ ڕێبازەکە چاکی و کەموکوڕییان تێدایە.

ڕاستە، یەکەم ڕێگا، بابەت و کەرەسە و شارەزاییەکی باش دەربارەی فەیلەسووف و مێژووی ژیان و کۆمەڵ (دەوروبەر) و بەرهەم و ڕێبازەکانیان ئەداتە دەست، بەڵام لەلایەکی ترییەوە تۆزێك خوێنەر بێزار ئەکات چونکە وەك من بۆی ئەچم خوێنەرێکی ئەم سەردەمەمان کە ئارەزووی خوێندنەوەی فەلسەفەی دەکەوێتە کەللەوە، لەبەر چەند هۆیەکە... بۆ نموونە ئەو سەوداسەری وەڵام و کردنەوەی گرێکوێرەی ئەو کێشانەی فەلسەفەیە کە ئەمڕۆ دووچاریان بووە یاخود لە ژیانی ڕۆژانەدا لەگەڵیاندا

دەژی... ئەگەر کتێبێکی فەلسەفەی کلاسیکی دەست کەوێ و بیخوێنێتەوە یەکسەر سڵ ئەکاتەوە و سەرسام ئەبێ، ئەو ئەیەوێ بزانێ هەراوهوریا و راستی کێشەی نێوان ئایدۆلۆژیا و تەکنەلۆژیا چییە؟ کەچی کتێبەکە باسی سوقرات و ئەپیقۆرێزمی بۆ ئەکات.

دووەم رێبازیش چەند کێشەیەکی فەلسەفە تۆمار ئەکات کە هەر بە گەرم و گوڕیی ماونەتەوە و پلە و پایەی خۆیان لە دەست نەداوە و نووسەر بەپێی بۆچوونی خۆی چارەسەری ئەو کێشانە ئەداتە دەست... دووریش نییە ئەو بابەتانەی تیادا بێ کە خوێنەری ئەمڕۆ بەدوایاندا ئەگەڕێ... ئەم رێگایەش هەر لە کەلەبەر قوتار نەبووە و نابێ... چونکە زنجیرەی پەرەسەندنی مێژووییەکەی فەلەسەفە پشتگوێ ئەخات و ناچار بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی کێشەکان زۆر بابەتی نایاب و داگیرساو بخاتە لاوە.

رێگای سێیەم، هەروا بە سووك و ئاسانی خۆی بەدەستەوە نادات و دەستەمۆ نابێت... ئەتوانم بڵێم ئەمە بە تەنیا کاری تاکە نووسەرێك نییە و لە دەست یەك کەس نایەت ئەویش لەبەر کورتی تەمەن و ژیان و زۆریی فەیلەسووف و بەرهەمەکانیان، دووروودرێژی و ئاڵۆزی بابەت و کێشەکان کە بە چەند ئینسکۆلۆپیدیایەك تەواو نابن.

من لەم کتێبەدا یەکەم رێگام هەڵبژارد چونکە بە تەواوەتی لەگەڵ بۆچوونەکەی هیگڵی مەزندام کە ئەڵێ: "هەموو فەلسەفەیەکی لەمەوبەر لە کاتی خۆیدا و ئێستاش پێویست بووە. هیچ جۆرە فەلسەفە و رێبازێك لەناو نەچوون.. دوا رێبازی فەلسەفە ئەنجامی هەموو فەلسەفەکانی پێشووی خۆیەتی". ئەگەر بپرسین بۆ؟ لە وەڵامدا ئەڵێین هیگڵ ئەو قسەیە رەت ئەکاتەوە کە ئەڵێ: مێژووی فەلسەفە مێژوویەکی وشکی بێگیانی بێ پەیوەندییە دەربارەی چەند فەیلەسووف و رێبازێك کە هیچیان بەسەر هیچەوە نییە، هەندێکیان بە کۆرپەیی سەریان ناوەتەوە و هەندێکایشیان لە گیانەڵاو پەلەقاژەی مەرگ دان و بەشێکی تریشیان رۆژگار هێشتوونیەتەوە.

"فەلسەفە لە پەرەسەندنی دا وەك شین بوون و روانی درەختێك وایە... شین بوونی نەمامەکە ون بوونی تۆوەکەیە... درەختەکە گەڵا دەرئەکات... گەڵاکان ئەبن بە گوڵ... وا دەرئەکەوێ کە گوڵەکان (زەوتکردن) و رەتکردنەوەی گەڵاکانن... ئینجا گوڵەکە ئەبێ بە (بەر) ئەم بەرەش بە بوونی خۆی رای ئەگەیەنێ کە گوایە گوڵەکە وێنەیەکی درۆزنی درەختەکەیە".

بەلام کێشەکە شێوەیەکی تری هەیەو لە چوارچێوەیەکی تردا خۆی ساخ ئەکاتەوە چونکە "لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کامێك لە گەلا، گوڵ، بەر _ نەیاندەتوانی بێنە دی و رووناکی ببینن ئەگەر قۆناخی پێشووی خۆیان لە پێشەوە نەهاتبایە". واتە لە هەموو قۆناخەکانی بەرەوپێش چوون و گەشەکردنی فەلسەفەدا فەیلەسووفێك بەدی ئەکەین کە هێرش ئەباتە سەر فەیلەسووفەکەی پێش خۆی و وا دەرئەکەوێ کە بە یەکجاری دار و پەردووی کۆشك و تەلای رێبازەکەی رامالیوە و هیچی بەسەر هیچەوە نەهێشتووە.. یاخود بە شێوەیەکی تر، وەك ئارنست ماخ لاف لێی دواوەو وتوویەتی:

"من قەرزداری کەس نیم و لە بەرهەمەکانمدا هیچ شتێکم لە کەس وەرنەگرتووە".

ئەمە دروست نییە. چونکە راستە ئەرستۆ هێرش ئەباتە سەر ئەفلاتوونی مامۆستای و فەلسەفەکەی رەت ئەکاتەوە.. بەلام بوونی فەلسەفە و قوتابخانە و ئەکادیمیای ئەفلاتوون بۆ دروستبوونی فەلسەفەی ئەرستۆ زۆر پێویست بوون.

بەم پێیە دەستمان بە نووسینی کتێبی مێژووی فەلسەفە و ژیان و بەرهەم و فەلسەفە و رێبازە گشتییەکانی فەیلەسووفەکان کرد... بەرهەمەکەمان لە دەوروبەری تەواوبووندا بوو هۆیەك بگرە دۆخێکی نوێ هاتە پێشەوە کە ئەتوانم بڵێم دەرفەتێکی باشی چاوەڕوان نەکراو بوو لە ئاسمان سەوداسەری بووم کەچی لەسەر زەوی دەستم کەوت.. ئەو دەرفەتە ئەوەندەی تر هانی دام کە بە گوڕتر ببم و پشتم سار نەبێتەوە... هەروەها ناچاریشی کردم کە بەرکوڵێك لەگەڵ بەرهەمەکەدا پێشکەش خوێنەران بکەم... بەرکوڵەکەش ئەمەیە:

بەراوردکردنی فەلسەفە لەگەڵ ئایین و زانستدا و جیاوازی و لە یەکتری چوون لە نێوانیاندا چییە؟

لقەکانی فەلەسەفە: لوژیك، تیۆری زانین، میتافیزیك، ئاکار (ئەخلاق)، ئیستاتیك و سۆفیزم.

راستە ئەم لقانە بابەتی سەربەخۆن و پێویستیان بە کتێبێکی تایبەتی هەیە کە بۆیان تەرخان بکرێت.. بەلام لەبەر ئەوەی ئەمە یەکەم جارە بە کوردی کتێبێك لەسەر فەلسەفە چاپ ئەکرێ و لەگەڵ ئەو دۆخ و درەفەتەی لەناکاو هاتە پێشەوە نەمتوانی پشتی تێبکەم.

راسته ئەو بەرکوڵە سەرەتایە بە کورتی نووسراوە، دوور نییە سادەش بێت... خۆ ئەگەر دەستی رۆژگار دەرفەتم بدات ئەوا ئەو ئاواتەش ئەهێنمە دی و بە رێکوپێکی و تەسەلیی ئەم لقانەی فەلسەفە وەك بابەتی سەربەخۆ لە کتێبی تایبەتیدا کە بۆ هەر یەکێکیان تەرخان کرابێ، چاپ ئەکەین.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییە کورتەدا ئەگەر لەم کتێبەماندا هەندێ بیروڕا و هەڵوێستمان باس نەکردبێ، بە تایبەتی هی نووسەرە هاوچەرخەکان ئەوا ئەمە بەسەرا تێپەڕین و لەبیرچوون و پشتگوێ خستن ناگەیەنێ بەڵکوو لەوەوە هاتووە کە ئێمە لەگەڵ ئەو قسەیەدا نین یاخود باوەڕمان پێی نییە بۆیە نەمان نووسیوە و باسمان نەکردووە.

هەر چۆنێك بێت کەشتییەکەمان لەو دەریا بێ بن و شەپۆلاوییەدا کەوتە رێ و ئێمەش بەنیازی پاك و خاوێن کەوتینە سەوڵ لێدان.

هیواداریشم کە بە چاوی لێبووردنەوە سەیری بکرێت و هەر نەبێ بە تەقەلایەك دابنرێ کە خاوەنەکەی ویستوویەتی خزمەتی وشەی کوردی و کتێبخانە بێنازەکەی کوردەواری پێ بکات.

قەلادزێ

١٩٧٦/٦/٢٠

# کێشەی فەلسەفەی یۆنان

**سەرەتا:**

کێشەیەك لەو کێشە سەختانەی کە راستەوخۆ و یەکسەر لەبەردەم تۆمارکردن و نووسینەوەی مێژووی کلاسیکی فەلسەفە و رێبازەکانیدا قوت ئەبنەوە ئەو بابەتەیە کە بە "کێشەی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان" ناونراوە... ئەم کێشەیەش، پێش هەموو شتێك پێویستی بە لێکدانەوە و شیکردنەوە هەیە بۆ ئەوەی کۆسپی سەر رێگای چوونە ناو جیهانی پان و بەرینی فەلسەفە تەخت و گرێکوێرەکانی یەکالا و گۆشە تاریکەکانی رووناك بکرێنەوە، و ئەو تەپوتۆزەی لێ بتەکێنرێ کە بە درێژایی مێژوو و رۆژگار لێی نیشتووە. چارەکردنی ئەم کێشەیەش - بە باوەڕی من- لە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانەوە دێت:

ئایا سەردەم یا قۆناخێکی دیارکراو هەیە کە بتوانین بڵێین لەم قۆناخەدا فەلسەفە هاتۆتە کایەوە و پێش ئەو سەردەمە فەلسەفە نەبووە؟

یەکەم جار، فەلسەفە لە رۆژهەلات یاخود لە رۆژئاوا سەری هەڵداوە؟ بۆ چۆن و لەبەرچی؟!

ئەو گیروگرفتانە کامانەن ئەگەر بریار دران لەسەر ئەوەی "یەکەم جار گوڵی فەلەسەفە لە یۆنان پشکوتووە" ئەیانهێنێتە کایەوە؟!

بۆچی فەلسەفە لە ولات و شوێن و قۆناخێکی تایبەتیدا هاتۆتە دنیاوە و لە شوێن و قۆناخی تردا نەبووە؟!

ئایا ئەگونجێ و لێکۆڵینەوەی زانستی رێگامان ئەدات بڵێین فلانە فەلسەفە هینی یۆنانە و فیسارە هینی ولات و نەتەوەیەکی ترە، یان نا؟ ئەنجانی ئەمەش چی ئەبێت؟

شارەزا و مێژووناس و فەیلەسووفەکان لەو باوەڕەدان کە قۆناخێکی تایبەتی و سەردەمێکی دیاریکراو هەیە تیایدا فەلسەفە لەدایك بووە. بەلام سەردەم و شوێنەکە کامەیە؟ ئەوان لە وەلامدانەوەدا ئەبن بە دوو بەشەوە و دوو رای جیاوازی دێنە کایەوە:

تاقمی یەکەم کە لە ئەرستۆوە[1] دەست پیێ ئەکات لەو باوەڕەدان کە فەلسەفە لە سەدەی شەشەمی پێش زایین لە یۆنان هاتۆتە کایەوە و تالیس یەکەم فەیلەسووف بووە.

تاقمی دووەمیش لە "دیوجین لایرتۆس"ەوەیە کە ئەڵێن: فەلسەفە لە باوەش و ئامێزی شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتدا چرۆی کردووە و بەهۆی تێکەڵابوون و هاتوچۆ و وەرگرتن و بەخشینەوە پەرپوەتەوە و گەیشتۆتە لای یۆنانییەکان.

بێگومان هەردوو رایەکە کەلەبەریان تیادایە و هەردووکیان بەروبووم و تەقەللای شارستانییەتێك لە دوو شارستانییەتەکە (ڕۆژهەڵات و یۆنانی کۆن) پشتگوێ ئەخەن... چونکە بە پشتیوانی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم سەردەمەماندا کراون دەرکەوتووە کە فەلسەفە لە یۆنانی کۆن لەدایك بووە و بەرهەمی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتیش سەرەڕای خاسیەتەکانی گەلی یۆنان و ئەو دۆخ و زروفە لەبارەی بۆیان هاتبوونە پێشەوە هۆ و کارکردەو و یاریدەدەری ئەم سەرهەڵدانی فەلسەفەیە بوون لە یۆناندا. جا بۆ ئەوەی زیاتر ئەم لایەنە روون بکەینەوە تویکڵ و کاکڵ لە یەکتری جیا بکەینەوەە و رایەکەمان لە دەمارگیریی و بەلایەکاشکاندن و سەرپێیی دوور بیێ وا پێویست ئەکات کە بە وردی بەپێی توانا سەرەنجێك بدەین لە:

هەردوو شارستانییەتی کۆنی ڕۆژهەڵات (میسر، بابل، فارس، هیندستان، چین) و شارستانیەتی کۆنی یۆنان و کەرەسەکانیان یەکالا بکەینەوە..

دەستنیشانکردن و لێکدانەوە و تویێ تویێ کردنی[2] فەلسەفە و لق و ناوەرۆك و بابەتەکانی، بۆ ئەوەی لە کەرەسەکانی تری شارستانیی جیا بکەینەوە (ئایین، زانست و هونەر...). ئەو فەلسەفەیەی لە قۆناخێکی دیاریکراودا تاجی شاهانەی کردە سەر نەتەوەیەك و ناوی لە مێژووی هەرگیز لەبیر نەچووندا تۆمار کرد و بەردی بناخەی کۆشك و تەلارێکی وای دانا کە ئەمرۆکە ئامیزادی سەدەی بیستەم لەژێر سێبەریدا ئەحەسێتەوە.

بۆ لێکۆڵینەوەی شارستانییەکانی کۆنی ڕۆژهەڵات دوو کۆسپ دێنە بەردەم: نەبوون و کەمی سەرچاوە، جیاوازی و ناتەبایی نێوان بیروڕای شارەزا و پسپۆران لەسەر

---

[1] Aristotle: Metaphysica, oxford university press, Eng. Tran 1960, A_30 983b _20

[2] وشەی تویێ تویێ کردن لە جیاتی وشەی (شرح) عەرەبی و (explain)ی ئینگلیزی بەکارهێنراوە.

لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی ئەو شارستانییەتەی کە لە میسر و بابل و فارس و هیندستان و چیندا سەری هەڵداوە. بەپێی ئەو گەڕان و پشکنین و لێکۆڵینەوانەی لەم بوارەدا کراون دەرکەوتووە کە بەروبوومی ئەم شارستانییەتانە بریتی بوون لەم کەرەسانەی خوارەوە[1]:

* پزیشکی.
* ئەستێرەناسیی و فەلەك.
* ماتماتیك (ئەندازە و ژمێرە).
* حوکمڕانی (دەوڵەت و سیاسەت).

* داستان و ئەفسانە و بیروڕا دەربارەی ئایین و ژیان و مەرگ و نەمریی و گەردوون و سروشت و خواوەندەکان.

ئەو شوێنەوار و پاشماوانەی دۆزراونەتەوە و گرێ کوێرەکانیان کراوەتەوە دەری ئەخەن ئەو زانستە پزیشکییە لە میسردا پێشکەوتوو بووە. تەنانەت ئەوەندەش رێزی لێنراوە گەیشتۆتە ئەو رادەیەی "ئیمحتب" ناوێك پزیشك بووە یەکسەر کراوە بە وەزیری مەلیك (زوسر) و لە سەدەی (٣٠)ی پێش زایینیدا خەڵکی پەرستوویانە و بە خواوەندی لەش ساخییان داناوە[2].

لە ماتماتیکیشدا لە (ئەندازە و ژمێرە)دا میسرییەکان دەست رۆیشتوو بوون، هەرەمەکان و ئەو چەند بابەتە ژمێرییەی لە پاشیان بەجێماوە راستی ئەم قسەیە ساخ ئەکەنەوە.

بابلییەکان دەستێکی باڵایان لە ئەستێرەناسیدا هەبووە، تەنانەت بەهۆیەوە رۆژژمێریان داهێناوە ئەو کاتەیان دۆزیوەتەوە کەتیایدا ئەستێرەی ڤێنووس و عەتارد (Mercury) لەگەڵ خۆردا بەراورد ئەبن[3]... داستان و خواوەند، یاساکانی حامورابیش پێویست بە باسکردن ناکەن.

---

[1] ئێمە لێرەدا باسی ئەو بابەتانە ئەکەین کە یاریدەی باسەکەمان ئەدەن و ئەو بابەتانە پشتگوێ ئەخەین کە پەیوەندییان بە نووسینەکەمانەوە نییە.

[2] جۆرج سارتون: تاريخ العلم ج ١، ت: ابراهيم ببومي مدكور و جماعته. دارالمعارف بمصر ١٩٦٣، ص ١١٢.

[3] جۆرج سارتون: هەمان سەرچاوەی پێشوو _ ل ٢٥٨.

لـه فارسـدا "زەردەشـت" لـه هيندسـتان "بـودا و ماهـاڤيرا" و لـه چـين "لاوتـسى و كۆنفۆشـيوس"[1] دەركـەوتن كـه ڕێبـاز و بيروڕايـان بـه تێكڕايـى دەربـارەى ئـايين و پاشـەڕۆژ و خواوەنـد و مـردن و ژيـانى چاكه و بـەدكارى و ئاكـار بـووە. بۆيـه بـەبێ چەندوچۆنكردن ئەڵێين شارستانييەتێكى پايەبەرز و گەشەكردوو لە دۆڵـى هـەر سێ زێيە گەورەكەدا (نيل _ ديجله و فرات_ سند) هەبووە. پەرەى سەندووە، جێگاى خۆ لـه كۆمەڵـدا كردۆتـەوە و ئـەو پلەيـەى وەرگرتـووە كـه شـياويەتى، وەلامـى پرسـيارى ژيانى ڕۆژانەى خەڵكى داوەتەوە و خۆ ئەگەر وەلامەكانيش زانستييانه نـەبووبن ئـەوا بـەپێى سـەردەمى خۆيـان كەلەبـەرێكيان پـڕ كردۆتـەوە و گرێكوێرەيـەكيان يـەكالا كـردووە و نـاخى ورووژاوى خـەڵكيان هـێمن و ئـارام كردۆتـەوە. لـه بـوارى سياسـيدا ولاتانى ڕۆژهەلات لە چەند مەليك و قەڕاڵچەيەك پێك هاتبوون، ئەو پاشايانە لە ستەم و ديكتاتۆريدا بێوێنه بوون تا ئـەو ڕادەيـەى زۆر جار وايان بـه خـەڵكى نيشان ئـەدا ئەوان خواوەندن و ئەبێ بپەرسترێن و لەوەش پتر چەند پياوێكى ئايينى "كـاهن"يـان لە خۆيان نزيك كردبۆوە بۆ ئەوەى شـوورەيەكى پيرۆزى سـەختى پۆلايى بـه دەورى حوكمەكەياندا بكێشن و هيچ كەسێك نەتوانێ و دەسەلاتى نـەبێ بپرسـێ بلّـێ: ئەمـه بۆ وابێ؟ ياخود بيەوێ دەست لە كاروبارى سياسەت وەربدات.. تەنانـەت كێشەى دەســەلاتەكانى دەوڵــەت و سەرچــاوەكانى ياســا شــتێك نــەبوون كــه لــه وزەى هاوولاتييانى ڕۆژهەلاتدا بن لێوەى بكۆڵنەوە ياخود دەستى بۆ درێژ بكـەن و تيشكى شيكردنەوەى بخەنه سەر، ئاينيش به ئاگر و ئاسن بەسەر خەڵكيدا ئەسەپێنرا و وەك تـەوقى عـەزازيل چـوبووە گەردنـەوە و ئـەبوو هـەموو بيركردنـەوە و جوولانەوەيـەك لـه چوارچێوەى ئەو ئايينەدا بن و سنوورى نەشكێنن. لەمەش پتر ئادەميزاد لە پێناوى مەبەستێكى گشتيدا شـتێكى زۆر ئاسايى بـوو... لـه جيهـان و شارسـتانێتى يۆنانـدا مەسەلەكه به شێوەيەكى تر بـوو. لـه سەرەتادا بەرهەمـەكانى هـوميروس (ئـەليادە و ئۆديسيا) و هزيـود (كـردەوە و ڕۆژگـار)[2] بـەدى ئـەكرێن. لـەم بەرهەمانـەدا _ كـه بـه شــيعر نووســراونەتەوە_ وێنەيــەكى خــەيالاوى دەربــارەى سروشــت و گــەردوون و خواوەنـدەكان و ئـايين و ژيـان و مـەرگ پێشكەش ئەكـەن... گـرنگترين كێشەى ئـەم بەرهەمانه كه كاريان كردۆته سەر فەلسەفەى يۆنان بيرى قەزاو قەدەر و چارەنووس و چارەناچارييە.. دواى ئەم قۆناخه كۆمەڵى يۆنان پێى ناوەته قۆناخێكى ترەوە تيايدا

---

[1] بۆ پتر شارەزابوون له كۆنفۆشيزم بڕوانه كتێبى:

ا. داجوبرت د.رونز: فلسفة القرن العشرين ص ٣٢٣_ ٣٣٠.

[2] works and days.

لە هەر شارە دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بووە و پێیان وتووە دەوڵەتی شار[1] (City state) لەو دەوڵەتانە و لەژێر سێبەری ئەم رژێمانەدا شارستانیەتی یۆنان بە هەنگاوی گەورە بەرەوپێش چووە... چەندین دەستوور دانراو گۆڕدرا، ئابووری و بازرگانی گەشەیان کرد. لە بازرگانی دەریا و کەشتییەوانیدا یۆنان بەسەر میسردا زاڵ بوو، یۆنانییەکان لەبەردەم هێرشی فارسدا دلێرانە بەرگەیان گرت.

هەر لەو سەردەمەشدا بوو کە فەلسەفە لەسەر دەستی تالیس[2](دانایەکە لە حەوت داناکەی یۆنان) پشکوت، زانستیش لە پەرەسەندن و پێگەیشتندا قۆناخی باشی بڕیبوو[3].

لە کاروباری ئاینیشدا هیچ دەوڵەتێکی یۆنان ئایینی تایبەتی بەسەر کەسدا نەئەسەپاند و خەڵکی لە مەیدانی باوەڕدا سەربەست و ئازاد بوون هیچ جۆرە کۆت و پێوەندێك لە بواری ئاییندا نەکرابووە دەست و گەردنیان و هیچ جۆرە چینێکی پیاوانی ئاین لە ئارادا نەبوون[4]کە پاسەوانی ئایینەکە بکەن و زۆرەملێ لە خەڵکی بکەن.. بگرە ئایینەکانی یۆنان بەپێچەوانەی رۆژهەڵاتەوە پڕ بوون لە لایەنی وا کە خەیاڵیان ئەورووژاند و مێشکیان دەمەزەرد ئەکرد و وایان لە خەڵکی ئەکرد کەسەرنج بدەن و تێ بفکردن. لە ژیانی سیاسیدا[5] هەموو ئەو دۆخانەی هاتبوونە پێشەوە یاریدەدەری سەرنجدان و تێفکرینی سەربەستانە بوون، یۆنانییەکان بەوە ناسرابوون کە بە هێمنی و لەسەخۆیی پەنایان ئەبردە بەر ژیر و ئەقڵ و لەجیاتی

---

1 بۆ پتر شارەزابوون لەم بابەتە بڕوانە:
جۆرج سباین: تطور الفکر السیاسي ج١ (ص٦) ترجمة الدکتور عبدالرزاق احمد السنهوري، دارالمعارف بمصر ١٩٧١.

2 بەپێی داستانێکی یۆنانی حەوت کەس لە فەلسەفە و سیاسەتدا زۆر شارەزا بوون لەبەر ئەوە بە حەوت دانا ناو براون کە ئەمانەن (تالیس، کیلوبولس، بیاس، بیتاکوس، سولون، بیاندرس، خلیون).

3 بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتە سەرەنجی ئەم کتێبە بدە:
The exact science in Antiquity. London. 1951.Neugebauer, o

4 امیل بوترو: العلم و الدین في الفلسفة المعاصرة، ت: الدکتور احمد فؤاد الأهواني، الهیئة المصریة العالمة للکتاب، ص ١٠.

5 ارنست بارکر: النظریة السیاسیة عند الیؤنان، ت: لویس اسکندر ج ١، القاهرة -١٩٦٦، ص ١٣- ١٥.

ئەوەی ئەو شتانەی لە دەورووپشتیاندا چاویان پێ ئەکەوێ قایلیان کات یەکسەر نیشانەی پرسیاریان لە بەردەم دادەنان و دڵیرانە هەڵوێستی ئادەمیزادێکیان ئەنواند کە بیرومێشك و سەنجدان و لێکۆڵینەوە سەرمەشقی بێت، ئادەمیزادی یۆنان هەستی بە نرخی خۆی ئەکرد وەك مرۆڤێك بەپێی دەور و پلە و کێشی خۆی بایەخی پێ ئەدرا و هەڵئەسەنگێنرا، هەروەها دەوری خۆی لە ژیانی گشتی و، کۆمەڵایەتیدا ئەگێرا... بەڵام لە رۆژهەڵاتدا ئەم دەورە تەنیا بۆ پاشاکان دیاری کرابوو!

لە مەیدانی ئابووریدا، داهات و بەرهەم لە رادەبەردەر روو لە زیادی بوو، ئەمەش ئەوەندەی تر خانەدان و ئەرستوکراتەکانی دەوڵەمەندتر و پایەبەرزتر کرد. لێرەدا وا لەسەر خەڵکی ساد و توێژەکانی ژێرەوەی کۆمەڵ پێویست بوو کە تێبکۆشن، بەرەنگار و دەستەویەخەی ئەو چینە خانەدانانە ببن.. ئەو تێکۆشانەش هەموو گۆشەیەکی گرتەوە لەمە گۆشەی تیۆری و ژیانی رۆژانە، بۆ بەرهەڵستی کردنی بیروڕای سیاسی و فەلسەفییان... ئەوە بوو لەسەر خەڵکی توێژ و چینەکانی تر کە لە مەیدانی فەلسەفەدا وەڵامیان بدەنەوە و ئەو بیروڕایانەیان تەتەڵە بکەن.

ئەگەر لە گۆشەیەکی تر و لە روانگەیەکی ترەوە سەرەنجی ناوەڕۆك و بابەتی هەردوو شارستانییەتەکە بدەین ئەوا بۆمان دەرئەکەوێ وەك من بۆی ئەچم _ بابەتەکانی رۆژهەڵات بە بابەتی پێش قۆناخی فەلسەفە[1] دائەنرێن.

چونکە ئەو بیروڕا و رێبازانەی لە میسر و بابلدا هەبوون دەربارەی گەردوون و سروشت و ژیان و مردن و خواوەندەکان... هتد:

١. پتر لە بەرگی ئەفسانە و داستان و ئاییندا بوون و خاوەنی تایبەتییان نەبووە وەك بڵێی ئەم رێباز هینی فلانە کەسە و ئەویان هینی یەکێکی ترە.

٢. پڕن لە کەموکوڕی و کەلەبەر و لە بواری سەرنجدان و تێفکرین و شیکردنەوەی ئەقڵی و زانستییانە و گەیشتنە ئەنجام بێ هێز و لاوازن.

٣. ئەو شتانەی باسیان کردوون و لێوەی کۆڵیونەتەوە شارەزاییەکی ئەوتۆیان دەربارەی ساخکردنەوە و هۆیەکیی تێدا بەدی ناکرێت، چۆنیەتی روونکردنەوەی کیشەیەك و یەکالاکردنی و سەلماندن و ساخکردنەوەیان تێدا نییە.

٤. داڕشتن و پەیڕەوی (منهج) لێکۆڵینەوە و شارەزایی و زانینیان کە لە ئەندازە و ماتماتیکدا هەبووە سەرەڕای ئەستێرەناسی، ئەوا بریتی بوون لە چەند تێبینییەك لە

---

[1] واتە: Pre- philosophy.

ئەنجانی تاقیکردنەوەی ژیانی رۆژانەوە پێی گەیشتوون و چارەسەری پێویستییەکی رۆژانەیان کردووە. بەڵام فەلسەفە هەوڵدانە بۆ شارەزایی و زانین نەك بۆ سوود و قازانجی ژیانی رۆژانە کە پێویستیمان پێیەتی بەڵکو تەنیا هەر بۆ شارەزا بوون و زانین و شکاندنی تینویەتی نەزانین. لە فەلسەفەدا دیاریکردنی هەڵوێست بە پێچەوانەی بیری پێش فەلسەفەوە، شێوەی تاکەکەسی وەرئەگرێ و بەپێی بیرکردنەوە و مێشك و بۆچوونی فەیلەسووفەکە رەنگی ئەرێژرێ.

٥. لەلای رۆژهەڵاتییەکان هیچ جۆرە سەرەنجدانێکی سەراتاپاگیر (شامل) بەدی ناکرێ و هەوڵیان نەداوە بە شێوەیەکی مەنتیقییانە بەدوای هۆی دوور و یەکەم هۆی بووندا بگەرێن... هەروەها هەوڵیان نەداوە یاخود نەیانتوانیوە جیاوازی و فرەیی دیاردەکانی بگێرنەوە بۆ سەر یەك چاوگە و یەکرەنگیی [1]. بۆ روونکردنەوەی ئەم رایەش چەند نموونەیەك ئەهێنینەوە و باسیان ئەکەین، بابلییەکان وایان ئەزانی کە نەخۆش کەوتن لە ئەنجامی توورەبوونی خواوەندەکانەوە دێت و پزیشکییان تێکەڵاو بە ئایین کردبوو، چارەسەرەکەشیان بە جۆرێك دائەنا کە ئەبێ خواوەند ئاشت بکاتەوە... میسرییەکان بە دوژمنێکیان نەوێرابانایە ناوی ئەو دوژمنیەیان لەپەرداخێك ئەنووسی و لە ئاهەنگێکی ئایینیدا شتیان پێ ئەخواردەوە، ئینجا بەپێ ئەیان شکاند و وایان ئەزانی بەم کردەوەیان زیان بە دوژمن ئەگەیەنن[2].

دەربارەی ئەندازە و ژمێرە، میسرییەکان تەنیا لایەنی پراکتیکی چەند بابەتێکیان لە ژمێرە ئەزانی و پەیان بە لایەنی تیوری نەئەبرد بۆ نموونە لە میسری کۆندا تیۆری سێ گۆشەی (گۆشە وەستاو) ئەزانرا و بەرادەی ٣:٤:٥ لە پێوانی ئەو زەوی و زارانەی بەکار ئەهێنرا کە ئاوی نیل دوای لافاو بەجێ ئەهێشتن، بەڵام وەك زانست و تیۆری نەیان ئەتوانی ئەم تیۆرە ساخ بکەنەوە تاوەکو فیتاگۆرس دەرکەوت و لێکی دایەوە و بەناوی ئەوەوە تۆمار کرا، هەروەها هەمان شت سەبارەت بە کۆکردنەوە و دابەشکردن و لێکدان. لە ژمێرەدا بابلییەکان کە ژمارەی شەشیان لە ژمارەی سێ دابایە (٦ × ٣) ئەوا شەشەکەیان لەگەڵ دوو ئەوەندەی (٣) کۆ ئەکردەوە کە وابوو

---

[1] مەبەستم لە هەردوو وشەی فرە (Plurality) و لە وشەی یەك چاوگە (Unity)ییە... بە تایبەتی ئەو دیاردە زۆر و هەمەچەشنانەی کە هەموو ساتێك لە دەوروپشتماندا ئەیانبینین ئەبێ یەك سەرچاوە و هۆیەکی دووریان هەبێت.

[2] ئەم بابەتانە بە دوورودرێژی لەم کتێبەدا روون کراونەتەوە:

هـ. فرانکفورت. جون لويس: ماقبل الفلسفه، ت: جبرا ابراهيم جبرا – دار مکتبه الحياة – بغداد ١٩٦٠، ص ٢٥.

تیورۆی لێکدان (×)یان نەئەزانی بەڵکو یەکسەر بە کردەوە بەبێ ئەوەی بنچینەی تیۆرەکە بزانن ئەنجامەکەیان دەرئەهێنا[1]... جا بۆیە بەبێ سڵکردنەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامە و ئەڵێین:

راستە یۆنانییەکان سوودێکی زۆریان لە رۆژهەلات وەرگرتووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا:

"ئەگەر زانستی یۆنان لەگەڵ ئەو زانینە تاقی کردنەوەیەدا بەراورد بکرێت کە گەلانی رۆژهەلات بە تەقەلایەکی لە ئەندازە بەدەرو ماوەیەکی دوورودرێژ کۆیان کردبۆوە، ئەوا زانست و بەرهەمی بیری یۆنان بە موعجیزە دائەنرێ، ئا لێرەدا ئەقڵی ئادەمیزاد بۆ یەکەم جار توانی چەند بنچینە و یاسایەك دابنێ و کۆمەڵە راستییەکیان لێوە دەربهێنێ ئەو راستیانە هیچ گومان لە ئەنجامەکانیان ناکرێت"[2].

فەیلەسووفەکانی یۆنان، سەرەرای ئەمانە، هەڵکەوتوو کارامەییانە لە چەند بابەتێکیان کۆڵیوەتەوە و چەند کێشەیەکیان هێناوەتەوە سەر خوانی باسکردن کە تاکو ئێستاش بە گەرموگوری ماونەتەوە و لە سەدەی بیستەمیشدا بایەخی خۆیان پێ ئەدرێت. وەك: بنچینەی گەردوون و بزووتنەوە و گۆران و سروشتی گیان و چارەنووس و پێکهاتنی کۆمەڵی ئادەمیزاد و چاکەو بەدکاری و داد و جەورو لۆژیك و هونەر و دیالێکتیك و جوان ناسی... هتد[3].

کەوابوو فەلسەفە لە سەردەم و قۆناخێکی دیاریکراودا لەدایك بووە کە سەدەی شەشەمی پێش زایین بووە لە ولاتی یۆنان و ئەم لەدایکبوونی فەلسەفەیەش داهێنانێکی راست و رەوانی گەلی یۆنانە و ئەو زانست و بیروڕایانەی لە رۆژهەلاتدا (میسر و بابل) هەبوون هۆی یاریدەدەری ئەو داهێنانە بوون شان بە شانی هۆیەکانی تر کە لەمەوبەر باسمان کردن (سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ئایینی و سروشتی گەلی یۆنان خۆی[4] کە بۆ یۆنان هاتنە پێشەوە... بەم پێیە:

---

[1] عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني، ط٤ ص ٩ – ١٠.

[2] بنيامين فارنتن: العلم الغريقي، ج١،ت: احمد شكري سالم، ص ١٧.

[3] الدكتور كريم متي، الفلسفة اليونانية، مطبعة الارشاد _ بغداد ١٩٧١، ص ٦.

[4] بۆیە کارکردە و هۆی جوگرافیام پشتگوێ خست چونکە بە تەواوی لەگەڵ قسەکەی "هیگڵ"ی مەزندام کە ئەڵێ جوگرافیای ولاتی یۆنان دەورێکی ئەوتۆی نەبووە لە خوڵقاندنی فەلسەفەدا بۆ نموونە "تورکەکان چەند سەدەیەك لە خاکی یۆناندا ژیان و نەیانتوانی شتێك دابهێنن کە لە شارستانیەتی یۆنان بچێ" بۆیە ئەڵێم ئەم کار کردەیە دەورێکی بنچینەیی نەبووە. بروانە الدکتور محمد كامل عياد: تاريخ اليونان، ج١، ط١، دمشق، ص ١٩.

"لە چارەی گەلێکی بچووک نووسرا... کە بنچینەی پێشکەوتن دابنێ. ئەو گەلەش میللەتی یۆنان بوو. خۆ ئەگەر هێزە کوێر و هەڕەمەکییەکانی سروشت بخەینە لاوە، ئەوا شتێك لەو جیهانەدا نامێنێ کە بجوولێتەوە و لە بنچینەدا یۆنانی نەبێت"[1].

ئەمە لەلایەك ... لەلایەکی ترەوە بابێینە سەر باسکردنی مانای فەلسەفە و بابەتەکانی و بەراوردکردنی لەگەڵ زانست و ئایینـدا. ئەمەش ناوەڕۆکی ئەو بابەتەمانە کە بەشێکی تایبەتیمان بۆ تەرخان کردووە.

---

١ بڕوانە: شارل فرنر: الفلسفە الیونانیة، ت: تیسیر الارض، دار النوار بیروت ط١ _ ١٩٨٦، ص ١٧.

## مانا و بابەتەکانی فەلسەفە

لەم بەشەدا هەولْ ئەدەین بەهۆی وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوە مانا و بابەت و مەبەست و ئەرکەکانی فەلسەفە بە پێی توانا دەستنیشان بکەین.

کەوابوو ئەبێ وشەی فەلسەفە لە چییەوە هاتبێ؟! لەسەرەتادا چ مانایەکی بەخشیوە و ئێستا چی ئەگەیەنێ؟! کام کەسە یەکەم جار ئەم وشەیەی بکار هێناوە؟ ئایا ئەتوانین باسێکی پوخت و پێناسەیەکی رێکوپێکی فەلسەفە بکەین یان نا؟ بەچی ئەتوانین فەلسەفە لە کەرەسەکانی تری شارستانییەت (ئایین و زانست...) جیا بکەینەوە؟ بابەتەکانی فەلسەفە کامانەن؟ ئەو گۆڕانە چییە بەسەریاندا هاتووە؟ وشەی فەلسەفە وشەیەکی یۆنانییە لە دوو کەرت پێکهاتووە:
فیلۆ Philo (بە واتای حەزکردن)
سۆفیا Sophy (بەواتای دانایی)

کەوابوو وشەکە بەهەردوو کەرتییەوە مانای حەزکردن لە دانایی ئەبەخشێ... ئەو کەسەش حەز لە دانایی بکات پێی ئەوترێ فەیلەسووف ... واش زانراوە هێرودۆستی مێژووناس یەکەم کەس بووە دارشتنی کرداری وشەی فەلسەفەی بەکارهێناوە... لە بەرهەمەکانیدا هاتووە کە (کریزوس) بە سولونی یاساناس و دانای وتووە[1].

(بیستوومە ئارەزوو خولیای شت زانین وای لێ کردووی بە فەلسەفەکردن زۆر شوێن و ولات بگەڕێی). کەوابوو ئەم بەکارهێنانەی فەلسەفە مانای حەزکردن و گەڕان بەدوای زانین و شارەزابوون ئەگەیەنێ بەبێ مەبەستێکی تری تایبەتی بە ژیانی رۆژانە... هەندێ شارەزای تر ئەڵێن فیتاگۆراس یەکەم کەس بوو وشەی فەیلەسۆف بەکارهێناوەو وتوویەتی.[2]

---

[1] ازفلدکولبە: المدخل الى الفلسفة، ترجمة: ابو العلا عفيفي. ط٣ لجنة التاليف و الترجمة و النشر. القاهرة _ ١٩٥٥، ص ٨.

[2] الدكتور توفيق الطويل: اسس الفلسفة، ط٥. دار النهضة العربية القاهرة _ ١٩٦٧، ص ٤٨.

فەلسەفە لێکۆڵینەوەی سروشتی شت ئەگەیەنێ. شیشە روون لە زمانی فیتاگۆرسەوە وتوویەتی: خەڵکی ئەم جیهانە لەو کەسانە ئەچن کە لە یارییەکانی ئۆلۆمپیکدا بەشداری ئەکەن و ئەکرێن بە سێ بەشەوە:

بەشێکیان لە یاریەکاندا بەدوای پایە و شکۆدا ئەگەڕێن و بەشی دووەمیان هەموو مەبەستێکیان پارە کۆکردنەوەیە، تاقمی سێیەمیش ئەمانەی بەلاوە گرنگ نییە. تەنیان مەبەستی شت زانینە لە پێناوی زانین و دانایيدا... ئەمانە فەیلەسووفن.

مانا و ناوەرۆکی فەلسەقە بەپێی دۆخی قۆناخ و سەردەم گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو گۆڕانە چوارچێوە تایبەتییەکەی دەستنیشان کردوە. بۆ نموونە لە سەردەمێکی تایبەتیدا شیشەرۆن فەلسەفەی بە رێگایەك داناوە بەرەو مەبەستێکی پراکتیکیانە ئەویش بەختەوەرییە.

"هۆ فەلسەفە [1]. تۆی رێکخەری ژیانمان، تۆ دۆستی چاکەکاری و دوژمنی چەپەڵی و رەزالەتی ئەبێ ئێمە ژیانمان بەبێ تۆ چ بایەخێکی هەبێ".

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا فەلسەفە ببوو بە داردەستێك بۆ داکۆکیکردن و پاراستنی باوەڕەکانی ئایین و دژی ئەو هێرشەی لە لایەن دوژمنانیەوە کەبە (گومڕا) ناوی ئەبردن ئەکرایە سەری و لەم سەردەمەماندا فەلسەفە کالایەکی تری بە بەردا کردەوە تۆز و گەرد و خەوشی سەدەکانی ناوەڕاستی لە خۆی تەکاندووە بۆیە کارل مارکس ئەڵێ:

ئەرکی فەلسەفە و فەیلەسووفەکان گۆڕینی جیهانە نەك لێکدانەوەی [2].

واتە کە لەمەوبەر فەلسەفە دەورێکی ئەوتۆی نەبووبێ... ئەوا ئەبێ لەمەولا چەکێکی کارگەر بێت لەپێناو بەختەوەری و پاشەڕۆژی باشتری ئادەمیزاددا. لەوانەیە هەندێ کەس لێرەدا بپرسن و بڵێن: ئایا فەلسەفە ئەتوانێ گۆڕینی جیهان بکات بە ئەرکی سەرشانی خۆی؟ ئەگەر لە وەلامدا بڵێین بەڵێ... ئەوا ئەو کاتە فەلسەفە ئەبێ بەشێکی تر و فەلسەفە نابێ بەڵکوو شتێکی تر ئەبێ.

---

[1] ازفلد کولبة: هەمان سەرچاوەی پێشوو _ل ١٠.

[2] ماركس انجلس: مختارات في اربعة اجزاء، ج١، الاطروحة (١) من اطروحات عن فورباخ. ار التقدم، موسكو ١٩٦٨، ص ٤٠.

بێگومان ناتوانرێ لە بایەخ و پایەی هیچ کامێك لەم سێ باسانە کەم بکرێتەوە... چونکە فەلسەفە _ وەك ئاشکرایە لەلای هەمووان _ کۆنترین جۆری هوشیاری کۆمەلایەتییە و رەنگ دانەوەی جیهانی دەورووپشتمانە لە مێشکی ئادەمیزاددا و ئەو تیشکدانەوەیەش بەپێی دۆخی خودی و بابەتی هەر سەردەمێك لەو سەردەمانە گۆڕاوە و ئەگۆڕدرێ. جا بۆیە نەئەتوانرا و نەش ئەگونجا لە سەردەمی فیتاگۆرسدا لەم ئەرکە بەولاوە ئەرکێکی تر بخرابایە ئەستۆی فەلسەفە... بە شێوەیەکی تر ئەر ئەرکی فەلسەفە لە کۆمەلێکی رژێمی سەرمایەداریدا وەك چەکێکی ئایدیۆلۆژی بەگژاچوونی بیروڕا و سەرخانی توێژی سەرمایەداری بێت. ئەوا لە کۆمەلێکی تردا کە (زۆرانبازی و خەباتی چینایەتی تیادا نەمابێ) ناگونجێ هەمان دەوری پێشووی بگێڕێ و هەمان ئەرکی کۆنی لەسەر شان بێت. هەمان شتیش ناوەرۆك و باسکردن (تەعریفی) فەلسەفە ئەگرێتەوە. ئەگەر فەلسەفە لە سەردەمی فەیلەسووفەکانی[1] پێش قۆناخی سوقراتدا خۆ خەریك کردن بووبێ بە گەردوون و سروشتەوە، ئەوا لەلای سوقرات فەلسەفە لە ئاسمانەوە هێنرایە خوارەوە بۆ سەر زەوی و بوو بە چەکێکی کاریگەری رەتکردنەوەی بیروڕای سۆفستاییەکان و لێکۆلێنەوەی تیۆری زانین و ئاکار (ئەخلاق). فەلسەفە لەلای ئەفلاتوون و ئەرستۆ[2] چوارچێوەیەکی زۆر لە جاران فراوانتری وەرگرت. هەر لە بەر ئەمەشە دوور ناڕۆین ئەگەر بلێین: باس و پێناسەکردنێکی فەلسەفە کە پڕ بە پێستی خۆی بێت زۆر سەخت و گرانە و بگرە لە چوارچێوەی زانستیانە ئەمانباتە دەرەوە (ئەگەر بۆمان بلوێ ئەم لافە لێ بدەین).

ئەم باسکردنە بەپێی جیاوازیی رێبازە جۆربەجۆرەکانی فەلسەفە و دۆخی هەر قۆناخە ئەگۆڕدرێ و جیاوازە.

لەوانەیە فەلسەفە بەلای ئێمەوە واتایەك ببەخشێ و شتێك بگەیەنێ و بە باوەڕی ئێمە ئەو واتا و دەستنیشانکردنەی راست بێت کەچی زۆر ئاساییە ئەم باوەڕەمان هەردوو ئۆردووگای مەتریالیزمی کۆن و ئایدیالیزم بە هەموو شێوەکانیەوە تووڕە بکات و روومان لێ وەربگێڕن... بۆچی و لەبەر چی؟ کەوا بێت ئەبێ چار چی بێت؟!

لە وەلامدا ئەلێین لە هەموو جیهانی فەلسەفەدا دوو رێباز شك نابەین کە لەگەل یەکتریدا هەلبکەن و بەیەکەوە بگونجێن و لە هەموو بیروڕاکانیاندا لە یەکترییەوە

---

[1] pre _ Socraties Philosophers

[2] بۆیە نموونە لە فەلسەفەی نوێ و هاوچەرخ ناهێنمەوە چونکە:

ا. نامەوێ سەر لە خوێنەر تێك بدەم و بابەتی نووسینەکانی لەلا تێکەل و پێکەل بن.

ب. نووسینەکە خۆی، تەنیا دەربارەی فەلسەفەی یۆنانییە.

نزیك بن. جاری واش هەیە دوو فەیلەسووف سەر بە یەك ڕێباز و ئۆردووگا لەگەڵ یەکتریدا ناتەبان... بۆیە لەم بوارەدا دوو ڕێگامان دێتە بەردەم:

١. یان ئەبێ بەپێی هەر ڕێبازە لە ڕێبازەکانی فەلسەفە و لە بۆچوونی فەیلەسووفەکەوە باس و پێناسە بۆ فەلسەفە دابنرێت.

٢. یاخود بەپێی بۆچوونی خۆمان بەرامبەر بە فەلسەفە پێناسەیەك بنووسین... ئەو پێناسەیە با لەگەڵ ئەو ڕێبازانەی فەلسەفەدا نەگونجێ کە ئێمە ڕەتیان ئەکەینەوە و لەگەڵیاندا نین و پشتگیرییان لێوە ناکەین.

نابێ لەبیرمان بچێت ئەم دوو ڕێگایە سەبارەت بەم کتێبە و ئەم جۆرە نووسینانە کەلەبەر و کەموکوڕییان تیادایە... بۆ؟

- یەکەم جار، لە تواناادا نییە بەپێی ئەو هەموو ڕێبازانەی فەلسەفەی (لەمەوبەر و ئێستا) هەبوون و هەن سەر و پێناسەیان بۆ بنووسین چونکە ئەوسا کتێبەکە بەتەنیا بریتی ئەبێ لە تەعریفکردنی فەلسەفە و دەرفەتی باسکردنی لق و بابەتەکانی ترمان نابێت.

- دووەم ڕێگاش شێوەی فراوان و گشتی نابێت، چونکە هەر وەك لەمەوبەر وتمان ئەبێ باس و پێناسەکە تەنیا ئەو ڕێبازانەی فەلسەفە بگرێتەوە کە بە دڵی ئێمەیە و ئێمە پشتگیری ئەکەین و چاوپۆشی لەو ڕێبازانەش ئەکات کە ئێمە لەگەڵیاندا نین و لەگەڵ بۆچوون و بیروباوەڕماندا ناگونجێن. جا بۆ ئەوەی پتر لایەنی شارەزابوون و ئاشناکردن و تێگەیشتنی خوێنەر لە ڕێبازەکانی فەلسەفە بگرین و خوێنەرمان بەلاوە مەبەست تر بێت و لە باسەکەدا تا ڕادەیەك نیمچە بابەتییانە بین و تای تەرازووکە بە هیچ لایەکدا نەشکێنین و مافی هیچ ڕێبازێکی فەلسەفە و هەڵوێستی هیچ فەیلەسووفێك پشتگوێ نەخەین هەوڵ ئەدەین بە جۆرێك باسی فەلسەفە بکەین کە زۆربەی هەرە زۆری ڕێباز و قوتابخانەکانی فەلسەفە بگرێتە خۆی ... یان ئەگەر نەبێت باسکردنەکە پڕ بە پێستی ئەو بابەتانەی فەلسەفە بێت کە لە هەگبەی ئەم کتێبەدان.

وەکو ئەزانین فەلسەفەی سەردەمی یۆنان بەرهەم و ئەنجامی ڕاستەقینەی چەند هۆیەك بووە لەمانە سەرسامیی و حەپەسان و گومان کردن و هەستکردن بەوەی ئادەمیزاد لە گێژاوی ئەم جیهانە یان و بەرینەدا بەپێی خۆی بەرەو لەناوچوون هەنگاو ئەنێ و هیچ چارێکیش نییە و هیچ پەنایەکیش نییە پشتی پێ ببەستێ... ئەگەر ئەم قسەیە ڕوونتر بکەینەوە ئەڵێین:

"سەرسووڕمانِ یەکەم هەنگاوە بەرەو زانین... کاتێك لە بەردەم دیاردە و نهێنییەکدا ئەحەپەسێین هەست بە نەزانین ئەکەین ئەو هەستەش پاڵمان پێوە ئەنێ هەوڵی زانین بدەین. ئەم زانینەش تەنیا لە پێناوی زانیندایە نەك لە پێناو پڕکردنەوەی کەلەبەر و پێویستییەکی ژیانی ڕۆژانەدا" [1].

ئێمە لە ژیاندا تووشی چەند گێروگرفت و کێشەیەك ئەبین... ئەم کێشانەش داوای وەڵاممان لێ ئەکەن... وەڵامەکەش دوور نییە لە قۆناخێکی تردا ببێ بە پرسیارێکی تر و بەم پێیە کێشەکەو وەڵام و پرسیارەکان درێژە ئەکێشن... کەوابوو فەلسەفە و مێژووی فەلسەفە بریتین لە:

وەڵامی جۆربەجۆر و نەپساوە و بەدوای یەکتریدا هاتووی چەند کێشەیەك. هەر ڕێبازێکی فەلسەفە ئەگەر سەرنج بدرێت ئەوا دەرئەکەوێ بریتی بووە لە تەقەللایەکی ڕێکوپێك بۆ وەڵامدانەوەی هەمان پرسیاری بنچینەیی کە لەو ڕۆژەوە ئادەمیزاد بە قووڵی و وردی بیری کردۆتەوە، ئەو پرسیارانە خۆیان بەسەردا سەپاندووە، لە مێشك و ناخیدا کەوتوونە جولە جول[2].

ئەگونجێ لێرەدا دوو ڕەخنەی بەهێز و شیاو لەبەردەم ئەم دەستنیشانکردنەی سەرەوەی فەلسەفە قوت ببنەوە و هەردووکیشیان لە جێگای خۆیاندا بن.

ڕەخنەکانیش ئەمانەن:

ئەم پێناسەیەش لە خۆیدا روون و ئاشکرا نییە و پێویست بە پتر روونکردنەوە ئەکات. بەم دەستنیشانکردنە مەیدانی فەلسەفە تەسك ئەکەینەوە و لقە گرنگەکانی وەك لۆژیك، ئاکار، جوانناسی پشتگوێ ئەخرێن و ئەو دەورە ئینسکلۆپیدیاییە لە فەلسەفە ئەسێندرێتەوە کە هەیبووە. چونکە فەلسەفەی کلاسیکی دایکی دڵسۆز و دایەنی هەموو زانست و لقەکانی زانینی و بیری ئادەمیزاد بووە و هەر لە باوەشی ئەویشدا گۆش کراون.

---

[1] کارل یاسبرز: مدخل الی الفلسفة، ترجمة: جورج صدقني. مكتبة اطلس. بدون تاريخ،ص٢٢.

[2] فرەدریك ئینگلز ئەڵێ: کێشەی بنچینەیی لە فەلسەفەدا ئەم پرسیارەیە: کامیان لە پێشەوە دێت: بیر یاخود ماددە، گیان یان سروشت؟ بێگومان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش ڕێباز و مەیلی گشت فەیلەسووفەکە دەستنیشان ئەکات ئەوەی ئەڵێ ماددە، سروشت لە پێشەوە دێن و گیان و بیریش پاشکۆیانن ئەوا سەر بە ڕێبازی مەتریالین و ئەوانەی بە پێچەوانەی ئەمەوە وەڵام ئەدەنەوە ئایدیالیستن... بڕوانە: انجلس: لودفيغ فورباخ و نهاية فلسفة الكلاسيكية الألمانية، دارالتقدم موسكو ١٩٦٧، ص ٢١.

ئەم رەخنەیە وامان لێ ئەکات جارێکی تر بەم بابەتەدا بچینەوە و هەوڵ بدەین بە شێوەیەکی فراوانتر دەستنیشانی بکەین... دەستنیشان کردنێك کە پڕ بە پێستی قەوارەی فەلسەفە بێت و ئەو دەورەشی لەیاد نەکات کە گێراویەتی و لەمەولا ئەیگێڕێ... ئەرستۆ فەیلەسووف و جوانناس و ئەندازیار و یاسازان و هونەرمەند و ماتماتیك ناس و ئەدیب و زانا و كشتوكاڵناس بووە، هەموو بەرهەمەکانیشی بە گشتی بە بابەتی فەلسەفەکەی دانراون دوای ئەرستۆش، واتە لە سەردەمی خۆگرتنی ئایینی مەسیحی لە ئەورووپادا زۆربەی هەرە زۆری فەیلەسووفەکان پیاوی ئایینی بوون و بە فەلسەفە داکۆکییان لە بڕواکانی ئەو ئایینە کردووە... بە ماوەیەکیش بەر لە سەدەی راپەڕین و[1] دوای ئەو سەدەیە ئەو شۆڕشەی زاناکان بەرپایان کرد شۆڕش بوو لە جیهانی پان و بەرینی فەلسەفەدا و رابەرانی شۆڕشەکەش فەیلەسووف بوون. خۆ ئەگەر زانایەك تیۆرێکی نوێی دەربارەی هێزی یەکترڕا کیشان داهێنابێ ئەوا، یەکەم جار، چەوتی رایەکەی فەلسەفەی سروشتی ئەرستۆی ساخ کردۆتەوە کە وتوویەتی:

هەموو شتێك بەدوای جێگای شیاوی خۆیدا ئەگەڕێ، ئاگر و دووکەڵ بەرز ئەبنەوە چونکە ئاسمان جێگایانە و شتی قورسیش بەرەو خواوە ئەکشێ چونکە جێگاکەی لە خوارەوە دایە. ئەم پێ و دانگە لقەکانی تری فەلسەفە ئەگرێتەوە کە ئێستاکە هەندێکیان باڵەفڕە بوون و سەربەخۆیی خۆیان بەدەست هێناوە و هەندێکی تریان بەرەو جیابوونەوە هەنگاو ئەنێن و هەندەکەی تریشیان بەبێ باوەشی فەلسەفە ناتوانن ساتێك بژین.لەم ئاستەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی بڵێین فەلسەفە بریتییە لە:

ئەو چالاکی و هەوڵ و کۆششەی ئادەمیزاد ئەیدات بۆ تێگەیشتنی سروشتی گەردوون و ناخی خۆی و پەیوەندی نێوان ئەو دوو لایەنە بنچینەییە لە تاقیکردنەوەکانماندا[2]... بەم پێیە لە فەلسەفەدا ئەبێ تەقەللایەکی رێکوپێك بدرێت بەدوای زانیندا، ئەم تەقەللایەش لەرێگای بیرکردنەوەی رێکوپێکەوە ئەبێت لەبارەی دۆزینەوەکانی زانا و بەرهەمی مێژوونووس و خەونەکانی هونەرمەند و شاعیر و سۆفی و کۆکردنەوەی ئەمانە هەمووی و تێکەڵاوکردنیان لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی رۆژانەی ژیانمان ئینجا هەوڵ بدەین بە وردی توانای مێشکی ئادەمیزاد شی بکەینەوە بۆ ئەوەی بۆمان ئاشکرا ببێت مرۆڤ چەندە ئەتوانێ شت بزانێ و سەرچاوە و پەیڕەو و رێباز و سنووری زانینی ئادەمیزاد شی بکەینەوە.

---

[1] Renaissance.

[2] هنتر مید: الفلسفه انواعها و مشكلاتها، ترجمه الدكتور فؤاد زكريا، دارنهضة مصر القاهرة _ ١٩٦٩، ص ٢٣.

لەم دەستنیشان کردن و پێناسەی فەلسەفەدا چەند لایەنێکی تر دێتە پێشەوە و ئەوانیش پێویست بە شیکردنەوە و باسکردن و لێکۆڵینەوە ئەکەن کەوابوو ئەم لایەنانە کامانەن و چۆن ئەناسرێن و شی ئەکرێنەوە؟

ئەگەر جارێکی تر سەرەنج لە پێناساندنەکەی پێشووی فەلسەفە بدەینەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە تیادا مەبەست و ئەرکی فەلسەفە و پەیوەندی لەگەڵ زانست و ئایین و ....، مان باسرکدووە. کەواتا:

**ئەرك و مەبەستەکانی فەلسەفە کامانەن؟**

چ شتێك بیری فەلسەفەیی لە جۆرەکانی تری بیر جیا ئەکاتەوە؟ فەیلەسووف لەچاو خەڵکی تر چ کارێك ئەکات کە بەو ئیشەی لە زاناو پیاوی ئایین و هونەرمەند و مێژوونووس جیا ئەکرێتەوە؟ لایەن و جۆرەکانی چالاکی ژیریی فەیلەسووف کامانەن کە لە خەڵکی تر جیای ئەکەنەوە؟

## مەبەستەکانی فەلسەفە

لەمەوبەر وتمان: جیاوازییەکی گەورە لەنێوان هەڵوێست و جۆری بیرکردنەوەی فەیلەسووف و ڕێبازەکانی فەلسەفەدا هەیە.. کەوابوو چۆن لەناو گێژاوی ئەو دەریا هەڵچوو کەف و کوڵەدا ئەتوانین سەرە دەزوویەکمان بەردەست بکەویٚ و پێش دەمی خۆمان ببینین و بگەینە ئەنجام و مەبەستەکانی فەلسەفە دەستنیشان بکەین؟

ئەوەی لەم بوارەدا پێویست بە وتن ئەکات ئەوەیە، هەروەك جیاوازی لەنێوان فەیلەسووف و ڕێبازەکانیدا هەیە ئەوا لە چەند خاڵێکیشدا بەیەك دەگەن و لە یەکتری نزیك ئەبنەوە و هیچ بەرەیەك لە بەرەکانی فەلسەفە نکۆڵی لەم خاڵانەی بەیەك گەیشتنە ناکەن خاڵەکانیش ئەمانەن:

- فەیلەسووفەکان لەسەر دەستنیشانکردنی بابەتەکانی فەلسەفە (بە تایبەتی کلاسیك) ڕێکن و لە یەکترییەوە نزیکن... دووریش نییە فەیلەسووفێك لە یەکێکی تر زیاتر بایەخ بە لۆژیك بدات و ئەوی تریان تیۆری زانین بە گرنگتر بزانیٚ. بەلاّم هەردوولایان لەو باوەڕەدان کە ئەم دوو لقە بابەتی فەلسەفەن.

- مێژووی نەپساوی فەلسەفە[1] ساغی کردۆتەوە کە بریتی بووە لە مێژوویەکی ئاڵقە توندوتۆڵ بەیەکەوە بەستراوی پەرەسەندووی بیری نێوان فەیلەسووفەکان. لەلایەکی ترەوە فەیلەسووف، هەرچەندە تیر و توانجی تێگیرابیٚ و تۆمەتی درابێتە پاڵ[2]... ڕۆڵەی ڕاستەقینەی کۆمەڵەکەیەتی و لە سەردەم و شوێنێکی دیاریکراودا ئەژیا و خاوەن هەستێکی ناسك و گوێیەکی سوك و دیدەیەکی تیژبینی هەیە و پتر لە خەڵکی سادە ڕووداو و کارەسات و دیاردەکانی ژیان و سروشت و دەوروپشتی کاری خۆیان تیٚ ئەکەن و سەرنجی ڕائەکێشن و ئەم کارتێکردنەش لەگەڵ جۆری کەسایەتی و بیرکردنەوە و ناخ و دەروون و پەروەردەی فەیلەسووفەکە ئامێزی یەکتری ئەبن و تان و پۆی ئەو بەرهەمە بیرییە ئەچنن کە ئێمە بە فەلسەفەی دائەنێین ... کەوابوو فەیلەسووف ئادەمیزادە بەر لەوەی ئەو نازناوەی هەبیٚ... لێرەوە فەلسەفە دوو مەبەستی بنچینەیی ئەبێت، هەر وەك لەمەوبەر، لە سەرەتاوە هەیبووە، کە ئەمانەن:

---

[1] الدكتور محمود زيدان: مناهج البحث الفلسفي، لبنان ١٩٧٤، ص ٢٥.

[2] الدكتور محمد فتحي الشنيطي: المعرفة: ط٣ مكتبة القاهرة الحديثة ١٩٦٣، ص ١٧.

- مەبەستی تیوری.
- مەبەستەکانی پراکتیك[1].

لە یەکەمیاندا فەلسەفە شتمان فێر ئەکات، سنووری زانینمان بەرەو گەیشتن بە راستی و راستەقینە فراوان و سەرتاپاگیرتر ئەکات. ئینجا هەوڵی لێکدانەوەی ئەو راستییە ئەدات. لە دووەم مەبەستیشدا ( کە لایەنی ئاکار _ ئەخلاق _ ئەگرێتەوە) هەوڵ ئەدات چواچێوەیەکی روون و ئاشکرا بۆ چاکە و چاکەکاریی دەستنیشان بکات و چەند یاسا و بنچینە و پەیرەوێك دابنێ بۆ ئەوەی لە ژیانی رۆژانە و کردارماندا پەیرەوی بکەین و لە هەڵدێر و کەوتن و کاری چەوت بمانپارێزێ.

---

1 ویلیەم جێمس فەیلەسووف پراگماتی ئەڵێ:

بەو چاوەوە سەیری فەیلەسووف ئەکرێ کە وەك کوێرێك وایە لە ژوورێکی تاریکدا بەدوای شەپقەیەکدا ئەگەڕێ...

## ئەرکەکانی فەلسەفە

لەمەوبەر مەبەستەکانی فەلسەفەمان روون کردەوە، ئێستاکە با بزانین فەیلەسووف چ جۆرە چالاکییەکی بیریی ئەنوێنێ و ئەو ئەرکانە چین کەوتوونەتە ئەستۆی فەلسەفە و بەهۆیانەوە دەورە دەستنیشانکراوەکەی ئەگێڕێ. فەیلەسووف دوو جۆرە چالاکی تایبەتی هەیە کە توندوتۆڵ بەیەکەوە گرێ دراون و دووەمیان تەواوکەری یەکەمیانە و یەکەمیشیان بەبێ دووەم پێ ناگات و کامڵ نابێ.. بەم دوو چەشنە چالاکییەش ئەڵێین: ئەرکەکانی فەلسەفە... کەوابوو ئەم ئەرکانە کامانەن؟ با لە پێشەوە سەرەنجێك لەو دیالۆگەی ئەفلاتوون بدەین کە تیایدا سوقراتی دانای کردووە بە هەڵسووڕێنەری وتووێژەکە:

**ئەدیمانتۆس:**

زۆر باشە، بەلام چۆن ئەو نموونەیە کێشەکەی ئێمە ئەگرێتەوە؟

**سوقرات:**

ئێستا پێت ئەڵێم. دادپەروەری، کە بابەتی لێکۆڵینەوەمانە ئەگەر وەك خاسیەتێکی باش لە تاکە کەساندا هەبوو، ئەوا لە دەوڵەتیش ئەبێت.

**ئەدیمانتۆس:**

ئەمە راستە.

**سوقرات:**

ئایا دەوڵەت لە تاکەکەسان گەورەتر نییە؟

**ئەدیمانتۆس:**

بەڵێ.

**سوقرات:**

کەوابوو تاوەکو وێنەی دادپەروەری گەورەتر بێت ئاسانتر ئەتوانین دەرکی پێ بەرین... بۆیە پێشنیاز ئەکەم لە پێشدا لە دادپەروەری بکۆڵینەوە هەروەك لە دەوڵەتدا دەرئەکەوێ لە دواییدا لە تاکەکەساندا

باسی بکەین... ئەمەش لە گەورەوە بەرەو بچووك ئەمانبات و هەردووکیشیان بەراورد ئەکەین.

ئەدیمانتۆس:

ئەمە نەخشەیەکی زۆر جوانە

سوقرات: دەبا بەخەیاڵ دایبنێین، دەوڵەتێك سەرهەڵئەدات و لەبەردەممان دروست ئەبێت. ئەو کاتە دادپەروەری دەتوانی زۆر و جەوری تیادا ببینی کە لە ناویداسەرهەڵئەدەن.

ئەدیمانتۆس:

ئەمە هەقە و راستە.

سوقرات:

ئەگەر ئەمەمان تەواو کرد، دۆزینەوەی ئەو شتەی بەدوایدا ئەگەڕێین ئاسانتر ئەبێت [1]

دوای ئەمە با سەرەنجێکیش لە تێکستێکی دیکارت بدەین کە تیایدا باسی سێیەمین بنچینەی پەیڕەوەکانی[2] فەلسەفە ئەکات.

دیکارت ئەڵێ:

بیرەکانم بەرێك و پێکی بەرەوپێش بەرم، بە سادەترین شت کە زانینی ئاسانە دەست پێ بکەم[3]، بۆ ئەوەی وردە وردە و لەسەرخۆ بەرز ببمەوە بگەمە زانینێك کە لە هەموویان تێکەڵاوتر و تێکەڵکێشتر بێت. بگرە ئەبێ وای دابنێم کە پلە لەنێوان ئەو شتانەدا هەیە کە بە (سروشت) هیچیان لە پێش هیچیانەوە نین.

---

[1] افلاطون: الجمهورية، ك٢، ترجمة و دراسة الدكتور فؤاد زكريا، الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٤، ص ٢٣٢ _ ٢٣٣.

[2] Method

[3] ديكارت مقال عن المنهج: ترجمة محمود محمد الخضيري، ط٢، دارالكتاب العربي للطباعة و النشر بالقاهرة ١٩٧٧، ص١٣١ _ ١٣٢.

ئەگەر بە وردی سەرنج لەو دوو تێکستە بدەین کە بە نموونە هێنامانەوە، بۆمان دەرئەکەوێ کە بە پێچەوانەی یەکترییەوەن. لە بەراوردکردنیاندا دوو شتمان بۆ دەرئەکەوێ:

- ئەفلاتوون لە شتی گەورە و شتی بچووک و تێکەڵکێشەوە دەست پێ ئەکات "دادپەروەریی لە دەوڵەتدا" سادە (تاکەکەسان) هەنگاو ئەنێ و هەردووکیان بەراورد ئەکا.

- دیکارت بە پێچەوانەوە لە شتی سادە و بچووکەوەدەست پێ ئەکات، بەرەو شتی گەورەو تێکەڵکێش ئەڕوات... ئەم دوو هەڵوێستە، ئەم دوو هەنگاوە، هەردوو ئەرکە بنچینەیی و چالاکییەکانی بیریی فەیلەسووف پێك ئەهێنن کە ئەمانەی خوارەوەن:

- شیکردنەوە[1]

- تێکەڵکێشکردن[2]

ئەگەر پتر ئەم دوو لایەن و ئەرکە روون بکەینەوە ئەڵێین لە یەکەم چالاکیدا فەیلەسووف (کە زۆر جار رەخنەشی پێ ئەوترێ) شت شی ئەکاتەوە ئەیگێڕێتەوە بۆ سەر ئەو کەرەسە و سەرەتایانەی لێوەی پێك هاتووە. هەروەها لەم بوارەدا فەیلەسووف ئامرازەکانی ئەقڵ شی ئەکاتەوە وەك: لێکۆڵینەوەی سروشتی بیر، یاساکانی لۆژیك[3]، پەیوەندی نێوان بیر و جیهان، سروشتی راستەقینە، تا چەند ئەو رێگایانە کە پەنایان ئەبەینەبەر، راستن بۆ شت زانین.

لە دووەم چالاکیدا، هەوڵ ئەدات لە واتایەکی ساکارەوە بگاتە واتایەکی تێکەڵکێشکراو... ئینجا هەنگاوێکیتر ئەچێتەوە پێشەوە بۆ دارشتنی زانینەکان و تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد لە چوارچێوەیەکی هەمەکی _ کلی _دا[4]... یاخود هەموو زانین و راستەقینەکان (الحقائق) لە چوارچێوەیەکی گشتیدا رێك ئەخات و هەوڵ ئەدات هەموو زانین و تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد لە سیستەمێکی کامل و فراواندا دابڕێژێ[5].

---

[1] واتە: التحليل: Analysis

[2] التركيب Synthesis

[3] هنتر ميد: الفلسفة انواعها ومشكلاتها ص ١٩.

[4] هنترمید. هەمان سەرچاوە، ل٢٠.

[5] بۆ پتر شارەزابوون لەم دوو بابەتە وا باشە سەرنجێکی ورد لەم کتێبە بدرێ:

الدکتۆر یاسین خلیل: منطق المعرفة العلمية (الجزء الاول من نظرية العلم) _ ليبيا ١٩٧١ ص٧٩.

## فەلسەفەو زانست و ئایین

لەمەوبەر کە باسی کەرەسەکانی شارستانیمان کرد یەکسەر فەلسەفەمان ئەخستە نێوان زانست و ئایینەوە... لە باسکردنی فەلسەفە و پێناسەکانیدا باسی دەوری زانا و زانستمان کرد.. بێگومان ئەم جۆرە دەستنیشانکردنە نیشانەی ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان ئەم سێ بابەتەدا هەیە.. جا بۆ ئەوەی پتر ئەم لایەن و کێشەیە روونتر بکەینەوە و فەلسەفە وەك زاراوە و مانا و چالاکییەکی بیر زیاتر دەربکەوی و خۆی بنوێنێ شۆخی و شەنگییەکی دەربخات، بۆ ئەوەی سنووری فەلسەفە و بابەتەکانی تر دەربخەین، چونکە هەر لقە لە لقەکانی بەرهەمی بیری ئادەمیزاد سنوور و کێشەو رێباز و پەیڕەو و مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە کە لە لقەکانی تری جیا ئەکاتەوە، بۆیە بە پێویستمان زانی بەراوردێکی خێرا لەنێوان فەلسەفە و زانست و ئاییندا بکەین.

لەناو شارەزایاندا وا باوە کە (فەلسەفەی کلاسیکی کۆرپەی ئاینە و لە باوەشە گەرمەکەیدا پێی گرتووە، هەروەها فەلسەفەش دایکی زانستەوە ئەم کۆرپەیە لە ئامێزی فەلسەفەدا هاتۆتە گڕوگاڵ و لە باخەکەیدا پێی گرتووە).

بە باوەڕی من ئەم قسەیە زۆر راستە، بەڵام شتێك هەیە نابێ لە یاد بکرێت... هەروەك فەلسەفە لە زانست و ئایین ئەچی ئەوا چەند خاڵێکیش لە یەکترییان جیا ئەکاتەوە و قەوارە و سنووری تایبەتی خۆیان بۆ دائەنێ. لەگەڵ ئەمەشدا، راستە چەند بابەتێکی زانست یاخود ئایین هەیە و فەیلەسووفەکان ماف بە خۆیان ئەدەن و دەستی بۆ درێژ ئەکەن و ئەیخەنە ژێر رۆشنایی بیرکردنەوە و باسکردن و لێکۆڵینەوەوە. هەروەها نابێ ئەوەش بخەینە پشتگوێ کە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان لە سەرچاوەی ئایینە کۆنەکانەوە (میسر و بابل و ئاشووری) هەڵهێنجاوە و ئێستاکەش دەستی بە دامێنی زانستەوە گرتووە و ئەنجامەکانی شی ئەکاتەوە و دەست لە رێباز و پەیڕەوەکانی وەرئەدات...

ئەگەر سەرەنجێك لە زانست بدەین، بگرە لە ئەنجام و بەرهەم و داهێنان و دۆزینەوە و تیۆرییەکانی زانست وردببینەوە بۆمان ساخ ئەبێتەوە کە لە هەموو زانستێکدا چەند بابەت و لایەنی بنچینەیی هەیە کە لە زانست و لقەکانی تری بیری ئادەمیزاد جیای ئەکاتەوە... ئەم لایەنە بنچینەییانە ئەمانەن:

- بابەتی لێکۆڵینەوە و باسکردن.
- ئەو پەیڕەو و ڕێگایەی لە بنیاتنانی زانیندا ئەیگرێتە بەر.
- ئەنجام و ئەو مەبەستەی کە زانست خولیایەتی و هەوڵی بۆ ئەدات[1]... وە لە زانستدا، زانا دێت و لەو شوێنەوە دەست پێ ئەکات کە زاناکەی پێش خۆی پێی گەیشتووە.. ئەنجامەکانی دەسکاری ئەکات، کەلەبەرەکانی پڕ ئەکاتەوە و پەرەی پێ ئەدات... دەبا بزانین فەلسەفەش ڕێباز و بابەت[2] و پەیڕەو و ئەنجامی سوودبەخشی هەیە یان نا؟. کەوابوو لە پێشدا با بزانین ئەو خاڵانە چین کە فەلسەفە و زانست لە یەکتر جیا ئەکەنەوە:
- فەلسەفە بە ڕێباز و جیهاندیدەکەی لە زانست جیاوازترە. فەیلەسووف بۆی هەیە و ئەتوانێ بە ئارەزووی خۆی ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی زانین هەڵبـژێرێ و بە کاری بهێنێ.
- فەیلەسووف کە سەرنجی بابەتێك ئەدات ئەوا هەمیشە ئەو بابەتە لە بۆچوونی ئەوپەڕی سنوور دووری و لایەنە بنچینەییەکانییەوە هەڵئەسەنگێنێ»[3]... بۆ نموونە لەو شوێنەی زانا ئەوەستێ لەوێوە فەیلەسووف دەست پێ ئەکات و بەدوای وەڵامەکانیدا ئەگەڕێ.

---

[1] بۆ پتر شارەزابوون لەم بوارەدا سەیری ئەم کتێبە بکە: الدكتور ياسين خليل: منطق البحث العلمي، الجزء الثاني من نظرية العلم، ط١، بغداد ١٩٧٤، ص ٣٣٤.

[2] ئەمەوێ خوێنەری خۆشەویست ئاگادار بکەم کە وشەی ڕێباز بە مانای ( Doctrine) و وشەی پەیڕەو ڕێگا بە مانای (Metnod) بەکار ئەهێنم... بێگومان ئەم دووانەش زۆر لە یەکتری جیاوازن ... ڕێبازی فەلسەفە (المذهب) بریتییە لە چەند تیۆرێك وهەر تیورەش لە چەند بەڵگەیەك و هەر بەڵگەیەش لە چەند کێشەیەك (Proposition) پێك هاتووە... بەڵام (منهج و پەیڕەو). ئەو ڕێگایەیە کە فەیلەسوف و زانا و لێکۆڵەرەوە بەکاری ئەهێنن لە چالاکی و لێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوەو نووسیەکانیاندا ... بڕوانە : الدكتور محمود زيدان: مناهج البحث الفلسفي. لبنان ١٩٧٤.

[3] بڕوانە:

جوزيف بوخينسكي: مدخل الى الفكر الفلسفي، ترجمة، الدكتور محمود حمدي زقزوق. مكتبة الانجلو المصرية، ط١، القاهرة ١٩٧٣، ص٢٢ و ٢٣.

• زانست شت دائەهێنێ و ئەدۆزێتەوە و فەلسەفە تەنیا شت لێك ئەداتەوە. واتە زانست پەیوەندی نێوان دیاردەكانی سروشت ئاشكرا ئەكات و لەو سنوورە تێناپەڕێ، بۆ ئەوەی بزانێ سروشتی ئەم پەیوەندییە و نهێنێ بوونیان چییە كە ئەمانەن بابەتی فەلسەفەن.

• زانست پارچەیەك یاخود لایەنێك لە لایەنەكانی گەردوون ئەكات بە بابەت و لێوەی ئەكۆڵێتەوە و شی ئەكاتەوە بەڵام فەلسەفە تەنیا بەم لایەنە بچكۆلەیە ناوەستێ بەڵكوو باسی هەموو گەردوون و لایەنەكانی ئەكات... چونكە بەلایەوە گەردوون یەك گەردوونە[1]. بۆیە هەوڵ ئەدات تیورێكی گشتی دابنێ و بەهۆیەوە سروشتی گەردوونی پێ لێكبداتەوە[2].

• زانست پشت بە تێبینی و تاقیكردنەوە و فەلسەفە پشت بە بیركردنەوەی رووت و سەرنجی ژیرییانەی رووت ئەبەستێ[3].

• مێژووی زانست بەشێك نییە لە زانست و مێژووی فەلسەفە ئەگەر فەلسەفە نەبێت ئەوا بەشێكە لە فەلسەفەكە خۆی و فەیلەسووف ناتوانێ رابردووی فەلسەفە پشتگوێ بخات.

• لە فەلسەفەدا بڕوا بە هیچ شتێك ناكرێ تاوەكو بەهۆی بەڵگە و سەلمێنەی لۆژیك و ژیر ساغ نەكرێتەوە.

• زاناكان لەسەر یاساكانی زانست رێك و تەبان... بەڵام رێبازەكانی فەلسەفە جێگای ناتەبایی و ناڕێكین لە نێوان فەیلەسووفەكاندا[4].

• بە پێچەوانەی زانستەوە ناتوانین حوكم بەسەر تیۆرێكی فەلسەفەدا بدەین بڵێین ئەم تیۆرە راستە یاخود درۆزنە، چونكە پێودانگ لێرەدا تەنیا رادەی[5] پەسندكردن و پەسندنەكردنی ئەو تیۆرەیە لەلایەن ئەو كەسەوە، وە ئەگەر بڵێین ئەو رادەیە چییە ئەوا لە وەڵامدا ئەڵێین ئەمانەن: سادەیی تیۆرەكە، روون و ئاشكرایی، فراوانی و

---

[1] امام عبدالفتاح امام: مدخل الى الفلسفة،. دارالثقافة للطباعة و النشر، القاهرة ١٩٧٢، ص٢٤.

[2] الدكتور محمد علي ابو ريان: الفلسفة و مباحثها، دارالمعارف بمصر القاهرة _ ١٩٦٦، ص ٧٥.

[3] الدكتور محمد عبدالرحمن مرحبا: من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية،منشورات عويدات، بيروت ١٩٧٠، ص ٥١ _ ٥٣.

[4] الدكتور محمد فتحي الشنيطي: المعرفة: ، ط٣. مكتبة القاهرة الحديثة ١٩٦٢، ص ٣.

[5] الدكتور محمود زيدان: مناهج البحث الفلسفي ص ١٣٦.

سەرتاپاگیریی کە هەموو لایەنێك بگرێتەوە. دوای ئەم بەراوردە با بزانین ئایین و فەلسەفە چییان لە باردایە و بەچی لە یەکتری جیا ئەکرێنەوە.

- فەلسەفە پەنا ئەباتە بەر هەست و لۆژیك و ژیر، بەلام ئایین پەنا ئەباتە بەر سروش (وەحی)...

- فەلسەفە وەك ئایدیۆلۆژی و سیستەم ئەگونجیٚ ببیٚ بە بەشێکی سەرخانی رژێمێکی کۆمەلایەتی و سیاسی و جلەوی فەرمانڕەوا بەدەستەوە بگریٚ بەلام ئایین بڕواو، باوەڕە دەربارەی پەیوەندی نێوان ئافەریدەگار و گیانلەبەر ئەدویٚ.

- ئادەمیزاد ئەیەویٚ خۆی درباز بکات. ئەم دەربازبوونەش لە دۆزەخ تەنیا لە هەگبەی ئایینەوە هەلئەقولیٚ[1] و فەلسەفە لاف وا لیٚ نادات.. خۆ ئەگەر پەیڕەوی ئامۆژگاری ئایینمان نەکرد ئەوا بە دۆزەخ و ئاگرەکەی ئەترسێندرێن... بەلام لە فەلسەفەدا سزا و پاداشت نییە.

- بابەتەکانی ئایین و پەیڕەو ئامۆژگارییەکانی لە دوو سەرچاوەوە هەلئەیقولێن (ڕەب، نەمریی)[2] ڕەب لەلای پیاوی ئایینی بابەتی خۆشویستن و پەرستنە... بەلام لەلای فەیلەسووف بابەتی لێکۆلینەوەیە هەروەك بابەتەکانی تر... مێژوو فەلسەفەش بەو بەلگانە رازانراوەتەوە کە فەیلەسووفەکان بۆ ساخکردنەوەی بوونی خوا هێناویانەتەوە. لەم بەراوردەخێرا و سەرپێیەدا ئەگەینە ئەو ئەنجامەی بلێین:

سەبارەت بە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، ئایین و فەلسەفە دوو لقی دارێك بوون و بەهیچ جۆرێك فەیلەسووف نەیتوانیوە خۆی لەژێر باری کارتێکردنی ئاییندا دەرباز بکات و لە زۆر سەردەمدا بڕواکانی ئایین جێگای خۆیان لە بەرهەم و ڕێبازی فەیلەسووفەکاندا کردۆتەوە.

سەبارەت بە فەلسەفەی نوێش دۆخی سەردەم و پەرەسەندنی شارستانییەت هەردوو مەیدانی فەلسەفە و ئایینی لە یەکتری دوور خستۆتەوە[3] هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نەماوە. سەبارەت بە زانست لە سەدەی بیستەمدا هەندیٚ جار ئاوازی

---

[1] کارل یاسبرز: مدخل الى الفلسفة ص٢٩.

[2] اميل بوترو: العلم و الدين في الفلسفة المعاصرة ت:الدكتور احمد فؤاد الاهواني. الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٣، ص٤٩.

[3] مەبەستم لەو ڕێبازانەی فەلسەفەیە کەبە "پێشکەوتنخواز" ناو ئەبرێن و لەگەل زانستدا بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بەرەوپێش هەنگاو ئەنێن.

ناساز لە چەند کۆڕێکەوە بەرز ئەبێتەوە، گوایە زانست هەموو شوێنێکی پڕ کردۆتەوە و فەلسەفەش بە دەستەوسانی وەستاوە و هیچی لەباردا نەماوە، لەوە بەولاوە کە مەیدان بۆ زانست و ئەنجام و داهێنانەکانی چۆڵ بکات... بە باوەڕی من ئەم قسەیە هیچی بەسەر راستییەوە نییە وە ئەوەی ئەم قسەیە ئەکات دیارە مەبەستی تایبەتی هۆیە و لە راستییەوە دوورە چونکە فەلسەفە و زانست بەبێ یەکتری هەڵناکەن...

لە کۆتاییدا من لەو بڕوایەدام کە فەلسەفەی کلاسیکی ئەکەوێتە نێوان دوو لەشکرەوە، لەشکری زانست لەلایەك و لەشکری ئایین لە لایەکی ترەوە[1]، لە ئایین و لاهوتەوە نزیکە بەوەی پەنا ئەباتە بەر سەرنجدان لە چەند بابەتێك کە تا ئێستانەگەیشتوونەتە رادەی زانستی گومان لێ نەکراو... هەروەها لە زانستەوە نزیکە بەو پێیە رووی گوفتاری ئەکات عەقڵی ئادەمیزاد و هیچ جۆرە زۆرەملێ و بەسەرا سەپاندن و سزا و پاداشت لە ئەنجامەکانیدا نییە.

---

[1] برتراند راسل: تاريخ الفلسفة الغربية، ج١، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محمود، ط٢، لجنة التأليف و الترجمة و النشر، القاهرة _ ١٩٧٦.

# بەشی دووەم

# لقەکانی فەلسەفە

میتافیزیک

لۆژیک

تیۆری زانین

ئاکار

ئیستاتیک

سۆفیزم

## لقەكانی فەلسەفە

ئەگەر سەرنجێك لە فەلسەفەی كلاسیكی و بەرهەمی فەیلەسووفەكانی بدەین بۆمان دەرئەكەوێ كە فەیلەسووف نیمچە ئینسكلۆپیدیایەك بووەو لایەنێكی نەهێشتۆتەوە لە لایەنەكانی ژیان و دەورووپشتی بەبێ ئەوەی ئەسپی خۆی تیادا تاودات و بە خامە رەنگینەكەی رەنگی بۆ بڕێژێ... خۆ ئەگەر وردتر سەرنج لە بەرهەمەكانی فەلسەفە بدەین ئەوان بۆمان ساخ ئەبێتەوە كە لە پێنج لق پێك هاتووە و هەندێ شارەزاش سەربارێكی بۆ زیاد ئەكەن.

جار لەم بوارەوە ئەتوانی بەدوو شێوە لقەكانی فەلسەفە دەستیشان بكەین:

فەلسەفە لەم لقانە پێكهاتووە:

* میتافیزیك Metaphysics
* لۆژیك Logic
* تیۆری زانین Epistemology
* ئاكار Ethics
*ئیستاتیك Aesthetic
* سۆفیزم.

ئەم لقە "سۆفیزم" جێگای لە یەكتری جیابوونەوە و ناكۆكی نێوان شارەزایانە و زۆربەی زۆریان بە بابەتی فەلسەفەی دانانێن، بەلام ئێمە بە مەبەستی پتر شارەزاكردنی خوێنەری كورد بڕیارماندا باسی ئەم لقەش بكەین... یاخود ئەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە بابەت و لقەكانی فەلسەفە دەستنیشان بكەین:

- ئەنتۆلۆژی[1]: باسی سروشت و راستی بوون و چوارچێوە گشتییەكەی ئەكات كە ئەتوانین بە میتافیزیكی ناوبەرین.
- ئیستمۆلۆژی[2]: ئەمەش باسی زانینی ئادەمیزاد و سنوورەكانی ئەكات، لەگەڵ ئەو رێگایانەی كە لەم بوارەدا ئەگیرێتەبەر ئەم لقە تیوری زانینە.

---

1 Ontology المبحث الوجود.

2 Epistemology نظرية المعرفة.

• ئەکسیۆلۆژی[1]: باسی پوختەی بەهاکان ئەکات (چاکەکاری و جوانی و راستی) کە یەکەمیان ئاکارە و تیایدا لە نموونەی بەرزی رەوشت و رەفتار ئەکۆڵرێتەوەو دووەمیش جوان ناسییە[2] کە تیایدا باسی هونەر و نموونەی بەرزی هونەر و پێودانگەکانی ئەکات سێیەمیش (راستی) بابەتی لێکۆڵینەوەکانی لۆژیکە.

## میتافیزیك

مەبەست لە میتافیزیك باس و لێکۆڵینەوەی مەسەلە و بابەتەکانی "بوونی نامادەی" و گەڕانە بە شوێن یەکەم هۆکار و هۆیە دوورەکانی ئەم کێشە و بابەتانەی لەسەر و مادە و لەودیو سروشتەوەن و لێوەیان جیاوازە.

وشەی میتافیزیك لە دوو کەرت پێکهاتووە:

میتا: لەدوا.

فیزیك: سروشت.

کەوابوو وشەکە بە تێکڕایی مانای لەدوا سروشتەوە ئەبەخشێ. ئەم زاراوەیە چۆن و کەی پەیدا بووە و چۆن ئەم جێگایەی ئێستای خۆی کردۆتەوە؟

ئەوی راست بێ ئەم زاراوەیە ناوێکە بەسەر بەرهەمێکی ئەرستۆدا بڕاوە، ئەم بەرهەمەی ناوی فەلسەفەی یەکەم بووە.. کاتێك ئەندرۆنیقۆس بەرهەمەکانی ئەرستۆی مامۆستای بەڕیز کۆ ئەکاتەوە ئەم بەرهەمە ئەخاتە دواکتێبی سروشتەوە و لەخۆیەوە ناوی ئەنێ لەدوا سروشتەوە[3]... ئیتر لەو رۆژەوە ئەو ناوە خۆی سەپاند و لە دەریای بێ بنی فەلسەفەدا جێگای خۆی کردۆتەوە. بەڵام ئەبێ ناوەرۆکی ئەو بەرهەمەی ئەرستۆ چی بێ و چ کێشەیەك باس ئەکات کە ناوی نراوە میتافیزیك و ئێستاکە خەڵکی بەچاوی گومانەوە سەرنجی ئەدەن؟

ئەرستۆی لە کتێبی میتافیزیکدا بە دوورودرێژی باسی ئەم بابەتانە ئەکات:

---

1 Axiology . مبحث القيم

2 الدكتور محمد علي ابو ريان: الفلسفة و مباحثها. دارالمعارف بمصر، القاهرة _ ١٩٦٦، ص١٠٢.

3 الأستاذ يوسف كريم، الطبيعة و مابعد الطبيعة، ص١٣٥.

هـەیولاو فـۆرم، گەوهـەر و ماهییـەت، دە کاتیگۆرەکـان، هێزەکـی و کردەکـی و[1] نیلاهییـات و یەکـەم بزوێنـەر، بزووتنـەوەی ئەسـتێرەکانی ئاسمـان... یەکـەم بنـچینەکانی بـوون، هۆیـە دوورەکـان، شـیکردنەوەی تیـۆری فـۆرمی ئـەفلاتوون[2]... زانین، بڕوا و گۆمان... هتد.

بەلای رابەری میتافیزیکەوە ئەم بابەتە بەرزترین بابەتی فەلسەفەیە چونکە باسـی لایـەك ئـەكات کـە لەکـەموکوڕی و کەلەبـەر و گۆڕانـەوە دوورە... باشـە ئـەبێ بۆچـی بوونی ئەم میتافیزیکە بەلای ئەرستۆوە پێوست بێ یان نا؟ وە بۆ چی؟ ئەبێ بەچـی لە زانست و بابەتەکانی تر جیا بکرێتەوە؟.

ئەرستوو بوون ئەکات بە دوو بەشەوە: جیهانی یەکەم کە بە جیهانی ژێر فەلەکی مانگی دائەنێ. جیهانی سەرو فەلەکی مانگ... جیهانی یەکەم لە هەیولا و فۆرم و مادە پێك هاتووە و بوونەکان بە ریز و پلە بەرز ئەبنەوە تا ئەگەنە یەکەم بزوێنەر کە وێنـەی رووتـە و هـیچ مادەییـەکی تیـادا نییـە.. جیهانی یەکەم سەرچاوەی گۆڕانـە و جیهانی دووەمیش چونکە لـە ماددەوە دوورە دەسـتی مـاددە و شـێواندن نایگـاتێ... کـەوابوو جـۆرە فەلسـەفەیەکی بـەرزی تایبـەتی ئـەوێ ئـەویش فەلسـەفەی یەکـەم واتـە میتافیزیکە...

بـەلای رابـەری میتافیزیکـەوە... زانسـت بـەبێ ئـەم بابەتـە هـەڵناکات و بـوونی نـابێ چونکە: (زانستە تایبەتییەکان کە هەریەکێکیان[3] لە جۆرە بابـەتێك ئەکۆڵنـەوە، چـەند چـەمك و زاراوەیـەك بـەکار ئـەهێنن وەك: خـۆیی، جیـاوازیی و یەکـەتی، فـرە، _ ئەمانەش بە تێکڕایی بابەتەکانی زانستی گشتی بوونن واتە بابەتی میتافیزیکین).

میتافیزیـك وەك بابـەتێك سـەیر و سەرنجڕاکێـشەرە، ئـەتوانین بڵـێین لـە هـەموو سـەردەمێکدا جێگـای هەڵسەنگاندن و شـەن و کـەوکردن بـووە، چ بـە رەتکردنـەوە یاخود بە پەرەپێدان و بڕارکردن. دێڤید هیـوم (١٧١١ _ ١٧٧٦ز) زەبرێکـی تونـدی

---

1 قوة (Potentiality) و فعل: (Actuality) بۆ پتر شارەزابوون بڕوانە: ابن رشد: تلخیص مابعد الطبیعة لارسطو: تحقیق الدکتور عثمان امین. مطبعة مصطفي البابي الحلبي واولادة في مصر القاهرة _ ١٩٥٨.

2 Aristotle Metaphysica: Ed, w. D. Ross. Oxford Press.

3 دی. اف. بیرز: طبیعة المیتافیزیقا، ترجمة: الدکتور کریم متي. مراجعة الدکتور کامل مصطفي الشیبي، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٦٨، ص٥.

لە بیری میتافیزیك دا و بەلایەوە (ئێمە ناتوانین لە سنووری تاقیکردنەوە تێپەڕین)[1] بۆیە ئەبێ کە کتێبێکمان لە کتێبەکانی میتافیزیك بەدەستەوە گرت یەکسەر بپرسین ناوەڕۆکی ئەم کتێبە پەیڕەوی بیری ماتماتیك ئەکات؟ ئەگەر وەڵامەکە بە "نەء" بوو سەرلەنوێ ئەپرسینەوە: باشە ناوەڕۆکەکەی بەندە بە پەیڕەوی تاقیکردنەوە؟ ئەگەر دیسان وەڵامەکە (نەء) بوو ئەوا بێ سڵکردنەوە ئەو کتێبە فڕی ئەدەینە ناو ئاگرەوە[2].

هەروەها هیوم هێرشێکی توندی کردۆتە سەر کێشەی بەیەکەوەبەسترانی هۆکار و ئەنجام و ساخی کردوتەوە کە ئەم کێشەیە بنچینەیەکی پتەوی لۆژیکییانەی نییە.

ئەمانوئیل کانت کە وەك خۆی ئەڵێ هیوم ( لە خەوی غەفلەت راستی کردۆتەوە)[3] لەسەرەتادا هێرشی کردۆتە سەر میتافیزیکی کلاسیك و داوای لە فەیلەسووفەکان کرد وە ساتێك لە کارکردن بوەستن و بپرسن: ئایا ئەگونجێ میتافیزیك هەبێ یان نا؟[4] بە باوەڕی کانت میتافیزیك بە پێچەوانەی زانستەوە لەو رۆژەوە داهێنراوە تاکە هەنگاوێك نەچۆتە پێشەوە... ئەمەش وای لێکردوە کە دەست بداتە قوڵنگ و کۆشکەکەی هەڵبوەشێنێتەوە... کەچی ئەنجامەکە شتێکی تر دەرچوو .. کانت داروپەردوی میتافیزیکی تێکدا بەڵام میتافیزیکێکی تری هێنایە کایەوە کە میتافیزیکی رەخنەگرییە. وەنەبێ خۆشی هەستی بەمە نەکردبێ بەڵکو بە ئاشکرا ئەڵێ:

لە چارەی ئەقڵ و مێشکی ئادەمیزاد نووسراوە کە بەدەست ئەم پرسیارانەوە بناڵێنی:

ئەتوانم چی بزانم؟
چی پێویستە لەسەرم بیکەم؟
ئەگونجێ بەهیوای چی بم[5]؟

---

[1] الدكتور كريم متي: الفلسفة الحديثة منشورات جامعة بنغازي كلية الاداب ١٩٧٤ ليبيا، ص ٢٠٤.

[2] ئەم تێکستەم لەم کتێبەوە وەرگرتووە:

الدكتور توفيق الطويل: اسس الفلسفة، ط٥ دار النهضة العربية القاهرة. ١٩٦٧، ص ٢٧٩.

[3] امانويل كنت: مقدمة لكل ميتا فيزيقا مقبلة يمكن ان تصير علما. ترجمة: الدكتورة نازلي اسماعيل حسن. دار الكاتب العربي للطباعة و النشر القاهرة _ ١٩٦٨ ص٤٨.

[4] هەمان سەرچاوە... ل٤٢.

[5] عمانوئيل كنت: نقد العقل المجرد، ترجمة احمد الشيباني دار اليقظة العربية بيروت ١٩٦٥، ص ٨٥٥.

ئەوەی جێگای داخە ئەقڵی ئادەمیزاد سنوورێکی تایبەتی هەیە بۆیە ناتوانێ بە دڵنیاییەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، خۆ ئەگەر ئەقڵ لەو سنوورەی خۆی چووە دەرەوە کە بۆی دانراوە ئەوا ئەکەوێتە ناو گێژاوی تاریکی و وڕێنەکردن و نازانێ چی ئەڵێ، ئنجا کانت هێرش ئەباتە سەر بەڵگەی ئەنتۆلۆژی و ئەڵێ هەر کەسێك بە بەڵگە بۆم ساخ بکاتەوەکە خوا هەیە ئەوا من بە بەڵگەی بەهێز پێچەوانەی ئەنجامەکەی ئەو ساخ ئەکەمەوە... واتە بەڵگەی ساخکردنەوەی میتافیزیك و رەتکردنەوەی وەك یەك بەهێزن.

بەڵام کانت ئەڵێ: ژیانی ئاکاریمان و بڕوابوون و ژیانی رۆژانەمان وامان لێ دەکەن کە جارێکی تر خۆمان بخەینەوە باوەشی میتافیزیك و بڕوامان بە بوونی "خوا و نەمریی گیان و سەربەستی خواست" هەبێت چونکە ئەمانە مەسەلەی هەرە گرنگی ژیانی رۆژانە و ئەقڵی پراکتیکن[1]... جا بۆیە ئێمە ناچارین جارێکی تر پەنا بەرینە وەبە بەر میتافیزیك وەك دۆستێك کە بە ناچاریی دڵمان شکاندووە ئاشتی بکەینەوە[2]. کانت لەو باوەڕەدایە کە هیچ فەیلەسووفێك ناتوانێ خۆی لە میتافیزیك دەرباز بکات چونکە (ئێمە لەو باوەڕەداین کە ناتەواویی و کەلەبەر لە شارەزاییمان دایە و ئەمانەوێ بەهۆی لێکۆڵینەوە و سەرنجدان ئەم کەلەبەرە پڕ بکەینەوە)[3] ئەمەش دووبارە ئەمانخاتە باوەشی میتافیزیك.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا رێبازی لۆژیکەڵ پۆسیتیڤیزم بەناوی زانستەوە و پشت ئەستوور بەو بەرهەمانەی لەمەوبەر لەو بوارەدا نووسراون هێرشێکی توناکەری کردۆتەوە سەر میتافیزیك و بە یەکجاری پەرێشانی کردوە. رابەرانی ئەم رێبازە لەو باوەڕەدان کە (بیر و سەرنج و کێشەکانی میتافیزیك لە خەیاڵ و خەونی شاعیرێك ئەچن کە رێگای ون کردبێ)[4]... بەڵام ئایا ئەم رێبازە لەم کۆششەیدا سەرکەوت و میتافیزیکی لەناوبرد؟ بێگومان نەء[5].

---

[1] عمانوئيل كنت: نقد العقل العملي، ترجمة: احمد الشيباني. دار اليقظة العربية بيروت ١٩٦٥، ص٢١٠ فما بعد.

[2] عمانوئيل كنت: نقد العقل المجرد، ص٨٩٧.

[3] دي. اف. بيرز: طبيعة الميتافيزيقا، ص ١٢٦.

[4] الدكتور زكريا ابراهيم: دراسات في الفلسفة المعاصرة، ج١، دار مصر للطباعة، ط١، القاهرة، ١٩٦٨، ص٢٩١.

[5] بۆ پتر شارەزابوون لە هەڵوێستی ئەم رێبازە دەربارەی میتافیزیك سەرنج لەم دوو کتێبە بدە: الدكتور زكي نجيب محمود خرافة المتيافيزقا.

## لۆژیـــك

هەر یەكێك لە ئێمە لە قسەكردندا، پێ بزانێ یاخود پێ نەزانێ، لە بیركردنەوەدا، لە لێكۆڵینەوەدا، لە لێكۆڵینەوە و تێفكریندا زۆرجار پەیڕەوی چەند بنچینە و یاسایەك ئەكات، وە هەر ئێمەش لەم قسەكردنەدا ئەڵێین ئەم شتە (مەنتیقییە) كەوابوو مەبەستمان لەمە چییە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بە پرسیارێكی ترەوە بەندە... ئەویش ئەوەیە كە لۆژیك و بیركردنەوەی لۆژیكیانە چییە؟ ئەو یاسا و بنچینانە كامانەن كە بیر بەكاریان ئەهێنێ و بە موڵكی لۆژیك دائەنرێن؟

ئەگەر سەرنجێك لە لاپەڕەكانی مێژووی فەلسەفە بدەین بۆمان دەرئەكەوێ كە ئەرستۆی یۆنانی داهێنەری راستەقینەی زانستی لۆژیكە و ئەم ئەو بابەتەی خستۆتە چوارچێوەیەكی رێكوپێك و روخساری زانستی كردووە بە بەردا... راستە پارمەنیدس چەند یاسایەكی بەكارهێناوە وەك یاسای خۆیەكیی و یاسای بێ ناكۆكی[1] بەڵام ئەرستۆ دوای پارمەنیدس ئەم یاسایانەی، زانستییانە داڕشتووە و بەرگێكی رێكوپێكی بەبەردا كردوون... پوختەی ئەم دوو یاسایەش بەم شێوەیەیە:

١. (ا) هەر (ا)ە.

نا (ا) هەر نا(ا)ە.

٢. (ا) ناگونجێ نا (ا) بێ یاخود

نا (ا) ناگونجێ (ا) بێ.

هەروەك وتمان ئەرستۆ داهێنەری راستەقینەی لۆژیكە بۆیە پێی ئەوترێ مامۆستای یەكەم... بەلای ئەرستۆوە زانستەكان ئەكرێن بە دوو بەشەوە... هەر زانستەش دەروازە و رێگاخۆشكەرێكی هەیە ئەو دەروازەیەش لۆژیكە.

ئەگەر بڵێین بۆ؟ ئەرستۆ لە وەڵامدا ئەڵێ: بیری ئادەمیزاد بۆ ئەوەی نەكەوێتە هەڵەوە ئەبێ پەیڕەوی چەند یاسا و بنچینەیەك بكات... كەوابوو لۆژیك زانستێكە ئەگەر پەڕەو بكرێ، مێشك و بیر لە هەڵەكردن ئەپارێزێ[2].

---

[4] Principle of Identity Principle of non- Contradiction

[2] بڕوانە: ابوالعلا عفيفي: المنطق التوجيهي، لجنة التأليف و الترجمة و النشر مصر ١٩٣٨،ص٤.

ئەرستۆ وشەی لۆژیکی بەکار نەهێناوە بەڵکو لەو سەردەمەدا وشەی ئەنالۆوتیکا و ئۆگانون بەکارهاتوون و لە سەردەمی شیشەرۆندا لۆژیك بە مانای (دیالێکتیك هاتووە و بۆ یەکەم جار ئەسکەندەری ئەفرۆدیسی ئەم وشەیەی بەکارهێناوە)[1].

لۆژیکی ئەرستۆ بە فۆرمەل لۆژیك بە "لۆژیکی روخسارییانە" ناسراوە چونکە بایەخ بە فۆرمی یاساکانی بیر ئەدات و ناوەڕۆکی بیرومانا و بابەتەکانی پشتگوێ ئەخات[2]... گرنگترین شت لە لۆژیکی ئەرستۆدا "قیاسە"[3] ئەمەش لە دوو پێشەکی و ئەنجانێك پێك هاتووە، ئەنجامەکەش بە ناچاریی لەم دوو پێشەکییەوە دێتە کایەوە. قیاسیش ئەکرێ بە چەند جۆرێکەوە وەك (پێوانەی مەرجەکی و ...هتد). ئەرستۆش لەو باوەڕەدا بوو کە قیاس سێ فۆرمی هەیە و[4] جالینۆسیش فۆرمی چوارەمی خستۆتە سەر. ئەم فۆرمانەش هەر یەکە لە چوار شێوە پێکهاتووە کە بە وشەی لاتینی ئەنووسرێن و دەنگی تایبەتی و روخساری تایبەتییان هەیە.

بە تێکڕایی لۆژیکی ئەرستۆ دوو خاسییەتی هەیە[5] : یەکەم: روخسارییە. دووەم: ئیستدلال[6] و بەتایبەتی ئیستیدلالی قیاسی ناوەڕۆکی ئەم لۆژیکە پێك ئەهێنن.

هەر چەند فۆرمەل لۆژیکی مامۆستای یەکەم، ماوەی دوو هەزار ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و هیچ هێزی نەبوو بەرنگاری بکات[7]. بەڵام لە سەدەی نوێدا ئەم لۆژیکە روخسارییە درایە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و داری بەسەر پەردوویەوە نەهێشترا و ساخکرایەوە کە رەسل وتەنی: "هەر چی بیەوێ کاتی خۆی بە فیڕۆ بدات ئەوا خەریکی لۆژیکی ئەرستۆ و قوتابییەکانی بێت"[8].

---

1 مراد وهبة: المعجم الفلسفي، ص ١٦٩.

2 الدكتور عبدالرحمن بدوي: المنطق الصوري و المنطق الرياضي، ص ١٤.

3 Syllogism

4 بروانە ئەم کتێبە: الدكتور ياسين خليل: نظرية ارسطو المنطقية، مطبعة اسعد – بغداد ١٩٦٤.

5 الدكتور عزمي اسلام: اسس المنطق الرمزي: مكتبة النجلو المصرية ١٩٧٠، ص ١ _٣.

6 Deduction

7 بۆ پتر شارەزابوون لە لۆژیکی ئەرستۆ بڕوانە: لوکاشيفتش: نظرية القياس الارسطية، ترجمة الدكتور عبدالحميد صبرة، دارالمعارف بالاسكندرية، مصر١٩٦١. بۆ پتر شارەزابوونیش لەو رەخنانەی ئاراستەی لۆژیکی ئەرستۆ ئەکرێن بڕوانە: الدكتور زكي نجيب محمود: المنطق الوضعي، ج١،ء مكتبة الانجلو المصرية، ط٤، القاهرة_ ١٩٦٥، ١ ص ٣٢٣،.

8 برتراند رسل: تاريخ الفلسفة العربية، ط القاهرة –١٩٦٧ ج١، ص ٣٢٣.

ئەگەر ئەو تەقەللایە بخەینە پشت گوێ کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا درا بۆ چاککردنی لۆژیك ئەوا فرەنسیس بیکون و ئۆرگانە نوێیەکەی یەکەم تەقەللای زانستییانەیە بۆ پڕکردنەوەی کەلەبەری فۆرمەل لۆژیك و داهێنانی ڕێگایەك کە زانست لە پەرەسەندن و بەرەوپێشچووندا پەیڕەوی بکات. بەلای فرەنسیس بیکونەوە لۆژیکی ئەرستۆ شتێکی تازە ناداتە دەست لەبەر ئەوە ئەبێ پشت بە ڕێگایەکی تر ببەستین کە ئەویش (ئیستقرایە)[1]... ئەم ڕێگایە ئەنجامی زانستی فراوان ئەداتە دەست[2]... ڕێبازی بیکون لەم بوارەدا ئەکرێ بە دوو بەشەوە:

- لایەنی نالەبار کە بریتییە لە دەستنیشانکردنی خەیاڵ و هەڵە و تەقەللادان بۆ خۆ دەربازکردن لێیان.
- لایەنی لەبار ئەویش ناوەڕۆکی کتێبی ئۆرگانۆنی نوێیە [3].

دیکارتی فەرەنسایی و لایبنیتزی ئەڵمانیایی بایەخێکی زۆریان بە لۆژیك داوە. لایبنیتز هەوڵی دانانی بەردی بناخەی لۆژیکی نوێی داوە و ئەو وای بۆچووە کە زمانی ئاسایی لە توانایدا نییە بە وردی و ڕێکوپێکی مەسەلەکانی زانست و فەلسەفە دەربڕێت لەبەر ئەوە کۆششی کردووە زمانێك دابنێ لە جیانی وشە، سیمبۆڵ بەکاربهێنێ [4] و لەسەر بناغەیەکی پتەو دابڕێژرێ و هەموو زانستەکان سوودی لێ وەربگرن.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا بایەخێکی زۆر بە لۆژیکی نوێ درا چەند ڕێبازێکی تازەی بۆ هێنرایە کایەوە..

گۆتلۆب فرێگە [5] هەوڵی دا لۆژیك لە متیافیزیك و سایکۆلۆژی دەرباز بکات و جۆرج بول ئەلجیبرای لۆژیکی دانا و بیرتراند ڕەسل و ئەلفرید نورث وایتهید لە بەرهەمێکی

---

[1] Induction

[2] بڕوانە: یوسف کرم: تاریخ الفلسفة الحدیثة.

[3] الدكتور زكي نجيب محمود: المنطق الوصعى الفرد الثاني ص ١٧٦.

[4] الدكتور ياسين خليل: المنطق و الرياضيات ص١٢.

بۆ بەراوردکردنی لۆژیکی ئەرستۆ و لۆژیکی نوێ بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوەیە:
Carnap, R: The old and new Logic Ayer, A, J: Logical Positivism,p.13

[5] کتێبی بنچینەکانی ماتماتیك : Principal Mathematica

زانستییانەدا ساخیان کردەوە نەك هەر پەیوەندی لەنێوان لۆژیك ماتماتیکدا هەیە بگرە ماتماتیك لۆژیکە و پەرەی سەندووە [1] و هاتۆتە کایەوە.

لەو سەردەمەشدا لۆژیکی نوێ یاخود لۆژیکی سیمبۆلی دەورێکی کارگەر لە جیهانی فەلسەفە و زانستدا ئەگێڕێ و هەندێ ڕێبازی فەلسەفە لۆژیك لەگەڵ تیۆری زانیندا بەو دوو لقەی دائەنێن کە بە تەنیایی بۆ فەلسەفە ماونەتەوە و خزمەتی زانا و زانستەکان ئەکەن.

---

[1] ئەوەی بیەوێ لە لۆژیکی نوێ بکۆڵێتەوە وای بەباش ئەزانین ئەم کتێبانە بخوێنێتەوە:

_ الفرد تارسكي: مقدمه للمنطق ولمنهج البحث في العلوم الاستدلالية. ت. عزمي اسلام الهيئة المصرية العامة للتأليف و النشر القاهرة – ١٩٧٠.

_ ا، ه، بيسون د.ج اوكونر: مقدمة في المنطق الرمزي، ت: عبدالفتاح الديدي دارالمعارف بمصر القاهرة –١٩٧١.

الدكتور عزمي اسلام: اسس المنطق الرمزي، القاهرة، ١٩٧٠ مكتبة الانجلو المصرية.

## تیۆری زانین

تیۆری زانین یاخود ئیپستمۆلۆژی[1]بابەتێکە لە بابەتە هەرە گرنگەکانی فەلسەفە و بە پێچەوانەی میتافیزیک لەو رۆژەوە هاتۆتە کایەوە هەر هەوڵی پەرەپێدانی دراوە تا ئەو رادەیەی لەم سەردەمەدا لەگەڵ لۆژیک بە دوو لقە هەرە گرنگەکەی فەلسەفە دائەنرێن.

تیۆری زانین وەك زانستێك لەسەر دەستی جون لوك سنورو قەوارە و سەربەخۆیی پێ برا. لوك لە ساڵی (١٦٩٠) باسێکی لەژێر ناونیشانی "نووسینێك دەربارەی بیری ئادەمیزاد" بلاوکردەوە ئەمەش یەکەم کاری زانستییانە بوو دەربارەی بنچینە و کاکڵە و سنووری زانین و رادەی دڵنیایی لێکردنی. ئەوەی لەم بوارەدا "لوك"ی هان دا ئەم باسە نمرە بنووسێ جیاوازی بیروڕاو ناکۆکی نێوان فەیلەسووفەکان بوو دەربارەی کێشەکانی میتافیزیك و فەلسەفەی ئاکار و ئایین[2]... ئەگەر فەیلەسووفەکانی پیش سوقرات بخەینە پشتگوێ ئەوا بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەفلاتوون لە رەتکردنەوی فەلسەفەی سوفستاییەکان و لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی هیراکلیتسدا چەند شتێکی درەبارەی تیۆری زانین وتووە بە تایبەتی لەوەدا کە ئەڵێ هەستەکان سەرچاوەی زانین نین بەڵگەشی لەم قسەیەدا ئەو شتانەیە کەلە کاتی "خەتن و نەخۆشی و شێتی و بواری تردا" روو ئەدەن... سوقرات کە نەخۆش بێ شەرابی لە دەمدا تاڵە و کە ساخیش بێ هەست بە تامخۆشی وشیرینیی شەراب ئەکات[3] کەوابوو هەستەکان سەرچاوەی بڕواپێکراوی زانین نین. سەرچاوەی زانین

---

1 (Epistmology) ناوی باوی تیوری زانینە.

2 بڕوانە: ازفلد کولبة: مدخل الى الفلسفة، ترجمة: ابو العلا عفيفي ط٣ لجنة التأليف و الترجمة و النشر القاهرة ١٩٥٥، ص٣٨.

3 بڕوانە: افلاطون: محاورة ثياتيتوس او عن العلم، ت: اميرة حلمي مطر.

چییە؟[1] لوك بە جۆرێکی تر سەیری ئەم کێشەیە ئەکات و وای بۆ ئەچێ کە هەست و تاقیکردنەوە سەرچاوەی زانینن و ئەقڵی ئادەمیزاد وەك لاپەڕەیەکی سپی[2] وایە تاقیکردنەوەکانی ژیانی رۆژانە شتی لەسەر ئەنووسن.

ئەمانۆییل کانت ئەم دوو لایەنەی لێك دا و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە هەست و ئەقڵ هەردووکیان هاوکاری ئەکەن، هەستەکان وێنەی ساکارمان بۆ دەهێنن و ژێر بەهۆی چەند چوارچێوەیەکەوە[3] ئەم وێنانە رێکوپێك دەکات و دایانئەرێژێ. بەم پێیە زانیمان دروست ئەبێت.

وەك لە فەلسەفەی هاوچەرخدا چەند رێبازێکی جیاجیا درەبارەی ئەم لقەی فەلسەفە بەدی ئەکرێن... لەمانە ئارنست ماخ[4]... بەلای ئەو فەیلەسووفەی نەمساوە بیرو تاقیکردنەوە لە دانانی بەردی بناخەی زانیندا... هەردوو دەور ئەگێڕن ئارنست ماخ وەك زانا و فیزیکناسێك لەو باوەڕەدا بووە کە زانینی ئادەمیزاد وەستاو نییە بەڵکو لە گۆڕان و پەرەسەندنێکی هەمیشەیی دایە.. چەندە لە شتی تازەتر شارەزا ببین ئەوەندە زانینمان فراوانتر ئەبێت.

مێشکی ئادەمیزاد لە سەرەتادا هیچی تێدا نییە ئەو قسەیە هەڵەیە کە ئەڵێ: راستەوخۆ لەدوای دیاردەکانەوە گەوهەر هەیە... بەڵکو ئەو شتانەی ئەیانبینین و هەست بە بوونیان ئەکەین کۆمەڵە "خسڵەت"ت یان کۆمەڵە کەرەسە و هەستکردنێکن. لەلای کارل مارکس، زانین رەنگدانەوەی جیهان و دەورووپشتمانە لەسەر مێشکی ئادەمیزاد و ئەو زانینەش ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕینی "واقیع"، پراکتیك و کرداری رۆژانە و تاقیکردنەوەی زانستیانە و خەباتی چینایەتی وکاری بەرهەمهێنان سەنگی محەکن بۆ ساخکردنەوەی دروستی و نادروستی ئەو شتانەی ئەیانزانین.

دوای ئەو باسە کورتە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی بڵێین تیۆری زانین وەڵامی ئەم پرسیارانە ئەداتەوە و لەم بابەتانەی خوارەوە ئەکۆڵێتەوە:

---

[1] بۆ پتر شارەزابوون بروانە تیۆری زانین لە فەلەسەفەی ئەفلاتووندا لە لاپەرە ١٠٠ی ئەم کتێبەدا.

[2] Tabula Rasa.

[3] Gategory.

[4] بروانە ئەم کتێبە:الدکتور یاسین خلیل: مقدمه فی الفلسفه المعاصر ص ٢٩١-٢٩٣.

سەرچاوەکانی زانین کامانن[1]... چۆن ئادەمیزاد ئەو شتانەی دەوروپشتی ئەزانیٚ و چۆن ئەو شتانەمان زانیوە ئێستا ئەیزانین.

لێکۆڵینەوەی سروشتی زانین[2]چۆن ئەبێت؟

توانا و سنووری زانینی ئادەمیزاد چەند بڕ ئەکات[3]... ئایا ئادەمیزاد ئەتوانیٚ هەموو شتێك بزانیٚ یان نا؟

ئایا زانینی جیهان لە تواناداىە یان نا؟

بێگومان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەش رێبازی گشتی ئەو فەیلەسووفە دەستنیشان ئەکات و ئەیخاتە پاڵ ئۆردوگایەك لە ئۆردوگاکانی رێبازەکانی فەلسەفە.

---

1 الدكتور امام عبدالفتاح امام: مدخل الى الفلسفة، دار الثقافة و النشر، القاهرة، ١٩٧٢ ص ١٤٠ – ١٤١.

2 Mature of Knowledge.

3 The Probability of Knowledge.

# ئــاكار

ئاكار (ئەخلاق) لەو لقە كۆنانەی فەلسەفەیە كە لەم سەردەمەدا خەریكە بە تەواوەتی سەربەخۆ ئەبێ و لە ئامێزی دایكی جیا ئەبێتەوە هەروەها خەریكە بابەت و ڕێڕەو و سنووری خۆی دەستنیشان ئەكات.

ئەوی ڕاست بێ لێكۆڵینەوەی ئاكار یەكسەر ئەمانباتە سەر باسكردنی بابەتەكانی سیاسەت. چونكە ئادەمیزاد گیان لە بەرێكی كۆمەلایەتییە (هەروەك ئەرستۆ وتویەتی) و لە كۆمەڵ و سەردەم و شوێنێكدا دەژیا. خۆ ئەگەر ڕەوشت و كرداری هەر ئادەمیزادێك بكەین بە بابەتی لێكۆڵینەوە و باسكردن ئەوا وردە وردە ئەچینە ناو جەرگەی ژیانی كۆمەلایەتی و كۆمەڵگا و داو و دەزگاكانی سەرخان و ژێرخانییەوە. نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت كە ئەفلاتوون مرۆڤی چاكی بە دەوڵەتی باشەوە بەند كردووە و ئەڵێ:

تەنیا لە سێبەری ڕێژیمێكی لەبار و چاكدا ئادەمیزادی باشمان دەسگیر ئەبێ.

لەم هەڵوێستەوە ئاكار وەك چەند یاسا و بنچینەیەك شان بە شانی سیاسەت گۆڕانی بەسەردا هاتووە... بەروپێشچوونی فەلسەفەی هەر لە سەردەمی یۆنانەوە ڕاستی ئەم قسەیە ساخ ئەكاتەوە. هەر بەم پێیەش بە گوێرەی ڕەوشی سیاسی و ئابووری و كۆمەلایەتی بابەت و سنوور و قەوارەی ئاكار وەك تیۆرێك دەسنیشان كراوە. بۆ نموونە ئەتوانین دوو جۆری تیۆری ئاكار بەم پێیەی خوارەوە دیاری بكەین:

- ئاكاری سەردەمی یۆنانی كە بە "ئاكاری بەختەوەری" ناو ئەبرێ وخۆی لەم ڕستەیەدا ئەنوێنێ:

"ئەم ئیشە بكە چونكە ئەبێتە هۆی بەختیار بوونت".

- ئاكاری نوێ (بەتایبەتی لەلای كانت) كە بە ئاكاری فرمان (واجب) دائەنرێ و بەم شێوەیە:

"ئەمە بكە چونكە ئەركی سەرشانتە".

مێژووی فەلسەفە وای دەرئەخات كە بابەتی ئاكار وەك چەند بیروڕایەكی جیاجیا لەلای سوفستاییەكانەوە دەست پێ ئەكات... بە باوەڕی ڕابەرانی ئەم ڕێبازە بە تایبەتی پرۆتاگۆرس:

"ئادەمیزاد پێوەدانگ و پێوەری هەموو شتێکە"(١)... کەوابوو با بزانین ئەنجامی ئەم قسەیە لەمەیدانی ئاکاردا چی ئەبێت؟ ئەم قسەیەی پرۆتاگۆراس، بە باوەڕی ئێمە بەشێکی گرنگە لە تیۆری زانین بەڵام مەیدانی ئاکاریش ئەگرێتەوە. چۆن؟ ئەگەر ئادەمیزاد پێودانگ و سەنگی محەکی راست و درۆ بێت ئەوا لە ئاکاریشدا هەر ئادەمیزاد سەنگی محەکی کاری بەد و چاکەکاری ئەبێت.

ئیتر لەم هەڵوێستەوە، هەمو راستییەکانی ئاکار "رێژەیی" ئەبن و بەپێی کات و شوێن و بە گوێرەی جیاوازی تاکەکەسان و بگرە بە پێی رەوشە جۆرە بە جۆرەکانی تاکە کەسێك ئەگۆڕدرێن هەر ئەم هەڵوێستەش لایەنی سیاسەت و کۆمەڵ و یاسا ئەگرێتەوە بۆیە سەیر نییە کە:

"یاسا بنچینەییەکانی ئاکار لە سەرەتاوە لە لایەن لاوازەکانەوە دانراین... ئەمانەش بەدکارن و سروشت باشە و ... دادپەروەری وشەیەکی بریقەدارە و لە راستیدا سەرشۆڕی و سوك و چرووکییە".(٢)

بەڵام ئەم رێبازەی سوفستاییەکان وا بە ئاسانی نەچوە سەر و پرۆتاگۆراس فرمان خنکاندنی بەسەردا دراو سوقراتیش لێیان راپەڕی و بیروراکانی رەت کردنەوە بەم هەنگاوەی بەردی بناغەی ئاکاری وەك بابەت و تیۆرێکی رێکوپێك و تەواو داناوە... بەلای سوقراتەوە راستە هەستەکان جێگای بڕوا نین و سەرچاوەی زانین نین... ئەوا بەم پێیەش یاساکانی ئاکار لەسەر بناخەیەکی پتەو و قایم و نەگۆڕاو دانراون و بە ئارەزووی تاکە کەسان و خەڵکی و کات نا گۆڕین و لەمەش پتر لە ئادەمیزاددا گیان و ئەقڵ هەیە کە دەسەڵاتیان بەسەر هەستەکاندا ئەشکێ و ئەیانبەنە رێوە... مرۆڤ هەمیشە چاکەی ئەوی و لە بەدکاری و شەڕ رائەکات... هەر کاتێکیش شتێك بۆ ئادەمیزاد دەرکەوت کە چاکە و خێرە ئەوا ئەیکات و پەسندی ئەکات ئەگەر بۆشی ساخ بۆوە کە خراپ و چەوتە ئەوا رەتی ئەکاتەوە جا بۆیە "فەزیلەت زانینە و

---

[1] دەقی ئەم قسەیەی پرۆتاگۆراس بەم شێوەیە:
"Man is the measure of all things"
بڕوانە: Zeller: E: outline of the history of Greek Philosophy: 13 th Edition, New York, P.81

[2] افلاطون: محاورة بروتا جوراس ... ترجمة محمد كمال الدين علي يوسف، دارالكتاب العربي للطباعة و النشر، القاهرة _ بدون تاريخ.

رەزیلەتیش نەزانینە" [1] ئەم قسەیەی سوقراتیش ئەم باوەڕە پتەوەی دانای یۆنانی دەرئەخات کە بە ئەقڵ و خێر و چاکەکاریی هەیبووە.

دوای پێچرانەوەی دا و دەزگای سەدەکانی ناوەڕاست و رزگاربوونی بیر لەژێر دەسەڵاتی قەڕالیچەی کڵێسادا چەند رێبازێکی تری فەلسەفەی ئاکار هاتنە کایەوە لەمانە رێبازە خۆپەرستییەکەی تۆماس هۆبز[2](١٥٨٨ _ ١٦٧٩) بەلای ئەو فەیلەسووفە مەتریالیستەی ئینگلیزەوە خەڵکی خۆپەرستن و ئەگەر دەسەڵات و هێز و توانایان هەبوو ئەوە دەستدرێژی ئەکەنە سەر خەڵکی لاواز و بێ دەسەڵات. خۆ ئەگەر بێ دەسەڵاتیش بوون ئەوا پەنا ئەبەنە بەر فێڵ و تەڵەکەبازیی و چاوبەستەکێ بۆ بەدیهێنانی ئاوات و مەبەستیان.

تەنانەت پێشکەوتنی شارستانییەتی ئادەمیزادیش تاکە تۆزقاڵێکی لەو سروشت و رەوشتەی ئادەمیزاد نەگۆڕیوە... بەلای هۆبزەوە، ئێمە ئەزانین کە دەوڵەت و پۆلیس و پاسەوان هەیە و پارێزگاریمان ئەکەن کەچی کە دە چین بۆ جێگایەك یاخود ئەگەر بمانەوێ بخەوین ئەوا خێرا دەرگاکانمان کڵۆم ئەکەین چونکە "ئەو گورگەی لە ناخماندا هەیە لەو گورگانە دڵنیا نییە کە لە کەمین دان".

لەلای ئەمانوییل کانت کێشەی ئاکار شێوەیەکی تر وەرئەگرێ کە ئەویش "ئەرك و فەرمان و واجب"ە.. واتە بەی فەیلەسووفی پروسیاوە بنچینەی ئاکار ئەم روخسارە وەرئەگرێ کە لەم رستەیەدا خۆی ئەنوێنێ:

"فلانە کار بکە چونکە پێویستە و ئەرکی سەر شانتە" یاخود بەو شێوەیەی "کانت" خۆی ئەیلێ کێشەکە ئەم پرۆپۆزیشنە وەرئەگرێ:

"هیچ کارێك مەکە ئەگەر ئەو کارە لەگەڵ ئەو بنچینەیەدا نەگونجێ کە ئەتەوێ ببێ بە یاسایەکی گشتی" یان "کارێك بکە کە بەپێی بنچینەکەی لە رێگای ویستتە وە بگاتە ئاستی یاسایەکی سروشتی"[3].

ئەگەر ئەم بنچینەیەی کانت روون بکەینەوە ئەوا ئەڵێین:

---

[1] بڕوانە کتێبە بەنرخەکەی مامۆستای مەزن خوالێخۆشبوو: یوسف کریم: تاريخ الفلسفة اليونانية، لجنة التأليف و الترجمة و النشر، ط٥، القاهرة _ ١٩٧٠، ص٥٣.

[2] الدكتور امام عبدالفتاح امام :محاضرات في الفلسفة الاخلاق ، دار الثقافة للطباعةوالنشر ص ٨٣-٨٤.

[3] امانويل كانت: تأسيس ميتافيزيقا الاخلاق، ترجمة الدكتور عبدالغفار مكاوي. الدار القومية للطباعة و النشر، القاهرة _ ١٩٦٥، ص ٦١ _ ٦٢.

بە باوەڕی ئەم فەیلەسووفە تاکە بنچینەیەکی پتەو کە یاساکانی ئاکاری لەسەر بنیات بنرێ ئەوا "ویستی چاکەیە" ئەمەش لەخۆیدا چاکییە نەك لەبەر ئەو ئاکامانەی لێیەوە دێنە کایەوە بەڵکو چونکە بەپێی "پێویست و فرمانی سەرشان" کار ئەکات... واتە لە ئادەمیزاددا لایەنێك هەیە کە خێر و چاکەی ئەوێت نەك لەبەر مەبەستێك یاخود ئامانجێکی تایبەتی بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم خێر و چاکەیە کردنە بە ئەرك و فرمانی سەرشانی خۆی دائەنێ و ئەو کارەی بە جۆرێك رائەپەڕێنێ کە وەك لە چوارچێوەی یاسایەکی گشتی دابێ و خەڵکی تریش وا لێ ئەکات بیکەن. بۆ نموونە: ئادەمیزادێك ئەیەوێ یەکێك لە خنکان لە ئاودا رزگار بکات و سەرناکەوێ، پزیشکێك نەخۆشێك[1] دەرمان ئەکات و نەخۆشەکەی ئەمرێ... ئەمانە هەردووکیان کاری چاکەن و لایەنە ئاکارییەکەیان تیادایە چونکە هەردووکیان لە ئاستی ئەرکی سەرشان و بە مەبەستی هەستکردن بە "ویستی چاکەوە" رەفتاریان کردووە... ئیتر لەم هەڵوێستەوە کانت ئەگاتە ئەو ئەنجامەی بڵێ ژیانی رۆژانە و ئاکارمان وامان لێ ئەکەن کە بڕوامان بە بوونی "خوا و نەمریی و خواستی ئازاد ... هتد" هەبێ[2] دوای کانت چەند فەیلەسووفێکی تر بەدی ئەکرێن لەم گۆڕەپانەدا ئەسپەکانیان لینگ داوە.. لەمانە فەیلەسووفی بەناوبانگ فرەدریك نیتشێ (Nietzche) (١٨٤٤ _ ١٩٠٠)... نیتشێ لەو باوەڕەدایە کە ئاکار و رۆشنبیری ئەکرێن بە دوو بەشەوە:

- ●ئاکاری لاواز و پایە نزمەکان "کۆیلەکان".
- ●ئاکار و رۆشنبیریی بەهێزەکان " گەورە پیاوان"[3].

هێز سەرمەشقی ژیانە و جەنگ ئاگر خۆشکەرێتی... جا بۆیە زەردەشت بە ئاشکرا روو لە خەڵکەکە ئەکات و ئەڵێ: "... بەو شێوەیە ئاشتیتان خۆش بوێ کە رێگایەکە بەرەو هەڵگیرساندنەوەی جەنگ[4]... باشترین ئاشتی ئەو ئاشتییەیە کە ماوەکەی کورتە و زۆر ناخایەنێ... من داواتان لێ ناکەم ئاشتی پەروەر بن بەڵکو هەمیشە سەرکەوتوو بن.. دەبا ئاشتییەکەتان سەرکەوتن بێ... هەر جەنگە کاری وا گەورەی

---

1 کانت:هەمان سەرچاوە... ل١٩

2 امانویل کانت: نقد العقلي العملي، ص ٢١٠_ ٢١٣، ترجمة احمد الشيباني، دار اليقظة العربية، بيروت ١٩٦٦.

3 يوسف كرم: تاريخ فلسفة الحديثة، دار المعارف بمصر ١٩٦٢ ، ص ٤٠٩.

4 فردريك نيتشة: هكذا تكلم زرادشت، فيلكس فارس. المكتبة الاهلية، بيروت، بدون التاريخ، ص٧١.

کردووە کە هەرگیز خۆشویستنی خەڵکی پەی پێ نەبردووە... هەر تەنیا ئازایەتی چاکە و خێرە".

ئەگەر سەرنج لە پەرەسەندنی مێژوو و شارستانییەت و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگا بدەین بۆمان دەرئەکەوێ کەهەمیشە ئاکاری کۆیلە و ئاکاری گەورە پیاوان لە زۆرانبازیدا بوون. لە سەردەمی یۆنان و رۆمان ئاکاری گەورەپیاوان زاڵ بووە و ئینجا بەهۆی ئایینی موسایی و مەسیحییەوە کۆیلە و لاوازەکان دەستیان رۆیشتووە و رەوشت و ئاکارەکانیان بەسەر کۆمەڵگا و داوودەزگاکاندا سەپاندووە.. بەڵام ئێستا کە دۆخێکی تر هاتۆتە پێشەوە... دۆخێك کە نەك ئادەمیزاد هەر ئاڵقەیەکە لە نێوان ئاژەڵ و سۆپەرماندا بگرە، "ئادەمیزاد گیان لەبەرێکە ئەبێ سەری کەوین و تێی بپەڕێنین"[١] نیتشێ دەڵێ: بەلای زەردەشتەوە "زانینی ئەوەی ژیانی ئادەمیزاد ئەپارێزێ گرنگ نییە بەڵکو ئەو ئەیەوێ بزانێ چۆن ئادەمیزاد بەسەر مرۆڤایەتییەکەیدا سەر ئەکەوێ و بەرزتر ئەبێتەوە" [٢]... مرۆڤی چاپوك و دلێر ئەو کەسە نییە کە هەوڵی زاڵبوون بەسەر خۆیی و خەڵکی تردا ئەدات لە پێناو بەختەوەری خۆیدا بەڵکو لە پێناو مەبەستێکی بەرزتردا ئەویش هاتنە کایەوەی ئادەمیزادی بەرز (سوپەرمانە)... نیتشێ بەوەندە ناوەستێ و بگرە هەنگاوێکی تر ئەهاوێژێ و داوای بە یەکجاری سڕینەوەی بەزەیی و خێر و چاکە ئەکات... چونکە ئەم چاکەو خێر و بەزەییە پەیوەندییان بە "بوونێکەوە" هەیە کە دایهێناون و ئێستا خۆشی مردووە و لەناوچووە بۆیە ئەم ئاکارانەش نەماون و ئەبێ بسڕێنەوە...

"لە گۆشەیەکی زەویدا شێتی" دەرکەوتووە هەروەك لەنێو خاوەن بەزەییەکاندا هەیە.. چ شتێك ئەوەندەی شێتی خاوەن بەزەییەکان زیانبەخش بووە. جارێکیان شەیتان پێی وتم: ڕەب دۆزەخێکی هەیە ئەویش: ئەو دۆزەخەیە کە بریتییە لە خەڵك خۆش ویستنیەتی. لە دواجاردا گوێی لێ بوو شەیتان وتی:

**"خواوەند برد.. لە بەزەیی خۆی بەولاوە هیچ شتێکی تر نەیبراند!![٣] ".**

ئیتر کەوابێ ئەبێ تێکڕای رابردووی شارستانییەت (بەتایبەتی ئەو لایەنەی نیتشێ بە ئاکاری لاوازانی دائەنێ) فڕێ بدرێ و ئەو شتانەی ئایین داکۆکی لێ کردوون نەك

---

[1] فردریك نیتشة: هكذا تكلم زرادشت، ص٧٢.

[2] فردریك نیتشة: هەمان سەرچاوە.. ل٣١٦.

[3] فردریك نیتشة: هەمان سەرچاوە.. ل٢٦٧، ج٤

هەر فڕێ بدرێن و کاتی خومانی پێوە بەفێرۆ نەدەین چونکە وەك کۆشکێك بناخەکانیان رووخا و دڵی بوونیان لە لێدان کەوت...[1].

بە پێچەوانەی نیتشێ، کارل مارکس وای بۆ ئەچێ کە یاساکانی ئاکار زۆردار و دەسترۆیشتووان دایان ناون بۆ سەرکوتکردنی چینە رەنجدەر و لاوازەکان! کەوابوو مارکس و نیتشێ لەو باوەڕەدان کە مرۆڤ خۆی یاسای ئاکاری داناوە...

دوای باسکردنی چەند رێبازێکی جۆربەجۆری ئاکار ئەگەینە ئەو ئەنجامەی بڵێین فەلسەفەی ئاکار بە تێکڕایی لەم بابەتانە ئەکۆڵێتەوە:

●کێشەی ئەوپەڕیی چاکەکاریی و خێر چییە؟ [2]

●سەرچاوەی پابەندبوونی ئاکاریانە کامەیە؟ ئەبێ بۆچی پێویست بێ لەسەر شانمان هەندێ شت بکەین و خۆمان لە هەندێ کاری تر دوور بخەینەوە؟ بە چ رێگایەك ئەتوانین پابەندبوونی ئاکار بزانین؟ بە ئەقڵ یاخود ویژدان یان بە هەردووکیان پێکەوە، یاخود بەهەستی ئاکارییانە؟.

●چۆن ئەتوانین کاری پەسند لە کاری خراپ و ناپەسند جیا بکەینەوە؟

مەبەستمان لە کردارو رەوشتی پەسند و راست چییە و چ شتێك لە رەوشتی چەوت جیای ئەکاتەوە.

●بەهاکانی ئاکاری خودیین یاخود بابەتین؟ واتە ئەو بەهایانە لە کردارەکاندا هەن یاخود ئادەمیزاد ئەم بەرگ و کاڵایانە یان بە بەردا ئەبڕێ.[3]

---

[1] لەبەر ئەوەی کتێبەکەمان بۆ بابەتێکی تر تەرخان کراوە وامان بەباش زانی هیچ شتێك دەربارەی راستی و چەوتی رێبازەکەی نیتشێ نەڵێین.

[2] بڕوانە: الدکتور امام عبدالفتاح امام: محاضرات في فلسفة الاخلاق، دارالثقافة للطباعة و النشر القاهرة _ ١٩٧٤، ص١٢_ ١٣.

[3] بەپێی رێبازی مەتریالیزمی دیالێکتیك ئاکار بەشێکە لە هۆشیاری کۆمەڵایەتی Social Consciousness، لەبەر ئەوەی ئەم رێبازە بابەتەکانی فەلسەفە تێکەڵ بە کاروباری سیاسی و ئابووری ئەکات بریارمان دا کە لەمە زیاتر باسی نەکەین، بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی فەلسەفە بە گشتی و فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان بەتایبەتی نەچینە دەرەوە.

# ئیستاتیك

ئیستاتیك[1] بریتییە لەمێژوو فەلسەفەی هونەر و دانانی پێودانگێك بۆ جیاكردنەوەی جوانی لە ناشیرینی و بایەخ پێدان و هەڵسەنگاندنی بابەتەكانی هونەر(پەیكەر، نیگار. وێنە، شیعر، مۆسیقا... هتد).

مەسەلەی زەوق و چێژوەرگرتن و ئارەزوو هەستكردن بە جوانیی هەر لە سەرەتای پەیدابوونی شارستانیەتەوە بەشێك بوون لەهەبوونی ئادەمیزاد... بەڵام وەك باس و لێكۆڵینەوە و بابەت ئەوا دیالۆگی "هیپیاس"ی ئەفلاتوون[2]بە كۆنترین لێكۆڵینەوەی جوانناسی ئەژمێردرێ.. ئەفلاتوون لەم بەرهەمەیدا سروشتی هونەر و پەیوەندی بە ئاكارەوە و پەیوەندی هەردووكیان بەنمونەی بەرزەوە باس ئەكات[3]ئینجا كێشەی جوانیی، بە تایبەتی جوانیی و رێكوپێكی سروشت ئەكاتە بەڵگەیەك بۆ ساخكردنەوەی بوونی ئافەریدەكار. یاخود بە شێوەیەكی تر جوانناسی لە چوارچێوەی رێبازی گشتی ئەفلاتووندا ئەسووڕێتەوە... بەلای فەیلەسووف ئیلاهییەوە جوانیش نموونەیەكی بەرزی هەیە، بوونی شتە جوانە تاكەكانیش بەو پێیە دەستنیشان ئەكرێ كە تا چەند لە نموونەی بەرز ئەچن و چەندە لێیەوەنزیكن... ئەگەر لێرەدا یەكێك بپرسێ ... ئەمە چی ئەگەیەنێ؟ لە كاتێكدا ئەفلاتون بە توندی هێرش ئەباتە سەر شاعیر و هونەرمەندان و ئێمەش باسی لایەنی هونەریی لە فەلسەفەكەیدا ئەكەین؟

لە وەڵامدا ئەڵێین... ئەفلاتوون هێرش ئەباتە سەر شیعر و شاعیری بەدكار (خراپ بەلای ئەفلاتوونەوە) و هونەریش بە لاساییكردنەوە دائەنێ وەك خۆشی ئەڵێ: لاساییكردنەوە شێواندنە و ئەسڵی شتەكە راستەقینەترە و هونەرمەند لاسایی شتێكی لاساییكراوە ئەكاتەوە بەرهەمەكەشی لاساییكردنەوەیە... كەوابوو هونەر لە حەقیقەتەوە دوورە. روونكردنەوەی ئەم لایەنانەش وامان لێ ئەكات سەرنجێك لە

---

[1] Aesthetic (جوانناسی، یان فەلسەفەی هونەر).

[2] الموسوعة الفلسفية المختصرة ص٢٠.

[3] ئەفلاتوون دەربارەی ئەم بابەتە دوو بەرهەمی تری هەیە و كراون بە عەرەبی كە ئەمانەن:
افلاطون المأدبة، فلسفة الحب. ت: الدكتور وليم الميري. مكتبة الدرسات الفلسفية ١٩٧٠.
افلاطون: فايدروس او عن الجمال، ت: اميرة حلمي مطر، ط١، دار العارف بمصر القاهرة ١٩٦٩.

تیوری لاساییکردنەوە* بدەین لە ڕێبازەکەی ئەفلاتووندا.. کەوابوو ئەم تیورە چییە؟ لە پێشاندا با سەرنجێك لەم دیالۆگەی ئەفلاتوون بدەین کە لە زمان سوقراتی داناوە ئەیگێڕێتەوە:

**سوقرات**

بەلای ئێمەوە سێ جۆرە کورسی هەیە یەکێکیان لە سروشتدایە وا نییە؟

**گلوکون**

بەڵێ:

**سوقرات**

جۆری دووەمی کورسیش دارتاش دروستی ئەکات.

**گلوکون**

بەڵێ

**سوقرات**

بەڵام جۆری سێیەمیان تابلۆی کورسی یەکەمە کە وێنەکێش وێنە ئەکێشێ... وانییە؟

**گلوکون**

بەڵێ وایە...

**سوقرات**

کەوابوو سێ چەشنە کورسی هەیە و سێ هونەرمەند دروستیان ئەکەن:

خواوەند، دارتاش، وێنەکێش؟

**گلوکون**

ئەمە وایە و ڕاستە...

---

* Imitation لاسایی کردنەوە.

سوقرات

خواوەند تەنیا یەك كورسی ئافەریدە كردووە كە نموونەی بەرزی هەموو كورسییەكانە... هەرگیز دوو كورسی یا پتری ئافەریدە نەكردووە و ئافەریدەی ناكات.

گلوكون

بۆ و لەبەر چی؟

سوقرات

چونكە ئەگەر تەنیا دووانی ئافەریدە بكردایە سێیەمیش دەرئەكەوت و وێنەی هەردووكیان ئەبوو ئەو سێیەمەش بنچینەیی ئەبوو، نەك دووەكانی پێشوو.

گلوكون

ئەمەش راستە.

سوقرات

لەبەر ئەوەی خواوەند ئەمە باش ئەزانێ، و بۆ ئەوەی ویستی خۆی ئافەریدەكاری راستەقینەی كورسی راستەقینە بێت... تاكە كورسییەكی ئافەریدە كرد كە نموونەی بنچینەییە.

دوای ئەمە سوقرات ساخی ئەكاتەوە كە خواوەند ئافەریدەكاری نموونەی بەرزی كورسییە و دارتاش دروست كاری كورسییە. ئەی ئەبێ هونەرمەند كە تابلۆكەی وێنەی كورسییەكەیە چی بێ؟

سوقرات

بە باوەڕی من وێنەكێش و هونەرمەند لاسایی كەرەوەی ئەو شتەن كە دووەكەی تر دروستیان كردووە(١)

[1] افلاطون الجمهورية: ترجمة: الدكتور فؤاد زكريا الهيئة المصرية العامة للكتاب القاهرة _ ١٩٧٤، ص ٥٥١ _ ٥٥٢ فقرة (٥٩٧).

### گلوکون

باشـه کـەوابوو نـاوی لاسـاییکەرەوە بەسـەر دروسـتکاری شـتێکدا ئـەبردرێ کـە پلـەی سـێیەمی هەیـە لەچاو سروشـتی راسـتەقینەی شتەکاندا!؟

### سوقرات

بە تەواوی وایە.

### گلوکون

کەوابوو شاعیری تراژیدیش ئەگرێتەوە چونکە لاسایی کەرەوەیە....

.............................................

### سوقرات

ئێستاکە با لەم کێشەیە بکۆڵینەوە:[1] مەبەستی وێنەکێش دەربارەی هەموو شتێك چییە؟ لاساییکردنەوەی شتێکی راستەقینەیە هەروەك خـۆی هەیـە یـاخود لاسـاییکردنەوەی شـتێکی دیـارە هـەروەك دەرئەکـەوێ؟ ئایـا ئـەو لاسـایی روالـەت ئەکاتـەوە یـاخود لاسـایی راستەقینە ئەکاتەوە؟.

### گلوکون

لاسایی شتێکی دیار و روخسار ئەکاتەوە.

### سوقرات

کـەوابوو هونـەری بەسـتراو بـە لاساییکردنەوە، زۆر لـە راسـتەقینەوە دوورە. خـۆ ئەگـەر دەسـت لـە هـەموو شـتێکەوە بـدات، وەك دەرئەکەوێ، لەوەوە هاتووەکە لە هەموو شتێکەوە لەلایەکی بچووك بـەوەلاوە دەسـت لـە لایەنـەکانی تـر نـادات.. ئـەم لایەنـە بچووکەش

---

1 افلاطون: هەمان سەرچاوە ...ل ٥٥٣ پەرەگراف ٥٩٨.

تارماییـه. بـۆ نموونـه وێنـەکێش ئـەتوانێ وێنـەی پینەچـی یـان دارتـاش یـاخود هـەر وەسـتایەکی ترمـان بـۆ بکێـشێ بـەبێ ئـەوەی شتێك لە پیشەکەیان بزانێت. ئەگەر وێنەکێشێکی شارەزا بێت ئـەوا ئـەتوانێ منـدالْ و ناشـیی هەڵبخەڵـەتێنێ و لـە دوورەوە وێنـەی دارتاشـێکیان نیـشان بـدا... ئـەوانیش بـە دارتاشـی راسـتەقینەی ئەزانن. بەڵام ئەمە تەنیا روخسارە...

..................................

## سوقرات

هەمان شتیش دەربارەی شاعیر، بە وشـەی برقـەدار و رسـتەی تـەڕ و پاراو هونەرەکەی ئەڕازێنێتەوە بەبێ ئەوەی شتێك لە سروشـتی ئـەو هونەرە بزانێ لەوە بەولاوەکە بۆ لاساییکردنەوە پێویستە...

کاریش لەو خەڵکانە ئەکات کە لەو کەمتر ناشـی نین... ئەفسانەی کـێش و مۆسـیقای وشـەکانیش وایـان لـێ ئـەکات بێنـە سـەر ئـەو باوەڕەی کە ئـەو شـاعیرە درەبـارەی سـەرکردایەتیکردنی لـە جەنگـدا یان درەبارەی کەوش دروستکردن یاخود هەر بابەتێکی تـری هونـەر قسەی بەتام و خۆشی بۆ کردوون. ئەگەر قاڵبـە شـیعرییەکەلە شـیعر دابماڵرێ... ئەوا ئەبێ بە پەخشان و ئەوسا ئـەتوانی حەقیقەتەکـەی ببینی.

## گلوکون

بەڵێ راستە...

## سوقرات

ئایا ئەوسا هەر لەو دەم و چاوە ناچێ کـە هـیچ کاتێك جوان نـەبووە بەڵکو گەنج بـووە و لـە دواییـدا تـەڕ و پـاراویی گەنجایـەتی لەدەسـت داوە...[1]

ئەمجارە ئەفلاتوون باسی ئەم کارەنالەبارانە ئەکات کـە شـاعیر و شـیعر ئەیکـەنـە سـەر دەروونـی خـەڵکی و بـۆ رەتکردنـەوەی جۆرێـك لەشـیعر و شـاعیران چـەند بەڵگەیـەك ئەهێنێتەوە... ئەفلاتوون ویستوویەتی بناخەی دەوڵەتێکی نموونـەیی دابنێ... بۆیـە

---

[1] افلاطون: هەمان سەرچاوە ... ل ٥٥٦ پەرەگراف ٦٠١.

ئـــەو کەرەســـەیەی ئەوســـا لەبەردەســـتیدا بـــووە لـــە بۆچـــوونی ئایدیالییـــەوە هەڵیسەنگاندووە... شاعیر لاساییکەروەی تارمایی راستەقینەیە... بوونی لاسایی کار لەکۆمارەکەیدا رەوا نییە!!.
لە فەلسەفەی نوێدا بەتایبەتی دوای سەدەی رێنێسانس، ئەو هونەرانەی جوانییان تیادا بەدی ئەکرێت ئەکرێن بە سێ بەشەوە:
*شیعر و نووسین، جوانییەکانیان بە وشە دەرئەبڕن و لە وشەدا دەرئەکەوێ.
*پەیکەر، نیگار، تابلۆ، وێنە جوانیەکانیان بە وێنە دەرئەبڕن.
*مۆسیقا، جوانییەکەی لە ئاواز و دەنگەکەیداهەستی پێ ئەکرێ[1].
هیگڵی مەزن لە رێبازە دیالێکتیکەکەیەوە ئەڕوانێتە جوانناسی و بە فەلسەفەی هونەری دائەنێ و بە پەرەسەندنی گیانی "رەها"وەی ئەبەستێتەوە. بەلای هیگڵەوە، هونەر و ئایین و فەلسەفە توند و تۆڵ بە یەکەوە بەستراونەتەوە، هەر سێکیشیان، روخساری گیانی رەها.... ئەو گیانەش هەست بە بوونی خۆی ئەکات و لەم سێ بابەتەدا هۆشیار ئەبێتەوە... بەڵام هونەر نزمترین پلەی پەرەسەندنی ئەو گیانەیە چونکە بە شێوەیەکی مەتریالی ئەو گیانە دەرئەبڕێ و بەمەش لە ئایین و فەلسەفە جیا ئەکرێتەوە[2]. بەلای هیگڵی مەزنەوە هونەر بە سێ قۆناخدا تێپەڕیوە، لە یەکەم قۆناخدا مادە بە سەر بیردا زاڵ بووە، ئەمجارە هەردووکیان بەرامبەر هاوکێشە بوون و لە قۆناخی سێیەمدا بیر لە هونەردا بەسەر ماددەدا زاڵ بووە. جا بۆیە سێ جۆرە هونەر لە مێژووی پەرەسەندندا بەدی ئەکرێن:
هونەری رۆژهەلآت کە رەمزییە.
●هونەری کۆنی یۆنان کە کلاسیکییە.
●هونەری مەسیحی کە رۆمانتیکییە[3].
لەلایەکی ترەوە کێشەیەکی گرنگ لە جوانناسیدا هەیە و پێویست بە وردبوونەوە ئەکات. جوانیی وەك خاسییەتێك لە شتە جوانەکەدا هەیە یاخود ئێمە ئەو خاسییەتە بەسەر ئەو شتەدا ئەبڕین؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دوو رێباز دێنە پێشەوە: یەکێکیان خودیی کە ئەڵێ نەخێر ئەم خاسییەتە لەوشتەدانییە بەڵکو ئێمە پێی ئەبەخشین و دووەمیشیان ئەڵێ: بەڵێ ئەو جوانییە لەو شتە جوانەدا هەیە و هیگل وتەنی: ئێمە هەبین و نەبین هەستی پێ بکەین و نەکەین پەڕی تاوس جوانە و گوڵ

---

[1] ئەم قسەیە هی "کانت"ە و لەم کتێبە وەرمان گرتووە: ازفلد کولبة: المدخل الي فلسفة، ص ١١٤.
[2] فرنسوا شاتلیة: هیجل _ ص ١٧٥.
[3] عدد من الفلاسفة السوفییت: الجمال في تفسیره الماركسي، ترجمة، یوسف الحلاق. دمشق. وزراة الثقافة و السیاحة و الارشاد ١٩٦٨ ص ٥١، ٥٢.

دڵگیر و جوانه... بەڵام بە باوەڕی من شتەکە ڕێژەییە و بەپێی هەڵوێستی خەڵکی و دۆخ و کات و شوێن ئەگۆڕێ و هەندێ شت بەلای منەوە جوانە و هەندێکی تر بەلای خەڵکی ترەوە وانییە و... هتد. لێرەدا قسەیەکی تۆلستۆیم بیر ئەکەوێتەوە کە وتوویەتی: گۆرانییەکی جووتیارە رووسێك دە ئەوەندەی سەرکەوتووترین سیمفۆنیی جیهان کارم تێ ئەکات. هەروەها هەندێ نووسەر و رەخنەگری رووس لەم بوارەدا بیروڕای تایبەتی خۆیان دەربارەی جوانناسی هەیە وەك "بلینسکی و چرنشیڤسکی"[1]... بەڵام شوێن دەستی فەلسەفەی فەیلەسووفەکانی رۆژئاوا لە بەرهەمهێناندا بە ئاشکرا دەرئەکەوێ[2].

---

[1] بەپێی ئیستاتیك شیعر سێ مەبەستی هەیە: سوودبەخشین، واتە لێکدانەوەی پەندەکانی ژیان، دووەم چێژ لێوەرگرتن و سێیەم هەردووکیان پێکەوە.. .لە هونەریشدا، هەڵسەنگاندنی شاکاری هونەریی بە دوو قۆناخدا تێ ئەپەڕێ... یەك چێژ لێوەرگرتن لە بەرهەمەکە و دوو: رەخنە لێ گرتنی.

[2] بۆ پتر شارەزا بوون بڕوانە:

م. اوفسیانیکوف. ز. سمیر نوڤا: موجز تاریخ النظریات الجمالیة _ دارالفارابي بیروت ١٩٧٥. ص ٣٢١ _ ٣٢٢.

# ســـۆفیزم

دوور نـاڕۆین ئەگـەر بڵـێین ئـەو خاڵانـەی سۆفیگەریتی لـە فەلسەفە جیـا ئەکاتـەوە دوو ئەوەنـدەی ئـەو شتانەیە کـە لـە یـەکتریان نزیـك ئەکاتـەوە... فەلـسەفە پـەنا ئەباتـە بـەر سەرنجدان و تێفکرین و شیکردنەوە و سۆفیزم جۆرە تاقیکردنەوەیەکی گیانی تایبەتییە و بریتییە لە "زوهد و تەقەشوف و زکر" و پەیوەندی بڕین بە کاروباری دنیاوە و پـەنا بردنە بەر چاوی دڵ و ناخی ناوەوە و دەروونە. بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستدان لە سەدەی هەشتەمی زایین و سێیەمی کۆچییەوە سۆفیگەریتی بڵاوبۆتەوە ناوەکەشی لە چییەوە هاتووە و چۆن بۆ ئەم بەرگەی بە باڵادا بڕاوە، ئەوا بە تەواوی روون نەبۆتەوە.

هەنـدێك ئـەڵێن نـاوی سـۆفیگەریتی لـە وشـەی "سـۆفیزمی" یۆنانییـەوە وەرگـیراوە بەتایبـەتی دوای ئـەوەی فەلسەفەی یۆنـان کـرا بـە عـەرەبی و بـە رۆژهەڵاتـدا بـڵاو بـۆوە.

هەندێکی تر ئەڵێن: وشەی سۆفی لـە "صـفا"وە هـاتووە و ئەگـەر سۆفییەکان دوای ئـەم هـەموو "ریـازە"یـە ئـەم وشـەیە نەیانگرێتـەوە ئـەبێ کـێ بگرێتـەوە. بـە بـاوەڕی مـن راستتریش شت ئەوەیە کە ناوی سۆفی لە وشەی خوری "صوف"ی عەرەبییەوە هـاتووە.. چونکە خوری زبرە و سۆفییەکان وەك جل لەبەریان کردووە و خوریش لە بەرخ و مـەڕ ئەکرێتـەوە و ئەمانـەش هـەموو کـاتێ قۆچـی قوربـانی بـوون و هـەر وەك داستانەکەی ئیبراهیم و قوربانیدانی بە ئیسماعیلی کوڕی و ئینجا سەربڕینی مەڕەکە لە جیاتیانی.

هـەروەها لەو قسەیەشدا دەرئەکەوێ کە وێردی سەر زمانی سۆفییەکانە (الصوفي دمة هـدر و ملکـه مبـاح) واتـە سـۆفی قۆچـی قوربانییـە و خـوێن و سـەروماڵی حەڵاڵـە. نـابێ ئـەوەشمان لـەبیر بچـێ کـە لەبـەرکردنی جلـی زبـری خـوری نیشانەی گـوێ بەخۆنـەدان و پشتکردنە کاروباری دنیا بووە. هەروەك "جنید البغدادی" ئەڵێ:

"الصوفي من لبس الصوف علي صفا و اطعم نفسة طعم الجفا و ترك الدنيا وراء القفا وسلك سبيل المصطفي".

سۆفیگەریتی لە هەر ئایینێکدا و لە هەر سەردەمێکدا بی لە چەند بنچینەیەکەوە هەنگاو ئەهاوێژێ کە بریتین لەمانە:

ئادەمیزاد لە بنجدا بەدکارە و ئـەبێ لە خوا و رۆژی قیامەت و دۆزەخ و مردن بترسێ.. ئـەبێ کۆشـش بکـات بـۆ ئـەوەی ببەخـشرێ و هێـزی "شـەهوانی" لـە ئـادەمیزاددا، سەرچاوەی شەڕ و خراپەیە، شان بە شان لاشە و دنیا و شەیتان. ئەمانـەش هـەر وەك

سۆفییەکان ئەڵێن کۆسپ و تەگەرەن لەسەر ڕێگای سەرفرازیی ئادەمیزاد و پێویستە لەسەر ئەو ئادەمیزادە خۆیانی لێ ڕزگار بکات[1].

دەربارەی هۆی پەدابوون و بڵاوبوونەوەی سۆفیگەریتی لەنێوان موسڵماناندا بیروڕایەکی سەرنجڕاکێش هەیە کە زۆربەی لێکۆڵەرەوانی ئەم بابەتە وەریانگرتووە هەر یەکە بە ئارەزوو بەپێی بۆچوونی خۆی لێکی داوەتەوە... ڕایەکەش هینی پرۆفیسۆر "عباس مهرین" لێکۆڵەرەوەی بەناوبانگی فارسە کە ئەڵێ:

دروستبوونی ئەم سۆفیگەرێتییە هۆیەکی سیاسی هەبووەو بریتی بووە لە بەناڵەباری بەربەرەکانی کردنی دەسەڵاتی ئەو هێزە گەورەیەی بە لێشاو ئێران و وڵاتانی تری داگیر کردووە خستونیەتییە ژێر ڕکێفی ئایینی ئیسلامەوە... مامۆستامان "دکتور کامل مصطفى الشيبي" لەو لێکۆڵینەوەدا کە ماجستێری پێ وەرگرتووە وەك خۆی بەبێ دەستکاری ئەم قسەیەی "پرۆفیسۆر عباس مهرین"ی نووسیوەتەوە ئێمەش هەمان قسە لەو سەرچاوەیەوە وەرئەگرین، بەبێ ئەوەی رای تایبەتی خۆمان لەبارییەوە دەربڕین. پرۆفیسۆر ئەڵێ:

"سۆفیگەرێتی کاتێك لەئێراندا دەرکەوتووە کە دوژمنێکی بەهێز دەستی بەسەر وڵاتماندا گرت. کە ئێرانییەکانیش بۆیان دەرکەوت ناتوانن سەرکێشی بکەن و بەگژیدا بچن ڕێگای بەچۆکا هاتنیان گرتە بەر، بڕوایان بە هێزەکانی غەیب هێناو لە مەیدانی شەڕی مان و نەماندا چەکیان فرێدا... لەبەر ئەوەی سۆفیگەرێتی ئەو کاتە پێویستییەك بوو لە پێویستییەکانی ژیان، بێگومان ئەمڕۆش وەك دوێنێ نییە"[2]

ئەمەش بە باوەڕی مهرین دوای شکانی لەشکری ئێران لە جەنگی "جلولا و نهاوند و حلوان" دەرکەوت کە بە ناچاریی شکاوەکان بوون بە ئیسلام...

لە مەیدانی بەرینی سۆفیگەرێتیدا چەند سۆفییەکی بەناوبانگ بەدی ئەکرێن وەك: "ذوالنون المصري، معروف الكرخي، رابعة العدوية، المحاسبي، البسطامي، جنيد البغدادي، حسين الحلاج و ابوبكر الشبلي، محي الدين العربي، عبدالقادر الگيلاني، شيخ احمد الرفاعي، جلال الدين الرومي، شمس التبريزي، السهروردي، ابن الصلاح الشهروزوري..."[3].

---

[1] ر.ا. نيكلسون: الصوفية في الاسلام، ترجمة نورالدين الشريبة، القاهرة، مكتبة الخانجي ١٩٥١، ص ٤٢ _ ٤٣.

[2] الدكتور كامل مصطفي الشيبي: الصلة بين التصوف و التشيع مكتبه الزهراء بغداد ١٩٦٤.

[3] بۆ پتر شارەزابوون بڕوانە ئەم سەرچاوە بەنرخانە:

_ قاسم غني: تاريخ التصوف في الاسلام ترجمة صادق نشات القاهرة مكتبة النهضة العلمية ١٩٧٠.

_ ابو العلا عفيفي: التصوف الثورة الروحية في الاسلام دار المعارف الاسكندرية ١٩٦٣.

# بەشی سێیەم
# سەرەتایەك لە فەلسەفەی یۆنان

## بابی یەکەم
## قۆناخەکانی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان
## فەلسەفەی پێش سوقرات

## قۆناخی پێش سوقرات

ئەم قۆناخە گرنگە کە سەرەتا و چوزەرەکردنی فەلسەفەیە لە سەدەی شەشەمی پێش زایینەوە بە تالیس دەست پێ ئەکات و لەگەڵ دروستبوونی ڕێبازەکەی سوقرات کۆتایی دێت. لەم قۆناخەدا چەند پرسیارێك کراوە، باسی چەند بابەتێك هاتۆتە گۆڕێ کە لە ئەنجامدا بوون بە بەردی بناخەی دروستبوونی کۆشك و تەلاری لقەکانی بیری ئادەمیزاد هەر لە زانستەوە تاکو ماتماتیك و ئەندازە و سیاسەت و سوسیولۆژی و سایکۆلۆژی و ئابووری و ...هتد.

ئەم قۆناخە کە ڕێخۆشکەری دروستبوونی فەلسەفەی لەمەولای مرۆڤایەتی بوو بەپێی بابەتەکانی ئەکرێت بە دوو بەشەوە:

١. دروستبوونی فەلسەفەی تیۆری.
٢. دروسبوونی فەلسەفەی پراکتیك.

بەشی یەکەمیش لەم ڕێبازانەی خوارەوە پێك هاتووە هەر ڕێبازەش چەند فەیلەسووفێك دایانناوە کە بە گشتی فەلسەفە و بەرهەمەکانیان لە چوارچێیەکی دیاریکراو و بەیەکەوە بەستراودا ئەسوورێتەوە:

- ئا یۆنانییەکان یاخود فەیلەسووفەکانی کۆسۆلۆژیا (تالیس، ئەنێکسمەندەر ئەنیکسیمانس، هیراکلیتس).
- فەلسەفەی ژمارە و سۆفیزم: (فیتاگوراس و ڕێبازەکەی)
- فەلسەفەی ئیلیاییەکان یاخود فەلسەفەی بوون و نەگۆڕان: (ئەگسانۆڤان، پارمەنیدس، زینون).
- فەلسەفەی فیزیك و ئەتۆمیزم: (ئەمپادۆکڵس، دیمۆکریتس، ئەنکساگۆراس).
- بەشی دووەمیش بریتییە لە دروستبوونی فەلسەفەی سۆفستاییەکان کە بە فەلسەفەی ڕێژەیی و ئادەمیزاد ناو ئەبرێ و لەم فەیلەسووفانە پێك هاتووە:

*پرۆتاگۆراس.

*گۆرگیاس.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری ئەم فەیلەسووفانە لە چەند قسەیەك بەولاوە هیچ بەرهەمێکی ڕێکوپێکیان لە پاش بەجێ نەماوە... ئەم چەند قسەیەشیان، ئەفلاتوون و ئەرستۆ و چەند نووسەرێکی تر، لەکاتی دانانی بەردی بناخەی ڕێبازی خۆیاندا بۆیان تۆمار کردوون و لە نەمان دەربازیان کردوون.. هەندێکیش ئەڵێن ئەم فەیلەسووفانە دەستنووسیان هەبووە بەڵام ڕۆژگار فەوتاندوونی.

# تالیس

داناییەکە لە حەوت داناییەکان و لە ساڵی ٦٢٤ی پێش زایین لە شاری مالتیا لە دایك بووە و لە ساڵی ٥٤٦ی پێش زایین کۆچی دوایی کردووە. جگە لەوەی کەیەکەم فەیلەسووفە لە جیهاندا زانا و ئەستێرەناس و ئەندازیار و سیاسی و فەرماندەیەکی جەنگی بووە. ئەگێڕنەوە کە لە یەکخستنی دەوڵەتەکانی یۆنان بۆ بەربەرەکانی کردنی لەشکری ئەوسای فارسەکان دەورێکی کاریگەری گێڕاوە. بۆ گەڕان بەدوای زانین و شارەزابووندا سەری لە میسر داوە و لەوێ چەند بابەتیکی ئەستێرە ناسی و ماتماتیك فێر بووە. لە ساڵی ٥٨٥ی پێش زایین پێشبینی خۆرگیرانی کردووە. وا زانراوە کە میسرییەکانی فێرکردووە چۆن بەرزایی هەرەمەکان بپێون و فێری کردوون کە سێبەری هەر شتێك لە کاتێکی تایبەتی ڕۆژدا ئەوەندەی بەرزایەکەیەتی. لەم چەند قسەیە بەولاوە هیچ تر دەربارەی ژیانی تالیس نازانرێ.

لە مەیدانی فەلسەفەدا لە چەند قسەیە بەولاوە کە ئەرستۆ و ئەفلاتوون بۆیان تۆمار کردووە هیچی تری لە پاش بەجێ نەماوە.. بە باوەڕی شارەزایان لە بواری فەلسەفەدا تالیس باسی دوو کێشەی کردووە...

- هەوێن و بنچینەی هەموو شتێك "ئاوە" هەموو شتێك لە ئاو پەیدا ئەبێت و ئەگەڕێتەوە و ئەبێ بە ئاو.
- زەوی وەك دەورییەکی پان وایە لەسەر ئاو وەستاوە[1].

ئەگەر سەرنج لە یەکەم کێشە بدەین و لێی ورد ببینەوە بۆمان ساخ ئەبێتەوە کە دوای کۆشش و تەقەللای شاعیر و بیروڕا ئەفسانەییەکانیان، بۆ یەکەم جار فەلسەفە لە دەم ئادەمیزادێك دێتە دەرەوە و کێشەی فیزیك و گەردوون ئەخاتە چوارچێوەیەکی تیۆرییەوە.

تالیس هەر لەخۆیەوە ئاو ناکات بە هەوێنی بوونی هەموو شتێك چونکە ئەم قسەیە لەلای بابلییەکان و "تەوراتدا" هەبووە بەڵکو قسەکەی خۆی بە بەڵگە ساخ ئەکاتەوە و ئەڵێ:

هەموو شتێك لەم گەردوونەدا بە شێ و تەڕی، ئەژی و سەرچاوەی ئەم دووانەش ئاوە... لەلایەکی تریشەوە، ئەو قسەیەی فەیلەسووفی مالتیا جۆرە فەلسەفەیەکی پێك

---

[1] Stace: W.T: Acritical history of Greek philosophy. 1962.P 21

ئەهێنێ بریتییە لە دانانی کێشەیەك و وەڵامدانەوەی و چارەسەرکردنی، وەك بپرسێ ئەو راستەقینەیە چییە لە پشت دیاردەکانەوەیە؟ ئەمەش رەسەنی و گیانی فەلسەفییانەی تالیس ساخ ئەکاتەوە. لە بارەی دەروون و نەفسی ئادەمیزادەوە، تالیس لەو باوەڕەدا بووە کە هەموو شتێك پڕە لە خواوەند و نەفس بزوێنەری هەموو شتێکە... هەروەك نەفس لە بەردی موقناتیسدا هەیە و ئاسن رائەکێشێ[1].

ئەرستۆ لە کتێبی "سیاسەت"دا دەربارەی شارەزایی تالیس ئەڵێ[2]: بەو پێیەی تالیس شارەزاییەکی زۆری لە ئەستێرەناسیدا هەبوو هەر لە وەرزی زستاندا زانی کە بەرهەمی زەیتوونیساڵی ئاینده زۆر ئەبێ بۆیە هەرچی دەزگا و ئاشی زەیتوون گرتن هەبوو بە هەرزانی لە خیوس و مالتیا بەکرێی گرتن و کاتێ سەدەمی زەیتوون کردنەوە هات خەڵك دەستە دەستە ئەهاتنە سەر ئەو دەزگا و ئاشی زەیتوون گرتنەوە ئەویش پارەیەکی باشی لێ ئەستاندن... بەم جۆرە تالیس پارەیەکی باشی کۆکردەوە و بۆ خەڵکی ساخ کردەوە کە فەیلەسووف ئەتوانێ بە ئاسانی دەوڵەمەند ببێ ئەگەر بیەوێ..! بەڵام فەیلەسووف ئارەزوویەکی تری هەیە.

لە ئەندازیاریدا، پرۆفیسۆر جۆرج سارتۆن لەو باوەڕەدایە کە تالیس ئەم کێشانەی ئەندازەی زانیوە:

١. تیرە بازنە ئەکات بە دوو بەشی ئەوەندەی یەکترییەوە.

٢. دووگۆشە، لە سێ گۆشەیەکی دووپەل ئەوەندەی یەکتریدا، وەك یەك وان.

٣. ئەگەر دوو هێڵ لەیەکتریان دا ئەوا دوو گۆشە بەرامبەر بە یەکتریەکە ئەوەندەی یەکترین.

٤. ئەو گۆشەیەی لە نیوەی بازنەدا دروست ئەکرێ ٩٠ نمرەیە.

٥. پەلەکانی سێ گۆشە لەیەك چووەکان، جووتن.

٦. دوو سێ گۆشە جووت ئەبن ئەگەر دوو گۆشە پەلێکیان ئەوەندەی یەکتری بوو[3].

---

[1] ارسطو طاليس: النفس ، ترجمة: الدكتور احمد فؤاد الاهواني، ط٢ القاهرة _ مطبعة عيسي البابي الحلبي و شركاه _١٩٦٢،(٤٠٥ ( ٢٠)، ص ١٤.

[2] ئەم قسەیەمان لەو کتێبە وەرگرتووە:

ALLEN, Reginald, E:
Greek philosophy – Thales to Aristotle. New Yourk. 1996.p28

[3] جورج سارتون: تاريخ العلم، ج١، ترجمة ابراهيم بيومي مدكور ولفيف من العلماء القاهرة –

## ئەنێکسمەندەر

قوتابی تالیس بووە لە ساڵی ٦١٠ی پێش زایین لەدایك بووە و لە ساڵی ٥٤٥ و هەندێکی تر ئەڵێن لە ساڵی ٥٤٧ی پێش زایین کۆچی دوایی کردووە... هیچ سەرچاوەیەك باسی نەکردووە کە ئایا ئەنیکسمەندەر ولاتەکەی خۆی بەجێ هێشتووە گەشتی بە ولاتانی تردا کردووە یان نا؟ وا زانراوە کە نەخشەیەکی دنیای دروست کردووە و لە ناوەڕاستەکەی دا جیهانی یۆنانی داناوە و ئەورووپا و ئاسیا دەوریان داوە و ئۆقیانۆسیش سنووری دەرەوەی بووە... هەروەها وا زانراوە کە لە تەمەنی شەست و چوار ساڵیدا کتێبێکی بەناوی "لە سروشت"دا داناوە تێیدا باسی گەردوون و سروشتی کردووە، ئەو بەرهەمە لە ناوچووە... هەندێ سەرچاوە وا باس ئەکە ن کە ئەنیکسمەندەر سەعاتێکی دروست کردووە و بە یۆنانی "کنومون"ی پێ وتراوە و بریتیی بووە لە دارێك کە لە پارچە زەوییەکی پاندا چەقێندراوە و توانیویانە بە ئاسانی سووڕانەوەی سێبەری خۆر هەر لە دەرکەوتنییەوە تاوەکو ئاوابوونی پێ ببینن. شارەزایانی زانستی کۆن ئەڵێن ئەستێرەناسان توانیویانە بەهۆی ئەو کنومونەوە درێژایی رۆژ و ساڵ و هەر چوار لایەکە (باشوور، باکوور، رۆژهەلات، رۆژئاوا) و نیوەڕۆ و درێژی کەژەکان بزانن.

لە چارەسەرکردنی کێشەی سروشتدا، بەلای دووەم فەیلەسووف ماڵتیاوە ئاو هەوێن و بنچینەی بوون نییە چونکە ناگونجێ هەوێنی ئەم هەموو شتە جۆربەجۆرانەی کە هەن سەرچاوەیەکی دیاریکراو بێ... لێرەوە ئەنێکسمەندەر "لەگەڵ تالیس لەو بڕوایەدایە کە هەوێنەکە ماددەیە بەلام ئەم هەوێنە دیاری نەکراو و بێسنوور و بێڕوخسارە ئەگونجێ ئاسن، ئاو، هەوا یاخود شتێکی تر بێت"[1] ئەو وشەیەش بە یۆنانی "ئەپیرۆن"ی[2] پێ ئەوترێ، ئەو ئەپیرۆنە لە چەندوچۆندا دیاری نەکراوە و هەر هەبووە و هەر ئەمێنێ و هەتا هەتایە بە نەمریی ئەمێنێتەوە. هەموو شتێك لەم ئەپیرۆنەوە دروست ئەبێت و ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە... بەلام ئەم شتانە چۆن و بۆ لەم سەرچاوەیە و دروست ئەبن؟ بەلای ئەنێکسمەندەرەوە ئەپیرۆن لە کۆمەڵە شتێکی دژ بە یەکتر پێك هاتووە وەك گەرمیی، سارد، وشك، تەڕ[3]. لە کاتێکی

---

[1] Stace: Ibidl. P 24 _25

[2] Apeiron.

[3] الدكتور جعفر ياسين: فلاسفة يونانيون من طاليس الى سقراط، ط٢ منشورات عويدات _ بيروت ١٩٧٥، ص ٢٥.

تایبەتیدا ئەم چوار شتە بەرادەیەکی ئەوەندەی یەکتری هەبوون و ئنجا لە یەکتری جیابوونەوە و جیابوونەوەکە ئەم شێوەیە وەرگرتووە:

وشکانی لە هەموویان قورسترە کەوتۆتە مەڵبەند[1] و ئاو دەوری داوە و تەم و مژیش لەسەر ئاوەوە بووە و ئاگریش بە چواردەوری هەموویاندا هاتووە. ئاوەکە بەهۆی ئاگرەوە گەرم بووە و بووە بە هەڵم ئەمەش بۆتە هۆی دەرکەوتنی وشکانی.. بەڵام ئەمانە هەمووی بوونەتە هۆی پتر بوونی قەوارەی وشکانی وە پاڵەپەستۆش زیاتر بووە تا ئەو رادەیەی تەقیوە. ئەوە بوو کیفی ئاگرینی گەردوون تەقیوە و بەشێوەی چەرخی ئاگرین بڵاوبۆتەوە کە لەناو بۆری تەم و مژدا بووە و دەوری زەوی و دەریایان داوە...

ئەو ئەستێرانەش کە لە ئاسماندا ئەیانبینین کونی ئەو بۆریانەن کە ئەو ئاگرە تێیاندا کلپە ئەکات... رۆژگیرانیش داخرانی ئەم کونانەیە.

دەربارەی پەیدابوونی ژیان خاوەنی ئەپیرۆن ئەڵێ:[2]

لە سەرەتا گیانلەبەر وەك ماسی و بگرە ماسی بووە و لە ئاودا ژیاوە، لەشی بە توێکڵ و پوولەکە داپۆشراوە، دوای ئەوەی ئاوەکە نەماوە و کەوتۆتە سەر زەوی و وشکانی توێکڵەکەی فڕی داوە و لەگەڵ دۆخە تازەکەدا گونجاوە و راهاتووە.

هەر چۆنێك بێ، ئەم بیروڕایانە کە ئەنیسکمەندەر دەربارەی بوون و گەردوون و ژیان خستوونیەتە روو زۆر لە قسەکانی تالیس گرنگترن و ئەگەر بۆمان بلوێ ئەڵێین ئەم فەیلەسووفە بە دانانی سەرەتای بیروڕای زانستیانە هەنگاوێکی دلێرانەی هاویشتووە و یەکەم فەیلەسووفی پەرەسەندە، زۆر لە پێش داروین و لامارکەوە باسی پەرەسەندنی کردووە کە چۆن ئادەمیزاد لە سەرەتاوە ماسی بووە ئینجا وردە وردە لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا راهاتووە و گونجاوە و روخساری لەشیشی گۆڕاوە...

لەمەش پتر ئەنیکسمەندەر دلێرانە چۆتە مەیدانی فراوانی داهێنانی واتا و چەمکی رووت کە ئەویش بریتییە لە زاراوەی ئەپیرۆن کە نەدیار و بێسنوور دەستنیشان نەکراوە و سەرچاوە و هەوێنی بوونی ئەو شتە دیاریکراوانەیە کە هەن.

---

[1] بنیامین فارنتن: العلم الاغریفي، ج١، ترجمة: احمد شکري سالم مکتبة النهضة المصریة القاهرة – ١٩٥٨، ص ٤٤

[2] جورج سارتون تاریخ العلم، ج١، ترجمة ابراهیم بیومي ولفیف من العلماء، القاهرة، دارالمعارف ١٩٦٣، ص ٣٧٢.

# ئەنێکسیمانس

سـێیەم فەیلەسـووفی مالتیایـە و قوتـابی ئەنیکـسمەندەرە... شـتێکی ئـەوتۆ لـە ژیـانی نـازانریٚ لـەوە پـتر کـە لـەنێوان سـالأنی ٥٨٨ _ ٥٢٤ی پـێش زایـین ژیـاوە... کتێبێکـی بەپەخشان نووسیوەتەوە، بەلأم فەوتاوە و لـە چەند قسەیەك بەولاوە هیـچی تـری لـیٚ نەماوەتەوە. لە کێشەی هـەوێنی بووندا گەڕاوەتـەوە سـەر ڕێڕەوی تـالیس و لـەوباوەڕەدا بووەکە سەرچاوەی بوونی شت بـیٚ کۆتاییە، بـەلأم ئـەبیٚ چۆنیەتێکەی دیـاریکراو بـیٚ... جا بۆیە:

"بابەتی سەرەتایی هەوایە"[1] واتە هەوێنی بوونی هەموو شتێك هەوایە ئەم هەوایەش بە چەند چەشـنێك ئـەگۆڕدریٚ. کـە هـۆی ئـەم گۆڕانەشـی خەسـت بـوون و سـووکبوونە و لـە ئەنجامی ئەمەوە هەموو شتێك دروست ئەبێت. کاتێك هەوا سووك ئەبێت ئەبیٚ بە ئاگر و کە خەست بوو ئاوی لیٚ دروست ئەبێت و ئاوەکەش گلٚ و بەرد هەلٚئـەهێنیٚ... زەوی وەك سـفرەیەك وایـە و هـەوا دەوری هـەموو شـتێکی داوە. بۆچـی ئـەم فەیلەسـووفە هـەوای هەلٚبژاردووە و کردوویەتی بە سەرچاوەی بوون؟ بە باوەڕی شـارەزایان هەلٚبـژاردنی ئـەو کەرەسەیە پەیوەندی بە بـەردەوامی و هەمیـشەیی ژیانـەوە هەیە بە هـزری ئەنکسیمانس گیانمان لە هەوا دروست بووە و یەکێتی و یەکپارچەیی و بوونمان ئـەپارێزیٚ... هـەواش دەوری جیهـان و گـەردوونی داوە و وا دەرئەکـەویٚ جێهـانیش وەك ئـادەمیزاد هەناسـە بدات. جگە لەمـەش سەرچاوەی ژیـانی ئـادەمیزاد هەناسـەیە و جیاوازی نێوان مـردوو و زیندوو ئەوەیە یەکەمیان هەناسـە نـادات و دووەمیـان هەناسـە ئـەدات. سـەرەڕای ئەمـەش گەردوون و خۆر و مانگ و خواوەندەکانیش هەر لە هەوا دروست بوون.

ئەنکـسیمانس بـەو هەلٚوێـستەی فەلـسەفەیەك دەرئـەبڕیٚ کـە بریتییـە لـە یەکایـەتی و یــەکڕەنگیی مــاددی سروشــت و ئــەویش هەوایــە و هــەموو دیــاردە و گۆڕانــەکانی سروشتیش بە خەست و بوونەوە و سووکبوونی ئەو ماددەیە لێك ئەداتەوە[2].

بێگومان ئەم هەلٚوێستە شایانی لـیٚ وردبوونەوەیـە چونکە بە ئاشـکرا خاوەنەکـەی هـاوار ئـەکات کـە جیـاوازی چـەندیی هـۆی جیـاوازی چـۆنییە و "ئەمـەش یەکـەم هـەنگاوی پەرەسەندنی زانستییە کە لای دیمۆکریتس بوو بە فەلسەفەی ئەتۆمیزم"[3].

---

1 Zeller. E: Ibid. p 30

2 جۆرج سارتون: تاريخ العلم، ص ٣٧٤، ج١.

3 الدكتور كريم متى: الفلسفة اليونانية، بغداد مطبعة الارشاد ١٩٧١، ص ٣٨.

# ئەنجام

ئەگەر بە وردی لە فەلسەفەی رابەرانی ئەم رێبازە وردبینەوە چەند خاڵێکی گرنگمان بۆ ساخ ئەبێتەوە کە بوونەتە هۆی ئەوەی ئادەمیزاد بە درێژایی مێژوو دەستی رێزلێنان بۆ ئەم دانایانە بەسینگەوە بگرێ.

لەپێش هەموو شتێکدا تالیس کە بەردی بناخەی فەلسەفەی داناوە شتی راستی وتووە کە هەرگیزاو هەرگیز لە مێژووی بیری ئادەمیزاددا وەك گەوهەر ئەدرەوشێنەوە:

- باسی ئەسڵ و بنچینەی شتی کردووە.
- باسکردنی ئەم بنچینەیەش بە شێوەیەك بووە لە ئەفسانەوە دوور بێ.
- وتوویەتی سەرچاوەی هەموو شتێك یەك شتە[1].

بەم پێیە لە شارەکانی یۆناندا بیر سەربەست بوو، بە سەربەستی هەموو کەسێك توانیویەتی لە هەموو ئەو شتانە بکۆڵێتەوە کە لە ئاسمان و زەویدا هەبوون. بەهۆی تێکەڵاوبوون و هاموشۆ و کارتێکردنیان لەگەڵ گەلانی رۆژهەڵاتدا بایەخیان بە زانستی سروشت (فیزیك) داوە[2].

ئەگەر بە وردتر فەلسەفەی ئەم رێبازە هەڵبسەنگێنین ئەتوانین بەبێ سڵکردنەوە بڵێین ئەم خاڵە تایبەتییانەی خوارەوەی تێدا بووە.

- فەیلەسووفەکان هەوڵی زانینی هۆی یەکەمیان داوە نەك هۆی نزیك ئەمەش خاڵێکە لە خاڵەکانی فەلسەفە.
- سەرنجدان و تێفکرینەکانیان سەرتاپاگیر (شامل) بوون.
- هەوڵیان داوە دیاردە زۆر و فرەرەنگییە بگێڕنەوە سەریەك دیاردە ئەمەش تایبەتیەتێکی تری فەلسەفەیە[3].

---

[1] عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني، ط٤، القاهرة، مكتبة النهضة المصرية ١٩٦٩، ص ٩٥.

[2] ارنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، ج١، ترجمة: لويس اسكندر القاهرة _ سلسلة الالف كتاب ١٩٦٦، ص ٩٣.

[3] الدكتور احمد فؤاد الاهواني: معاني الفلسفة، مطبعة عيسي البابي الحلبي القاهرة _ ١٩٤٧، ص١٢.

- هەر لەبەر ئەوەش بوو کە هەوڵیان داوە گەردوون بە گشتی لێك بدەنەوە، نەك بپرسن هۆی ئەم دیاردەیە چییە، یان بۆچی باران ئەبارێ بەڵکو هەوڵی زانینی هەموو گەردوونیان داوە.

- تیۆرییەکانی ئەم فەیلەسووفانە، سروشتی تاکەکەسیان پێوە دیارە، ئەم خاسییەتەش فەلسەفە لە هونەر پتر و ئنجا لە زانست نزیك ئەکاتەوە.

- ئەم فەیلەسووفانە پشتیان بە کەلەپوور و سامانی نەتەوەیی و ئایین و ئەفسانە نەبەستووە... بەڵکو ئەگەر قسەیەکیان کردبێ هەوڵیان داوە بە ساخکردنەوە و بەڵگە راستی قسە و تیوۆرەکەیان بسەلمێنن... ئەم سەربەخۆبوونی بیرە لە هەموو دەسەڵات و سەرچاوەیەك، جگە لە دەسەڵاتی ئەقڵ و لۆژیك خاڵێکە لە خاڵە گرنگەکانی بیری فەلسەفە و زانستی.

- لەلای ئەو فەیلەسووفانە شێوازی رەخنە و رەخنەگری[1] لە بیرکردنەوەیاندا دەرئەکەوێ... بۆ نموونە ئەنێکسمەندەر بەڕای تالیسی مامۆستای قایل نەبووە و رایەکی تری داوەتە دەست و ئەو لێکدانەوەیەی ئەو هێناویەتی لە هینی مامۆستاکەی رێکوپێکتر و پێشکەوتووتر بووە.

---

[1] بڕوانە:

_ الدكتور امام عبد الفتاح امام: مدخل الى الفلسفة، ص ٤١ – ٤٢.

_ ازفلد كولبة: مدخل الى الفلسفة، ت: الوالعلاء فيفي، ص١٤ –١٥.

# هیراکلیتس

لە شاری ئەفسوس لەدایك بووە لە نێوان سالأنی ٥٤٠ _ ٤٧٥ی پێش زایین ژیاوە، رۆڵەی خێزانێکی خواپێدا و و ئوروستوکرات بووە، سامان و داراییەکی زۆری بە میرات بۆ بەجێماوە و ئەو سامانەی لە پێناو پشکنین و بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەدا خەرج کرووە... وا زانراوە نیشتمانی خۆی خۆش ویستووە و قینی لە چینی رەنجەدەر و هەژار و سادە بووە و بەگاڵتە پێکردنەوە سەیری بڕوا و زانین و ئاینەکەیانی کردووە... کتێبێکی درەبارەی سروشت داناوە و ناوەرۆکەکەی بریتییە لە فەلسەفە و سیاسەت و ئاکار و تیولوجی لەبەر ئالۆزی و قورسی کتێبەکەی بە فەیلەسووفی تەمومژاوی و تاریك ناوبراوە، لەو کتێبە تەنیا (١٣٠) رستەی جۆربەجۆر ماوەتەوە کە ئەتوانرێ چواچێوە گشتییەکەی فەلسەفەی خاوەنی پێوە دیاری بکرێت...

پیش ئەوەی باسی رێباز و فەلسەفەی هیراکلیتس بکەین وای بە باش ئەزانم کەدوو شوێنی ئەو فەیلەسووفە بیروڕا دەربارەی قورسیی کتێبەکە هەیە بیانخەمە پێش چاو هەردوو رایەکەشی بایەخ و لە مێژووی بیردا ساخ ئەکەنەوە.

*هەندێك ئەڵێن قوریسی ناوەرۆکی ئەم کتێبە لەبەر بیرقووڵی و سەرنج تیژیی و لێکۆڵینەوەی وردی ئەو فەیلەسووفە بووە کە بەرهەمی فەیلەسووفەکانی تری سەردەمی خۆی بەدڵ نەبووە و هەوڵی گۆشەگیری و دوورەپەرێزی داوەو رەنگی رێرەوێکی سەربەخۆی بۆ خۆی رشتووە و پەیرەوی کردووە.... ئەم رێرەوەش بریتی بووە لە "کورت و پوخت و پەندهێنانەوە" ئەم کورتییەش نهێنی ئەم تەمومژو قورسییەیەتی.

*هەندێ شارەزا و مێژوونووسی تر ئەڵێن هیراکلیتس شێوازێکی کاریگەر و گرنگی فەلسەفەی داهێناوە و ناوەرۆکەکەی قووڵ و پڕ مانا و بەپیت و پێز بووە، لەبەر ئەوەی زۆربەی فەوتاوە وا هەست ئەکرێ ئەوەی ماوەتەوە تەم و مژاوی و قورسە[1].

هیراکلیتس فەیلەسووفێکە لە فەیلەسووفە پایەبەرزەکانی یۆنان و لە مەیدانی فەلسەفە و سیاسەت و ئاکار و تیۆری زانیندا دەورێکی گەورەی گێڕاوە ئەوەندەش بەسە بڵێین کە بەرابەر و داهێنەری دیالێکتیك دائەنرێ و لەم کۆڕە بەرینەدا جێگای خۆی بە ئاشکرا دیارە و لە بەرچاوە. فەلسەفەی هیراکلیتس لە بنچینەیەکەوە سەر هەڵئەدات، کە گۆڕانی نەپساوە و هەمیشەیی و بەردەوامە:

- یاسای گۆڕان پوختە و گەوهەری هەموو شتێکە.

---

[1] الدکتور جعفر الیاسین: فلاسفة یونانیون من طالیس الی سقراط ص ٥٣.

- هەموو شتێك ئەگۆڕێ تەنیا یاسای گۆڕان خۆی نەبێ.
- هەموو شتێك لە گۆڕانی بەردەوام دایە[1].

ئەو گۆڕانە لە دوو شێوەدا خۆی ئەنوێنێ كە توندوتۆڵ بە یەكترییەوە نووساون و لە یەكتری جیا نابنەوە:

یەكەم: هەڵگیرسانی ئاگر....

دووەم رانەوەستانی ئاو.... كە ئەم دووانەش بەم جۆرەی خوارەوە لێك ئەدرێنەوە: ئاگر ئەو سەرچاوەیەیە كە هەموو شتێكی لێوە دروست بووە و نموونەی راست و رەوانی گۆڕانی تیادا بەدی ئەكرێ... گۆڕان هەموو شتێكە و بەبێ گۆڕان هیچ شتێك نەئەبوو.. ئەو گۆڕانەش كە لە ئاگر دایە بریتییە لە یەكگرتن و جیابوونەوەی دژەكان... ئەمەش دوو رێگا ئەگرێتە بەر:

"رێگای بەرەو سەر و رێگای بەرەو خوار[2]". ئەم دوو رێگایە یەكن و "ئاگر بە مردنی زەوی ئەژیا و هەوا بەمردنی ئاگر و ئاو بەمردنی هەوا ئەژیا و زەوی بە مردنی ئاو ئەژیا[3]" و "نەمرەكان ئەمرن و ئەوانەی ئەمرن بە نەمەریی ئەمێننەوە و یەكێكیان بە مردنی ئەوی تریان ئەژیا و ئەمرێ ئەگەر ئەوی تریان بژیا[4]" "شتی سارد گەرم ئەبێ و گەرم سارد ئەبێ و شێدار وشك ئەبێتەوە و وشكیش تەڕ و شێدار ئەبێت[5]" گۆڕان زۆر پێویست ئەبێ بزانین كە " جەنگ خولیای هەموو شتێكە و كێشە و شەڕیش دادپەروەرییە، هەمووش شتێك بە شەڕ و ململانێ دروست ئەبێ و لەناو ئەچێ[6]". هەموو شتێكیش لە چەند شتێكی دژ بە یەكتری پێكهاتووە و "ئەوەی تیاماندایە یەك شتە: ژیان و مردن، نووستن و بەخەبەرهاتن، گەورە و بچووك، یەكەم ئەگۆڕێ و ئەبێ بە دوا شت و دوا شتیش ئەبێ بە یەكەم[7]".

هیراكلیتس بەوەی تیۆری گرژبوونی كردووە بە رێگایەك بۆ لێكدانەوەی نیمچە نەگۆڕانی شت و گۆڕانە جەوهەری و كاكڵییەكان، لەكۆڕی زانستدا هەنگاوێكی دلێرانەی هاویشتووە بە باوەڕی فەیلەسووف ئەفسووس لە هەموو شتێكدا دوو هێز هەیە:

*هێزێكیان بەرەو سەر، بەرەو ئاگر كێشی ئەكات.

*هێزی دووەم بە پێچەوانەوە بەرو ژێرەوە، بەرو وشكانی ئەیبات.

---

1 Zeller: Ibid. p46
2 Burnet: Ibid. para 69
3 Burnet: Ibid. para 25
4 Burnet: Ibid. para 67
5 Burnet: Ibid. para 39
6 Burnet: Ibid. para 62
7 Burnet: Ibid. para 78

بوونی مادده لە هەر بارێك لە بارەکانیدا ئەنجانی لەنگەرگرتنی ئەو دوو هێزە دژبە یەکترییە ئەنجامی گرژبوونە. ئەگەر شتێك لە روخساردا بە نەگۆڕاو دیار بێ ئەوا لە کاکڵە و پوختە و جەوهەرەکەیدا زۆرانبازییەك لەنێوان دوو هێزە دژ بە یەکترییەکەدا هەیە[1].

دووەم رێگای گۆڕان دوای ئاگر، بریتییە لە رانەوەستانی ئاو... "تۆ ناتوانی دوو جار لە ئاوی رووبارێکدا مەلە بکەی.. چونکە دووەم جار بە ئاوی نوێ تر تەڕ ئەبێت[2]".

کەوابوو گۆڕان وەك یاسایەك شاو باوکی هەموو شتێکە و هەموو شتێك ئەگرێتەوە و هیچ شتێك هیچ ساتێك لەسەر یەك شێوە نامێنێ. ئەگەر ئەمە هەڵوێستی گشتی هیراکلیتس بێ، ئەبێ چۆن لەم ئاستەوە بڕوانێتە گەردوون و خواو چۆن ئەم یاسایەیان بەسەردا پیادە بکات؟ بێگومان گەردوون و خوا لەم یاسایە دەرباز نابن و هەمان شت ئەیانگرێتەوە و لێرەدا ئەگاتە ئەو ئەنجامە پوختەکەی کە ئەڵێ:

"ئەم جیهانە سەبارەت بە هەمووان یەکە، نە خواوەند و نە ئادەمیزاد ئافەریدەیان نەکردووە، هە رهەبووە و هەیە هەر ئەمێنێ، ئەویش ئاگرێکە بە پێودانگێك ئەسووتێ و کپ و خەفە ئەبێتەوە[3]" و "خواوەند شەو و رۆژە، زستان و هاوینە، شەڕ و ئاشتییە، تێریی و برسێتییە، بەڵام وەك ئاگر چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر وەرئەگرێ[4]".

دەربارەی تیۆری زانین، واتە ئەو رێگایانە کامانەن کە ئێمە بەهۆیانەوە شت ئەزانین... هیراکلیتس هێرش ئەباتە سەر هەستەکان و داوای دوورخستنەوەیان ئەکات چونکە ئەو شتانەی بەهۆی هەستەکانەوە ئەیانزانین گومانیان لێ ئەکرێت و ئەبێ تەنیا پشت بە ئەقڵ ببەسترێ و پەیڕەوی بکرێت:

"چاو و گوێ شاهیدی چەوتی ئادەمیزادن...[5]".

هیراکلیتس لە ئاکاردا داوای ئازادی ئەکات بەو مەرجەی ئادەمیزاد لە رەفتار و کرداریدا پەیڕەوی ژیر بکات و بەدوای خەڵکی سادەو رەش و رووت نەکەوێ: "ئەگەر خەڵك بە ئەقڵ و ژیر هاتنە قسە ئەوا ئەبێ دەست بە دامێنی ئەو شتەوە بگرن کە لەنێو هەمووااندا هاوبەشە، هەروەك دەوڵەت پەیڕەوی قانوون ئەکات... بگرە ئەبێ ئەوان پتر پەیڕەوی بکەن، چونکە هەموو یاساکانی ئادەمیزاد لەیەك یاسای

---

[1] بنيامين فارنتن: العلم الاغريقي، ص ٤٧، ج١.

[2] Burnet: Ibid. para 41 - 42

[3] هەمان سەرچاوە: ب ٢٠، ل١٣٤.

[4] هەمان سەرچاوە: ب٣٦، ل ١٣٦.

[5] هەمان سەرچاوە: ب٤، ل١٣٣.

خواوەنـدەوە هـاتوون و ئـەو یاسـایەش خـۆی حـوکم ئـەکات و هـەموو شـتێك ئەگرێتـەوە[1]". "رادە دانـان بـۆ دەسـتبلاوی زۆر لـە كوژاندنـەوەی مـاڵێكی ئـاگر تێبەربوو پێویستترە[2]". "چارەنووسی ئادەمیزاد بە ئاكارییەوە بەستراوەتەوە[3]". "تاكە كەسێكی باش لـە دە هـەزار كـەس باشترە"[4] ... هیچ گومـان لـەوەدا نیـە كـە هیراكلیتس رێگا و شێوازێكی نوێی گرتۆتە بەر و لەو باوەڕەدا بووە كە گەوهەرێك لـە پشت دیاردە جۆرەبەجۆرەكانی شتەوە هەیـە، ئەو دیاردەیـە ئاگرە.. هـەموو شتێك بـەرەو سـەر یـاخود بـەرەو خـوار ئەچـێ، ئـاگریش خـۆی كلّپـە ئـەكات و خەفـە ئەبێتەوە.... ئەمەش بەڵگەی گۆڕانی هەمیشەییە... جیاوازیی و ناكۆكی نێوان ئەو شتانەی دەرئەكەون نیشانەی گونجان و تەبایی و یەكەتین. هـەموو شتێك دژی خۆی تیادایـە و هـەموو بوونێـك نـەبوونی تیادایـە... ئـەم دژانـە لـە سیـستەمی گـشتی سروشتدا یەك ئەگرن.

هیراكلیتس لە باری سیاسییەوە نیشتمانی خۆی خۆشویستووە، بەڵام لـووتبەرز و بەفیز بووەو خۆی بە خانەدان داوەتە قەڵەم. وا زانراوە كە "دارا"ی شای فارسـەكان داوای لێ كردووە كـە سـەری لـێ بدات و هەندێ لایـەنی كتێبەكەی بۆ لێك بداتـەوە، بەڵام هیراكلیتس ئەم داواكارییەی قبوولْ نەكردووە و سەری لە فارس نەداوە[5].

بەلای دانانی ئەفسووسەوە پاراستنی یاسا ئەركی سەرشانی هەموو كەسێكە:

"پێویستە خەڵك لە پێناو یاساكەیاندا. بجەنگن هـەروەك چۆن داكۆكی لـە شـوورەی شارەكەیان ئەكەن"[6].

بەلای هیراكلیتسەوە نەفسیش وەك ماددە پێكهاتووە و دروست بووە، كێشە و بـەرەو خـەباتێكی بێوچـان لـەنێوان ئـاگر و ئـاودا هەیـە، ئـاگر سەرچـاوەی ژیانـە و ئـاویش سەرچاوەی مردنـە. نیـزاعیش هـەموو شتێك یـەك ئـەخات... بەڵام ئەركی سەرشانی ئـادەمیزاد و جیهـان – كـە هـەردووكیان شـەیدای داد و راسـتین –ئەوەیـە دەسـت بـە دامێنی ئـاگرەوە بگـرن.... یاسـای مرۆڤایـەتیش بـە یاسـای سروشـتیی جیهـان لێـك ئەدرێتەوە[7]...

---

1 ب٩١، ل١٣٩.

2 ب ١٠٣، ل ١٤٠.

3 ب ١٢١، ل ١٤١

4 ب ١١٣، ل ١٤٠

5 جورج سارتون: تاريخ العلم، ج ٢.

6 Burnet: Ibid. para 100.

7 ارنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، ص ١٠٢ _ ١٠٣، ج ١.

هیراکلیـتس فەیلەسـووفێکی سەرنجراکێـشە و شـارەزایان بـە چـەند جۆرێـك هـەڵیان سـەنگاندووە ... لـە پێـشدا بـە بـاوەڕی هیگڵـی مـەزن، هـەر چـییەك هیراکلیـتس وتوویەتی، هیگل خستوویەتیە لۆژیکەکەیەوە.. " فەلسەفەی هیراکلیتس هـیچ کاتێك بەسەر ناچێ ... گۆڕان کە ئەو باسی کردووە پێشکەوتنێکی زۆر گەورەیـە و بـوون و نەبوون بەبێ گۆڕان نین".[1] هەروەها هیراکلیتس لەلای مارکسیستەکان پڕ بە پێستی خۆی بایەخی پێدراوە و لینین کە باسـی فەلـسەفەکەی ئەکات ئەڵێ: "ئای چەند بـە باشی باسی بنچینەی دیالێکتیکی مەتریالیزمی کردووە[2]".

[1] ئەم قسەیەی هیگل لەم کتێبە وەرگیراوە:

امام عبدالفتاح امام: المنهج الجدلي عند هيجل،دارالمعارف بمصر ١٩٦٩، ص ٥٨.

[2] Khiyabich; I: An Out Line history of philosophy. P.10

# فیتاگۆراس و ڕێبازەکەی

فیتاگۆراس رابەر و دامەزرێنەری ڕێبازێکی ئایینی و سیاسی و سۆفیگەرێتی و کۆمەڵایەتی و ئاکار و زانستە، ئەو ڕێبازەش بە ناوی خۆیەوە "فیتاگوریزم" ناوئەبرێ... فیتاگۆراس لە ساڵی ٥٧٢ی پێش زایینددا لە دۆخێکی سەیر و ئاڵۆزدا کۆچی دوایی کردووە. وا زانراوە کە فیتاگۆراس لە سەردەمی لاوێتیدا لە ترسی حوکمی دیکتاتۆری (پولیکراتیس) و هێرشی بەردوامی فارسەکان بۆ سەر شارەکەی رای کردووە و بەرەو میسر کەوتۆتە ڕێ، نزیکەی دوانزە ساڵی تیادا ماوەتەوە و لەوێ ئەستێرەناسی و ئەندازەی خوێندووە. کاتێکی "قەمبیز" ساڵی ٥٢٥ی پێش زایین میسری داگیر کردووە لەگەڵیا هاتووە بۆ بابل و دە دوانزە ساڵیش لەوێدا ماوەتەوە و حیساب (ژمێرە) و مۆسیقا و ئایینی مەجوسییەکانی تیادا خوێندووە... لەدوای گەشتێکی زۆر کە تەمەنی گەیشتۆتە شەشت و پێنج ساڵ لە کریت کە ئەوسا وڵاتی یۆنانی مەزن، ئێستا خوارووی ئیتاڵیای پێ ئەڵێن، جێگیر بووە، قوتابخانە بەناوبانگەکەی تیادا کردۆتەوە و خەڵك ڕوویان تێکردووە و چوونەتە ناو قوتابخانەکەیەوە.. لەو قوتابخانەیەدا ئافرەت و پیاو وەرگیراون و جۆرە ڕەوشت و ڕەفتاری تایبەتی هەبووە ئەبوو بە وردی پەیڕەویان بکردبایە.. فیتاگۆرس خۆی زۆر بە زل زانیوە وتوویەتی: "ئادەمیزاد و خواوەند هەن لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا گیانلەبەری تر هەیە وەك فتیاگۆرس". هەر بەم پێیە خەڵکی کردووە بە سێ بەشەوە... ئادەمیزاد وەك ئەو خەڵکە وان کە ئەچن بۆ یاری ئۆلەمپیك و ئەکرێن بە سێ بەشەوە:

*هەندێکیان بۆ یاریکردن ئەچن.

*هەندێکیان بۆ بازرگانی.

*هەندێکی تریان تەنیا بۆ سەرنجدان و تەماشاکردن ئەچن ئەمانە دانا و فەیلەسووفن.

بەلای ئەم ڕێبازەوە ئادەمیزاد لە بنچینەدا شەڕو بەدکار و خراپە و ئەبێ هەوڵ بدات خۆی ڕزگار بکات بۆ ئەمەش ڕێگایەك هەیە ئەبێت بیگرێتە بەر، هەر لە نوێژەنکردنەوە تاوەکو قسەکردن و خواردن و ڕەفتار و جلوبەرگ لەبەر کردن.

هەر کەسێك بیەوێ بچێتە ناو ئەو ڕێبازەوە ئەبێ پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

- نابێ پاقلە بخوات.
- ئەگەر شتێك کەوت نابێ هەڵیگرێتەوە.
- دەست لە کەڵەشێری سپی نەدات.

- نان نەشکێنێ.
- بەسەر دیوار و شوورەدا باز نەدات.
- ئاسن لە ئاگر وەرنەدات.
- لە نانی ساخ نەخوات.
- لەسەر تەرازوو دانەنیشێ.
- دڵ نەخوات.
- بەسەر ڕێگا گشتییەکاندا نەڕوات.
- ڕێگای چۆلەکە نەدات هێلانە لەماڵەکەیدا بکات.
- ئەگەر مەنجەڵت لەسەر ئاگردان هەڵگرت مەیەڵە شوێنەوارەکەی لەسەر خۆڵەمێشەکە بمێنێ بەڵکو خۆڵەمێشەکە بشێوینە.
- لە نزیک ڕووناکییەوە سەیری ئاوێنە مەکە.
- ئەگەر لە جێگای خەوتن هەستایت نوێنەکان بپێچەرەوە و جێگاکەت چاك بکەرەوە[1].

بەهۆی ئایینی ئورفی و ئەفسانە و داستانەکانی ڕۆژهەڵاتەوە، فیتاگۆرس گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە ژیان بەردەوام ئەبێ، مردن و ژیانەوەی بەسەردا دێت و نەفسی ئادەمیزاد هەر بە نەمریی ئەمێنێتەوە و ئەگەر خاوەنەکەی مرد ئەوا گیانەکەی ئەچێتە بەر یەکێکی تر. فەلسەفە و وردبوونەوە و تێفکرین و سەرنجدان باشترین ڕێگان بۆ دەربازبوون و پاککردنەوەی نەفس لەو چەوتیی و بەدکارییەی پێوەی نووساون.

لەلای فیتاگۆرس و ڕێبازەکەی خۆکوشتن گوناهێکی گەورەیە و نابێ بە هیچ جۆرێك خۆمان بکوژین و خەڵکی تر بکوژین:

"ئێمە لە جیهاندا غەریب و بێگانەین، لاشە گۆڕی گیانە، لەگەڵ ئەمەشدا نابێ هیچ کەسێك بە خۆکوشتن خۆی لەم چارەنووسە دەرباز بکات.. چونکە ئێمە موڵك و بەندەی خواوەندین و ئەویش شوانمانە... ئەگەر خواوەند نەیەوێ نابێ خۆمان دەرفەتی دەربازبوونی نەفسمان ئامادە بکەین..."[2].

ئەم ڕێبازە بە باشی تەشەنەی کرد و بڵاوبۆوە و لە زۆر شوێندا لایەنگیرانی بۆ پەیدا بوون... لە ژیانی ڕۆژانەشدا ئەندامانی ئەم ڕێبازە دەوری کاریگەریان ئەگێڕا و لە وڵاتەکەی خۆیاندا سەر لەنوێ ڕەنگی ژیانی سیاسی ئایینیان ڕشتەوە... لەلایەکی ترەوە ئەندامانی ئەم ڕێبازە ئەکرێن بە چەند دەستە و توێژێکەوە، یەکەم تاقم

---

[1] بڕوانە: برتراند رسل: تاريخ الفلسفة الغربية، ك١، ترجمة الدكتور زكي نجيب محمود، ص٦٥-٦٦ .

[2] الدكتور جعفر الياسين: فلاسفة يونانيون، منشورات عويدات، ط٢، بيروت – لنبان ١٩٧٥، ص ٤٤.

گوێگری پیٚ ئەوترێ. ئەم گوێگرانە هەموو ئامۆژگارییەکانی ڕێبازەکە لەکوێ ئەگرن و ئەو ناوەشیان بۆیە لیٚ نراوە چونکە توانای لەشت گەیشتنیان نەبووە یاخود کەم لە شت گەیشتوون. ئنجا هەڵبژاردەکان دیٚن کە ئەمانە زۆر لەمامۆستاکەیانەوە نزیکن.. بیروڕای ئەندامانی ئەم ڕێبازە زۆر نهێنی بووە و بە هیچ جۆرێك شتیان نەدرکاندووە.

ئەوەی جێگای داخە نەهامەتییەکی گەورە بەسەر ئەم ڕێبازە هاتو و بە ڕۆژی ئاشکرا لە بارەگاکەیاندا سووتاندنیانن تەنیا دو قوتابی بە پەلە پرووزە و شەڕەشەق لەسووتان و مردن دەربازیان بوو.. واش زانراوە کە فیتاگۆراس دەرباز بووە و لەگەڵ هەندیٚ لە لایەنگیرانیدا رایانکردووە تاوەکو گەشتوونەتە پەڵە پاقلەیەك و بەپێی بیروباوەڕەکانیان بەناو ئەو پەڵە پاقلەیە نەکەوتوون و پێیان لیٚ نەناوە.. لەو کاتەدا دوژمن چاوی پێیان کەوتووە و کوشتوونی[1].

فیتاگۆریزم ڕێبازێکە ئایینی ئورفی خستۆتە ناو چوارچێوەیەکی ژیرییەوە... واتە لایەنی ئایینی و لایەنی فەلسەفەی هەیە... لەمەوبەر باسی لایەنی ئاین و بڕوای ئەم ڕێبازەمان کرد و ئێستاکەش دێینە سەر لایەنی زانست و سیاسەتی ئەم ڕێبازە.

پوختەی فەلسەفەی ئەم ڕێبازە بریتییە لەم ڕستەیەی خوارەوە:

"ژمارە سروشتی هەموو شتێك پێك ئەهێنیٚ"[2].

واتە هەموو شتێك لەم جیهانەدا کە هەیە لە ژمارە پێکهاتووە ... با بزانین بۆچی ئەم ڕێبازە ژمارە وا بە گرنگ ئەزانیٚ و ئەیکات بە سەرچاوە و هەوێنی بوونی هەموو شتێك ... شارەزایان لەو باوەڕەدان کە مۆسیقا لە ژیانی ئەندامانی ئەم ڕێبازەدا دەورێکی گرنگی گێڕاوە و لە کاتی نوێژ و ئاهەنگی ئایینیدا بە مەبەستی پاکردنەوەی نەفس لە گەردو خەوش مۆسیقای تایبەتییان لیٚ داوە و... هەر ئەم باوەڕەش وای لیٚ کردوون کە پتر سەرنج لە مۆسیقا بدەن و بایەخ بە دەنگ بدەن... ئەگەر سەرنج بدەین بۆمان دەرئەکەویٚ کە بەپێی داوەشاندنی چەکوش دەنگەکەی ئەگۆڕیٚ تاوەکو وەشاندنی چەکوشەکە قایمتر بیٚ دەنگەکە جیاوازتر ئەبیٚ و بە پێچەوانەوە... سەبارەت بە دەنگ و ئاوازی مۆسیقاش هەر وایە... جیاوازی دەنگی گیتار هۆی ئەو کەرەسەیە نییە کە لێوەی دروستکراوە بەڵکو هۆی درێژی و گرژی ژێیەکانێتی. کەوابوو بنچینە و کەرەسە و سەرچاوەی هەموو بوونێك ژمارە و ئاوازە.. بەلای فیتاگۆراس و لایەنگرانییەوە ناگونجیٚ ماددەیەك لە چوار ماددەکە (ئاو، هەوا، گل، ئاگر) سەرچاوەی بوون بیٚ چونکە ئەو کاتە ناتوانریٚ هۆی

---

[1] الدكتورة اميرة حلمي مطر: الفلسفة عند اليونان، القاهرة، دار النهضة العربية ١٩٧٤، ص ٦٨.

[2] Zeller: Ibid. P25

جیاوازیی نێوان شتەکان لێك بدرێتەوە کەوابوو هەموو شتێك لە ژمارە و ئاوازەوە هاتووە.
ژمارە ئەکرێ بە دوو بەشەوە.. تاك و جووت، یەکەمیان دابەش ناکرێ و دووەمیشیان بە دوو بەشی ئەوەندەی یەکتری دابەش ئەکرێ.. یەکەم سنووردارە و دووەم بێ سنوورە .. یەکەم چاکەیە و دووەم بەدکارییە... ئەم رایانە ئەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی بڵێین سروشتی بوون سروشتێکی دوولایەنییە... لە بووندا دژایەتی هەیەو ژمارە (دە) ژمارەیەکی پیرۆزە چونکە "دە" جۆرە شتی دژ بە یەکتری لە بووندا هەیە کە ئەمانەن:

- سنووردار و بێ سنوور.
- تاك و جووت.
- یەکایەتی و فرە.
- راست و شکاوە.
- نێر و مێ.
- تاریکی و رووناکی.
- چوارگۆشە و لاکێش.
- چاکەکاری و بەدکاریی.
- وەستاو و جوولاوە.
- راست و چەپ[1].

ژمارە لەلای فیتاگۆرس و رێبازەکەیەوە پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە و هەولی داوە ئەو تیۆرییە بە سەر هەموو شتێك بچەسپێنێ و هەموو شتێك بگرێتەوە... فیلۆلاوس کە ئەندامێکی ئەم رێبازە بووە دەربارەی دەور و بایەخی ژمارە وتویەتی:
"بڕوانە سروشتی ژمارە و ئەم کارەی بەپێی ئەو هێز و توانایەی لە ژمارە _دە_دا هەیە، ئەیکات، گەورەیە. بەشی هەموو شتێکی تێدایە... لە ژیانی خواوەند و ئاسمانەکان و ئادەمیزاددا یەکەم بنچینە و رێگانیشاندەرە. بەبێ ئەم ژمارەیە سنووری هیچ شتێك نامێنێ و تەم و مژ هەموو شتێك ئەگرێتەوە باوەش و هیچ شتێك نابینرێ. سروشتی ژمارە ئەوەیە بۆ رێ نیشاندان و بەرەوپێشچوون لە کاتی گومان و تەنگانەدا پێودانگی دەستنیشانکردن و رادە بۆدانان بێت. ئەگەر ژمارە و سروشتەکەی نەبوونایە هیچ بوونێك لە خۆیدا و چ لە پەیوەندیدا بە شتی ترەوە، روون و ئاشکرا نەئەبوون. ئەتوانی هەست بە دەور و هێزی ژمارە بکەی کاتێك خۆی ئەنوێنێ نەك بە تەنیا لە کاروباری جنۆکە و خواوەندا بگرە کە لە هەمو کردار و بیری

---

[1] عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني القاهرة مكتبة النهضة المصرية ١٩٦٩، ص ١٠٩.

ئادەمیزاد و لە هەموو پیشەیەکی دەستی و مۆسیقادا خۆی ئەنوێنێ. سروشت و ئاوازی بەسازی ژمارە ڕێگای هیچ جۆرە بوختان و قەڵبکردن و درۆزنییەك نادەن... قەڵبکردن هیچ پەیوەندی بە ژمارەوە نییە.."[1].
ئەمەیە دەوری ژمارە لە بیرو ڕێبازی فیتاگۆرسدا.. تا ئەو ڕادەیەی ئەندامەکانی وای بۆ چوون کە تەنانەت بوون و گەردوو و جیهانیش بە پێی ژمارە ئافەریدە کراون.. ئەستێرەکانیش بەپێی ژمارە و ئاواز ڕێکوپێك کراون. بە باوەڕی ئەم ڕێبازە خاڵ(.) ژمارە یەکە و هێڵ دووە و ڕووبەر سێیە و ئەمانەش لەسەر شێوەی هەرەم ئەنووسرێن... ژمارە (١، ٢، ٣، ٤) پیرۆزن چونکە ژمارە (١٠) یان لێ پێك دێت... هەروەها ئەم ڕێبازە خاوەنی تیۆرێکی ئەندازەییە کە بە ناوی تیۆری فیتاگۆراس ناسراوە و بریتییە لەمە:
(لە سێگۆشەیەکی گۆشە وەستاوەدا ئەو چوارگۆشەیەی لەسەر تیرە دروست ئەکرێ دوو ئەوەندەی ئەو چوارگۆشەیەیە کە لەسەر هەر لایەك لە دوو لایەکەی تر دروست بکرێت...[2].)
نەفسی ئادەمیزادیش بەپێی ژمارە و ئاواز ئافەریدە کراوە و بۆ سازدان خراوەتە لاشەی ئادەمیزادەوە، دەربازبوونی نەفس تەنیا بە مردنی ئەو کەسە ئەبێت و ئەوسا کە لە لاشە جیا ئەبێتەوە و ئەگەڕێتەوە بۆ بەر لاشەی گیانلەبەرێکی تر..
لەم بارییەوە وتراوە کە فیتاگۆراس وتوویەتی: "من لە یادمە کە پێنج جار نەفسم لە لەشم جیا بۆتەوە و لە دۆزەخدا پاك بۆتەوە..."
لە کاروباری ئاکاردا لەو باوەڕەدا بوون کە دادپەروەریی ژمارەیەکی دوو ئەوەندەی خۆیەتی وەك (٢×٢)... لە کاروباری پزیشکیشدا دەستیان ڕۆیشتووە و بۆ چاککردنەوەی نەخۆش ڕێگای دەروونی و ماددیان گرتۆتە بەر... لە یەکەم ڕێگادا مۆسیقا و لە دووەمیاندا گژ و گیایان بەکارهێناوە...[3].
لەو باوەڕەشدا بوون کە لەشساخیی ڕادەیەکە لەنێوان دژەکاندا و لەنگەری گرتووە. ئەگەر لەنگەری ئەو ڕادەیە تێکچوو ئەو کەسە نەخۆش ئەکەوێ. فیتاگۆرزییەکان هەوڵیان داوە بۆ یەکەم جار چاو عەمەلیات بکەن و لەو باوەڕەدا بوون کە مێشك

---

[1] بروانە: بنیامین فارنتن: العلم الاغریقی، ٢٥٣، ج١.

[2] براترند رسل: تاریخ الفلسفة الغربیة، ج١، ط٢، ترجمة الدکتور زکي نجیب محمود القاهرة، لجنة التألیف و الترجمة و النشر ١٩٦٧، ص ٧١.

[3] الدکتور جعفر ال یاسین: فلاسفة یونانیون، ط٢، بیروت لبنان ١٩٧٥، ص٥٠.

مەڵبەندی هەستەکانە و چەند ڕێگا و دەلاقەیەك لەنێوان ئەم مەڵبەندە و هەستەکاندا هەیە... خۆ ئەگەر ڕێگایەك لەمانە بپچڕێ ئەوا ئەو پەیوەندییە نامێنێ"[1].

فیتاگۆرس لە کۆڕی سیاسیدا دەورێکی کاریگەری گێڕاوە.. هەندێ جار خەریك بووە کودەتایەك بکات و بێتە سەر حوکم، بەڵام سەرنەکەوتووە و تووشی کوێرەوەری و دەربەدەری بووە. هەر چۆنێك بێت ڕێبازێکی وەك ئەم ڕێبازە هەر ئەبێ لە ژیانی ڕۆژانە و سیاسەتی کۆمەڵدا دەور بگێڕێ جا ئەو دەورە کەم بێ یان زۆر.. .بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم بوارەدا کراون دەرکەوتووە کە ڕابەرانی ئەم ڕێبازە بیروڕای خۆیان بەسەر کاروباری دەوڵەت و سیاسەتدا سەپاندووە و خۆشیان لە کرۆتون یانەیەکیان کردۆتەوە تێیدا نیمچە دەوڵەتێکیان دامەزراندووە و بیروباوەڕی خۆیانیان تێدا جێبەجێ کردووە... بەلای فیتاگۆرسەوە.. دەوڵەت کە یەکسانیی لەنێو هەموو لایەنەکانیدا هەبێت دادپەروەر ئەبێ، دادپەروەر ئەو کەسەیە کە ئەو یەکسانییە بپارێزێ... لە دواییدا گەیشتۆتە ئەورایەی کە نابێ هیچ کەسێك دەست درێژی بکاتە سەر هیچ کەسێکی تر و تۆڵەی زوڵم لێکراو ئەوەندەی ئەو زوڵمە ئەبێت کە لێی کراوە.

هەروەها بە باوەڕی ئەم ڕێبازە ئەبێ (موڵك وماڵی برادەران بۆ هەموویان بێت)[2]. گوایە ئەمەش بۆتە بەردی بناخەی ئەو کومونێستییە ئەفلاتوون لە کۆمارەکەیدا باسی کردووە.

---

1 جورج سارتون: تاريخ العلم، ج١، دارالمعارف بمصر ١٩٦٣، ص ٤٣٧.

2 ارنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان ج١، ص ٩٤_ ٩٧.

# فەسڵی سێیەم:

## فەلسەفەی ئیلیایی:

**ئەگسانوڤان**

**زینون**

**ملیسوس**

**پارمەنیدس**

## فەلسەفەی ئیلیایی

**ئەگسانۆڤان:**

ڕێبازی ئیلیایی لە چوار فەیلەسووف پێکهاتووە (ئەگسانۆڤان، پارمەنیدس، زینۆن، میلسۆس) پارمەنیدس بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ڕێبازەکە دائەنرێ هەرچەندە ئەگسانۆڤان بەپێی کات و تەمەن لە پێش ئەوەوە دێت، بەڵام ئەوی کە بە ئاشکرا لە فەلسەفەکەیدا داهێنان و نوێ و وردەکاریی تیادایە تەنیا "پارمەنیدس و زینون"ن لەبەر ئەوە سەرپێیی باسی ئەوانی تر ئەکەین و فەلسەفەی رابەرانیش بەگشتی شی ئەکەینەوە...

ئەگسانۆڤان لە دەوروبەری ٥٧٠ _ ٤٨٠ی پێش زاییندا ژیاوە وا زانراوە کە بە شیعر فەلسەفەکەی خۆی دەربڕیوە و لە شارێکەوە چووە بۆ شارێکی تر و گەشت و گەڕان و شیعروتنی کردووە بە پیشە، مرۆڤێکی نەفسبەرز بووە...

شارەزایان دەربارەی فەلسەفەکەی چەند رایەکی جیاوازیان هەیە و هەر یەکە و بە شێوەیەك باسی ئەکات. ئەم فەیلەسووفە بە زۆری باسی ئایینی کردووەو ئەوەندە لەو بابەتەی کۆڵیوەتەوە و خەریکی بووە تا ئەو رادەیەی خەڵکی وایان داناوە کە لەنێوان ئایین و فەلسەفدا ئەوەستێ...

بەلای خەڵکی یۆنانەوە چەندین خواوەند هەبووە، ئەو خواوەندانە هەموویان لە ئادەمیزاد چوون... بەڵام ئەگسانۆڤان هێرشی بردۆتە سەر ئەم باوەڕەی خەڵکی و وای داناوە کە خواوەند وەك ئەو خەڵکە نییە کە باسیان ئەکەن و لەسەر شێوەی ئەوان نییە.. تاکە یەك خواوەند هەیە کە لە هەموو خواوەند و ئادەمیزادێك گەورەتر و بەشێوە لە هیچ کەسێك ناکات، هەمووی هەر دیدەیە، بیستنە، عەقڵی رووتە[1] لە هەموو شوێنێکدایە بەبێ ئەوەی بجووڵێتەوە ... چونکە شوێن گۆڕکێ لایەق بەو نییە. بەم پێیە خواوەند کۆنە چونکە ئەوەی نوێیە لەناو ئەچێ ناشگۆڕێ... خەڵکیش بە خراپ و چەوت لە خواوەند گەیشتوون... ئەگەر بلوابایە هەر کەسە بە جۆرێك باسی خواوەندی ئەکرد، بۆ نموونە: حەبەشییەکان وا ئەزانن خواوەندەکەیان پێست رەشت و لووت پووچە[2].

خەڵکی تراقیاش ئەڵێن: خوای ئێمە قژی زەرد و چاوی شینە... خۆ ئەگەر مانگا و وڵاخە بەرزە بە قسە بهاتنایە ئەوا ئەوانیش ئەیانوت خواکەمان لەسەر شێوەی خۆمانە.

---

[1] STACE, W. Ibid. p 41 _ 43.

[2] عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني، ص ١١٧.

## پارمەنیدس

لـــە فەلـــسەفەی یۆنانییەکانـــدا کـــە لەمەوبـــەر باسمـــان کـــرد دوو خـــاڵی گـــرنگ ئەدرەوشێنەوە: تێبینی کردن و بیرکردنەوە... ئەم ڕێبازە بۆ ئەوەی ئەو دیاردانەی سروشت لێك بداتەوە کە بە هەستەکان بەدی ئەکرێن ناچار بووە سیستەمێك دابنێ کەرەسەکەی بیری رووت بێت.. .بەم پێیە وردە وردە هەستەکان لـەبیر جیاکرانەوە و ئەم تەقەللایە لەلای هیراکلیتس هاتە، بەر جا لێرەوە پرسیارێك خۆی ئەسەپێنێ.. بە چ ڕێگایەك ئەتوانین لە سروشت بگەین.. هەستەکان یاخود بە ئەقڵ (بیر)؟ بێگومان هەندێ فەیلەسووف بەلایەنەوە هەست باشترین ڕێگایە... ئەوە بوو لەلای قوتابییەکی فیتـاگۆراس ئـەم رایـە بـە باشـی پـەرەی سـەند و ڕێبـازی پزیـشکی تاقیکردنـەوەیی دانا... بەڵام ئەم ئەنجام و ڕێبـازە هـەروا بە ئاسانی شتی بۆ نەچووە سـەرو لەلایـەن هەندێ فەیلەسووفەوە رەت کرایەوە، بەتایبەتی ئیلیاییەکان و لەمانە پارمەنیدس کە بـە هـەموو جۆرێـك هەسـت رەت ئەکاتـەوە و پـەنا ئەباتـە بـەر عـەقڵ کەچـی وەك لـە فەلـسەفەکەیدا دەرئەکـەوێ گەیـشتۆتە ئـەنجامێك بـە تـەواوەتی بـە پێـچەوانەی هیراکلیتسەوەیە... کەواتا با بزانین ئەم فەلسەفە و ئەنجامانە کامانەن و چۆن پێیـان گەیشتووە.

وا زانراوە کە پارمەنیدس ساڵی ٥٤٠ی پێش زایین لە شاری ئیلیا لەدایك بووە، بەڵام نەزانراوەکـەی مـردووە... کتێبێکـی بـە شـیعر دانـاوە (هەنـدێك بـە پـۆیمی نـاو ئەبـەن) بەناوی "لەبارەی سروشتەوە" بریتییە لە سێ بەش:

- پێشەکی.
- ڕێگای گومان (فەلسەفە)
- ڕێگای راست (سروشت و فیزیك).

زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەم کتێبـە مـاوە و لـە پێـشەکییەکەیدا پارمەنیـدس بـە خـەیاڵ گەشتێك ئەکات بۆ ئەوەی بە خزمەت خواوەند بگات، عەرەبانەکەی کە سواری بووە تووشی هەڵدێر و شەو و ڕۆژ ئەبێ و لەپڕ ئەبینێ کە قاپییەکانی لەسەر داخراون و شۆخە داوێنپاکـەکان داوا لـە "داد" ئەکەن کە ڕێگای بدرێ و داواکارییەکەیان گیرا ئەبێ و تاریکی ئەڕوێتەوە و پاش تۆزێ ڕۆیشتن ئەگاتە خزمەت خواوەند بۆ گەیشتن بە راستی و زانینی هـەموو شتێك[1]. ئنجا ئەگاتـە ئەو ئەنجامەی کـە بڵـێ دوو ڕێگا

[1] Burnet: Ibid. p 127

هەیـە کـە "ڕێگـای گومـان و ڕێگـای ڕاسـت"ن[1]، لێـرەوە ڕێـڕەو و فەلـسەفەکەی دەستنیشان ئەکرێت:

بە باوەڕی پرمەنیدس (وەك لە بەرهەمە شیعرەکەیدا دەرئەکەوێ) ڕاستییەك هەیە و هیچ گومانی لێ ناکرێت. ڕاستییەکەش ئەمەیە:

"هەبوون هەیە و ناتوانی بڵێی نییە، نەبوونیش نییە و ناتوانی بڵێی هەیە و بیری لێ بکەیتەوە"[2] یاخود وەك خۆی ئەڵێ:

وەرە با پێت بڵێم... گوێ لە قسەم بگرە و بچێتە مێشکتەوە... تەنیا دوو ڕێگای زانین هەیە کە ئەتوانی بیریان لێ بکەیتەوە:

یەکەمیان: هەبوون هەیە و ناتوانرێ نەبێ ئەمەش ڕێگای ڕاستە، چونکە شوێن پێی هەق هەڵئەگرێ.

دووەمیان: نەبوون نییە و نابێ هەبێ[3] و کەسیش ناتوانێ لەم ڕێگایە بکۆڵێتەوە چونکە ناتوانین نەبوون بزانین و ناوی بنێین... بوون و بیر یەکن و یەك شتن.

با لێرەوە بزانین ئەم قسەیە ئەمانگەیەنێتە چی و ئەنجامەکەی چی ئەبێت؟ ... پارمەنیدس لەو ڕاستییەیدا کەکردوویەتییە سەرمەشق بنچینەی لۆژیکی لە بەردەستدا بووە کەپشت پێ بەستووە، بنچینەکەش بریتییە لە دوو لق:

١. یاسای خۆیەکی.
٢. یاسای بێ ناکۆکی[4].

ئەم دوو یاسایەش وەك لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد، بەم شێوەیە ڕێك ئەخرێن:

١. (أ) هەر(أ)ە.
نا (أ) هەر نا(أ)ە.
٢. ناگونجێ (أ) نا (أ) بێ.
نا (أ) ناگونجێ (أ) بێت.

جا ئەگەر لە جیاتی هەموو (أ)ێك وشەی هەبوون و لە جیاتی نا(أ) وشەی نەبوون دابنێین ئەوا بنچینەکەی پارمەنیدسمان بۆ ساخ ئەبێتەوە... لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەو بوونە چۆنە، چییە؟ لە کەیەوە هەیە؟ لە وەڵامدا پارمەنیدس ئەڵێ:

---

[1] The way of belief: The way of truth
[2] Zeller: E: Ibid. p 49
[3] Burnet: Ibid. p 45
[4] الدكتور كريم متي: الفلسفة اليونانية، ص ٩٥.

بوون هەر بووە ئێستاش هەیە و هەتا هەتایە هەر ئەمێنێ... گۆڕانیش نییە و بوون ناگۆڕێ چونکە لەناو ناچێ:
"تەنیا یەك ڕێگامان ماوە کە دەربارەی بدوێین ئەویش ئەوەیە کە هەبوون هەیە و چەند بەڵگە و نیشان بە دەستەوەیە کە ئەو هەبوونە نە دروست ئەبێ و نە ئەگۆڕێ و نە تێك ئەچێ و نە لەناو ئەچێ، چونکە یەك شتە، نابزوێتەوە، کۆتایی نییە.."[1]
ئەم بوونە لە چییەوە هاتووە و پەیدا بووە و پەیوەندی بە نەبوونەوە چییە؟
پارمەنیدس لەم بارەیەوە ئەڵێ:
"من ڕێگا نادەم بڵێی یان وا بیر بکەیتەوە گوایە هەبوون (الوجود) لە نەبوونەوە دروست بووە. چونکە لەم حاڵەتەدا ئەبێ چی وای لێ کردبێ دروست ببێ و بۆچی لە دروستبووندا لەکاتی خۆی دواکەوتووە یان پێش کەوتووە؟ ئەبێ لە یەك جاردا هەبووبێ و دروست بووبێ، یان هەر نەبووە... ئێمە ناتوانین بڕوا بەوە بهێنین کە هەبوون لە نەبوونەوە دروست بووە... داد ڕێگا نادات کە بوون دروست ببێ یاخود لەناو بچێ بەڵکو داد بە کەمەندێکی پتەو و قایم _ بوون_ ئەبەستێتەوە... حوکمدان لەسەر ئەم کاروبارە بەمەوە بەندە:
"ئایا بوون هەیە یاخود نییە"[2]... ئەبێ دیسان بگەڕێینەوە سەر ڕێگای ڕاست و بڵێین ئەگەر بوون نەبووبێ لە ئایندەشدا نابێ، بەم پێیە گۆڕان و لەناوچوون نییە و نابێت".
"بوون یەك شتە و دابەش نابێت، تێك هەڵکێشە... لێرەولەوێ بڵاونەبۆتەوە... بوون لە شوێنێکدا پتر نییە لە شوێنێکی تر، بەڵکو هەموو شتێك پڕە لە بوون، یەك پارچەیە توندوتۆڵ بەیەکەوە بەستراوەتەوە".
"هەروەها ناشجووڵێتەوە سەرەتا و کۆتایی نییە"... ئەمە بەگشتی دەربارەی بوون... با بزانین رای پارمەنیدس دەربارەی تیۆری زانین چییە، چونکە لەمەوبەر وتمان ئەو هەستەکان لە مەیدان دوور ئەخاتەوە.. پارمەنیدس لە پەرەگراف دووەمدا ئەڵێ[3]:
"بەڕاستی بەچاوی ژیر سەیری شتەکان بکە ئەگەر دووریش بن نزیك دەرئەکەون... ناتونی ئەوەی هەیە لەوە دابڕی کە هەیە... شتەکان لە یەکتری جیا نابنەوە و بەیەکەوە کۆ نابنەوە".

---

[1] Burnet: Ibid. p8

[2] دەقی ئەم رستەیە بەم شێوەیە: Is it or is it not.

[3] Burnet: Ibid. p2

"هەموو شتێك یەكە لە هەر كوێوە دەست پێ بكەم... چونكە من ئەگەڕێمەوە بۆ هەمان شوێن"[1] وەك لەم تێكستە و لە تێكستەكانی تردا دەرئەكەوێ پارمەنیدس لەو باوەڕە دایە كە بۆ شت زانین دوو ڕێگا هەیە:

- هەست
- ژیر

یەكەمیان ڕێگای گومانە و شایانی ئەوە نییە كە پێی بوترێ زانین[2] چونكە بریتییە لە ڕاوبۆچوونی سادەی ڕۆژانە و ئەندێشە... بەلاَم تەنیا ڕێگای ژیر سەرچاوەی خۆی زانینی ڕاستەقینەیە چونكە هەستەكان بە شێوەیەكی گۆڕاو بوونمان پێشان ئەدەن... بەلاَم ڕاستییەكەی وا نییە و عەقڵ ڕێی پێ ئەبات كە بوون یەك شتە و ناگۆڕێ و هەر بووە و هەر ئەمێنێ هیچ شتێك لە دەرەوەی بووندا نییە.

لە مەیدانی زانستدا[3] پارمەنیدس هەوڵی داوە ئەو ڕێگایە بدۆزێتەوە كە ئەیگەیەنێتە ئەو ڕاستییە رووتەی كەلە پشت دیاردەكانی شتەوەیە... ئەم ڕێگایەشی لە لۆژیكی رووتدا بەدی كردووە و هەستەكان و تاقیكردنەوەی خستۆتە لاوە چونكە لەو باوەڕەدا بووە كە ئادەمیزاد بەبێ ئەوەی هەستەكان بەكاربهێنێ تەنیا بە ڕێگای لۆژیك ئەگاتە ڕاستی رووت.... بەلاَم وەنەبێ لەم بوارەدا بەڵگە(دلیل)ی هێنابێتەوە بەڵكو پشتی بە چەند بیانو (حجە)یێك بەستووە. "بوون هەموو گۆشەیەكی جێگای پڕكردووە.. نەبوونیش بۆشایی رووتە... ئەو نەبوونەش هەر نابێ".

لە ژیانی سیاسیدا پارمەنیدس دەورێكی بەكاری هەبووە و ئەو یاسای شاری ئیلیای داناوە[4].

---

1 Burnet: Ibid. p3

2 عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني، من ص ١٢٢.

3 جورج سارتون: تاريخ العلم، ص ٤٦، ج٢.

4 ارنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، ص ١٠٣، ج١.

# زینـــۆن

لە زمانە ئەوروپاییەکاندا بە زینۆ بەناوبانگە، شتێکی ئەوتۆ لە بارەی ژیانی نازانرێ لەوە زیاتر کە لە ساڵی ٤٩٠ی پێش زایین لە دایك بووە و لە ساڵی ٤٣٠دا کۆچی دوایی کردووە... ئەڵێن گوایا بەوە تاوانبار کراوە کە دژی دیکتاتۆرە ستەمکارە فەرمانڕەواکەی شارەکەی پیلانی گێڕاوە و ئەوەی لێ ئاشکرا بووە و زۆر بە توندی ئازار و سزا دراوە و ئەویش دلێرانە تاوەکو مردن خۆی بۆ ئەم ئازاردانە راگرتووە. قوتابییەکی دڵسۆزی پارمەنیدس بووە.. بە نووسین داکۆکی لە فەلسەفەی مامۆستاکەی کردووە، داکۆکییەکەش لە دوو سەرەوە بووە:

یەکەم: ساخی کردۆتەوە کە بزووتنەوە نییە.

دووەم: سەلماندوویەتی کە فرەیی نییە.

ئەفلاتوونی بەتوانا بەم جۆرە باسی زینۆن ئەکات "ئەو ئیلیاییە بە جۆرە هونەرێك قسەی کردووە و ئەوەندە تیایدا رام بووە توانیویێتی بۆ گوێگرانی دەربخات کە شت لە یەك کاتدا لەیەك ئەچێ و لە یەکتریش جیاوازە.. یەککرتووە و فرەیە، ناگۆڕێ و ئەگۆڕێ لە هەمان کاتدا"[1]. بێگومان قسەکەی ئەفلاتوون شارەزایی زینۆن لە هونەی لێکۆڵینەوەی قسەکردن و دەمەتەقێ و تووێژدا ساخ ئەکاتەوە.

هەندێ شارەزای تر لەو باوەڕەدان کە زینۆن[2]شتێکی تازەی نەهێناوە و ئەم شتانەی وتوونی نالەبارن چونکە تازەییان لە ئەنجامەکەیاندا دەرناکەوێ بەڵکو لەو رێگایەدا دەرئەکەوێ کە پشتگیری ئەنجامەکەی پێ ئەکات... کەوابوو فەلسەفە و شێواز و رێگایەی زینۆن کامەیە:

زینۆن بۆ ئەوەی داکۆکی لە فەلسەفەی مامۆستاکەی بکات هەوڵی داوە ساخی بکاتەوە کە بوون یەك شتە و ناگۆڕێ... جا لێرەدا بەڵگەی "خلف"[3] بەکار ئەهێنێ. ئەمەش جۆرە ساخکردنەوەیەکە بۆ سەرشێواندن لە دوژمن و لەدواییدا وای لێ بکەی کە ئەو بنچینەیەی تۆ داکۆکی لێ ئەکەیت راستە... بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێ ساخی بکەینەوە دادپەروەریی شتێکی باشە ئەوا بەپێی ئەو بەڵگەیە ئەبێ لە

---

[1] افلاطون: فايدروس. ب ٢٦١، ترجمة: داميرة مطر، ص٩٨.

[2] STACE: Ibid.p52

[3] Impossible Argument

سەرەتاوە بەوە دەست پێی بکەین کە جەور و زوڵم شتێکی باشە و دوای لێکۆڵینەو و شیکردنەوە بگەینە ئەنجامێك کە بریتی بێ لەوەی زوڵم و جەور خراپە...

ئیتر کە وابوو دادپەروەری شتێکی باشە.

بۆ ئەوەی زینۆ ساخی بکاتەوە کە بوون یەك شتە و بوون ناگۆڕێ چەند بەڵگەیەك لەدژی فرەیی و دژی بزووتنەوە ئەهێنێتەوە ئەمەش بەڵگەکانە:

١. بزوتنەوە نییە:

ئەو شتەی ئەجووڵێتەوە ئەبێ بە چەند ناوەندێکدا بڕوات پێش ئەوەی بگاتە مەبەست... لەبەر ئەوەی ئەم ناوەندانە لە ژمارەدا بێکۆتایین بۆیە شتە جووڵاوەکە ناتوانێ ئەو ناوەندانە ببڕێ، کەوابوو جووڵانەوەهەر نییە.

٢. بەڵگەی ئەخیل:

ئەگەر ئەخیل (کە خێراترین کەسی یۆنان بووە) لەگەڵ کیسەڵدا بکەوێتە گرەوی پێشبڕکێ و کیسەڵەکە مەسافەیەك با بڵێین (١٠) مەتر لەپێش ئەخیلەوە بێ و هەردووکیان لەیەك کاتدا، بکەونە ڕێ ئەوا هەرگیزاو هەرگیز ئەخیل بە کیسەڵەکە ناگات... چونکە ئەبێ ئەخیل لە سەرەتاوە مەسافەیەك بڕێ و لەم کاتەشدا کیسەلەکە مەسافەیەکی تری بڕیوە ئیتر ... هتد... ئەگەر وای دابنێین ئەخیل دە ئەوەندەی کیسەڵەکە ئەڕوات ئەوا لەو کاتەدا کە ئەخیل گەیشتۆتە جێگای پێشوو کیسەڵەکە، ١/١٠ی ئەو مەسافەیە دوور کەوتۆتەوە بەم شێوەیە:

١٠، ١/١٠، ١٠٠، ١/١٠٠٠... هتد. کەوابوو هیچیان بە یەکتری ناگەن.

٣. تیری فڕیو:

ئەم بەڵگەیە پشتی بەوە بەستووە کە کات لە چەند ساتێکی نەپساوە پێك هاتووە ... ئەگەر تیرێك هەڵدەین ئەوا ئەو تیرە لە هەموو ساتێکدا لە شوێنێکی ئەوەندەی خۆیدا ئەبێ و کەواتا شوێنەکەی خۆی بەجێ ناهێڵێ و بزوتنەوە نییە....

**بەڵگەی یاریگا:**

ئەم بەڵگەیە بەندە بەوەی کات لە ساتی نەپساوە و جێگا لە خاڵی دابەش نەبوو پێك هاتوون و ئەگاتە ئەو ئەنجامەی بگوترێ: کاتێك کە نیو ئەوەندەیی بێت ئەوەندەی کاتێکی ترە کە دوو ئەوەندە بێت.

ئەمەش بەڵگەکەیە:

سێ کۆمەڵە شتمان هەیە، هەر کۆمەڵە لە چوار پیت پێکهاتووە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ا١ | ا٢ | ا٣ | ا٤ |
| ١ب | ٢ب | ٣ب | ٤ب |
| ٤ت | ٣ت | ٢ت | ١ت |

کۆمەڵە پیتی (ا١)(ا٢) (ا٣)(ا٤) لە جێگای خۆیان ناجووڵێنەوە... بەڵام کۆمەڵە پیتی (١ب)(٢ب) (٣ب)(٤ب) بەرەو (ا١) ئەڕۆن و کۆمەڵە پیتی (ات)(٢ت)(٣ت)(٤ت) لەیەك کاتدا و بە یەك خێرایی بەرەو (ا٤) ئەڕۆن... کاتێك کۆمەڵە پتی (ب) و کۆمەڵە پیتی (ت) لەگەڵ کۆمەڵە پتی (ا) و لەگەڵ یەکتریدا جووت ئەبن (١ب) دوو پیتی (ا)ی بڕیوە و چوار پیتی (ت)ی بڕیوە... لەبەر ئەو کەوابوو ئەو کاتەی (١ب) بۆ بڕینی کۆمەڵە پیتی (ت) پێویستی پێیەتی دوو ئەوەندەی ئەو کاتەیە کە بۆ بڕینی کۆمەڵە پتی (ا) پێویستیەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو کاتەی کۆمەڵە پیتی (ب) و کۆمەڵە پیتی (ت) پێویستیانە بۆ جووت بوون لەگەڵ (ا) یەك شتە، ئەگەر وابێ دوو ئەوەندەی کاتەکە ئەکات ئەمەش پێچەوانەیە (خلف)ە کەوابوو بوونیش ناگۆڕێ...[(١)].

---

[1] بڕوانە: ارسطو طاليس: علم الطبيعة ك٦، ب١٤، ترجمة: احمد لطفي السيد القاهرة، لجنة التأليف و الترجمة و النشر ١٩٣٥، ص ٢٠٧ – ٢٩٨.

## فرەڕەنگیی نییە

### ١. بەڵگەی جێگا

ئەگەر جێگا هەبێ ئەوا ئەبێ لە شوێنێکدا بێ... چونکە بوون هەمووی لە جێگادایە. ئەبێ جێگا خۆشی لە شوێنێکدا بێ.... جێگای یەکەم لە دووەمدایە و جێگای دووەم لە سێیەم دایە بەم پێیە و زنجیرەکە کۆتایی نایێت.... لەبەر ئەوەی ئەمە شیا و گونجاو نییە کەوابوو جێگا نییە و فرەڕەنگیی راست نییە. بوونیش یەکە.

٢. ئەم بەڵگەیە پشت بەوە ئەبەستێ ئەگەر بوون فرە بێ ئەوا ئەبێ تەبایی لەنێو ئەو شتەدا هەبێ کە بەهۆی کۆمەڵە شتێك و تاکە شتێك لەو کۆمەڵە شتەوە روو ئەدات... ئەگەر دەنکە گەنمێك فڕێ بدەین هیچ دەنگی نایە، بەلام ئەگەر خەرواڵێك گەنم هەڵبرژێرین ئەوا دەنگی ئەو دەنکە گەنمانە بە ئاسانی ئەبیسترێت. ئەگەر وابێت ئەو دەنگەی خەرواڵە گەنمەکە نابێ دەنگی ئەو دەنکە گەنمانە بێت کە خەرواڵەکەیان پێکهێناوە چونکە لەمەوبەر وتمان تاکە دەنکە گەنمێك دەنگی نایەت... جا ئەگەر بوون فرە بوایە ئەو نەیئەتوانی هیچ شتێك بقەومێنێ چونکە دانە و تاکەکانی هیچ ناقەومێنن کەوابوو فرە نییە بەڵکو یەك بوون هەیە[1].

### ٣. بەڵگەی ژمارە:

ئەگەر بوون فرە بێ سنووردار یاخود بێسنوور دەبێ.. چونکە ئەگەر شت زۆر بێ ئەوا ئەبێ ئەوەندەی ئەو شتە بێ کە هەیە... ئەگەر ژمارەی ئەو شتە زۆرانە ئەوەندەی ئەو شتانە بوو کە هەن ئەوا بە ژمارە سنووردار ئەبن... بەلام ئەگەر شت زۆر بێ ئەوا بە ژمارە سنوور رادەی بۆ دانانرێ چونکە لە نێوان دوو شتدا شتی سێیەم هەیە و بەم پێیە کێشەکە کۆتایی نایەت کەوابوو ئەو شتانەی هەن سنوور بۆ کێشراو نین... لەبەر ئەوەی ئەگەر بڵێین بوون زۆرە ئەگەینە دوو ئەنجامی پێچەوانەی یەکتری، ئەمەش ناگونجێ کەوابوو بوون فرە نییە بەڵکوو یەکە و یەك شتە.

### ٤. ئەگەر بوون زۆر بێ ئەوا لەم دوو لایەنە تێناپەڕێ:

یان ئەوەتا لە بچووکیدا بێسنوورە یاخود ئەوەندە گەورەیە لە "برو ئەندازە"دا هیچ سنووری نییە، ئەگەر ئەو شتە زۆر بێ ئەوا ئەبێ تاکی هەبێ و لە تاك پێك هاتبێ...

---

[1] بە هەندێ پاش و پێشخستن ئەم بەڵگەنامانەمان لەم کتێبە وەرگرتووە: Zeller: Ibid.p52.s

ئەم تاکانەش قەوارەیان هەیە یاخود نیانە... ئەگەر ئەم تاکانە قەوارەیان نەبێ ئەوا کە ئەخرێنە سەر شتی تر ئەو شتە هیچ گەورەتر نابێت چونکە ئەگەر شتێك شتێکی بە قەوارەی بخرێتە سەر گەورەتر نەبێ... ئەوەی کە ئەخرێتە سەر شتی تر و ئەو شتەی پێ گەورە نابێت هیچ نییە... کەوابوو هەموو شتێك بەبێ سنوور بچووکە... لە ئەنجامدا کە بوون زۆر بێ و لە تاکەکان پێك هاتبێ هیچ نییە کەوابوو بوون بەبێ سنوور بچووك ئەبێت. خۆ ئەگەر ئەو تاکانە قەوارە (درێژی و پانی و قووڵییان) هەبێ ئەوا لەنێوان تاکێك و تاکێکی تر سێیەم ئەبێت و قەوارەی ئەبێ ئیتر بەم شێوەیە بەبێ کۆتایی هاتن درێژە ئەکێشێ... لەمەوە ناچارین بڵێین کە بوون لە رادەبەردەر (بێسنوور) گەورەیە. ئەو دوو ئەنجامەش کە پێی ئەگەیەن: بوون بێسنوور بچووکە و بوون بێسنوور گەورەیە هەردووکیان بە پێچەوانەی یەکترییەوەن و لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێن... بۆیە بوون زۆر نییە، یەك شتە....

هەر چەندە زینۆن لە شێوە و شێوازی بەڵگە و داکۆکی کردنەکەی بەولاوە، فەلسەفەیەکی نوێی دانەهێناوە... بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دوور ناڕۆین ئەگەر بڵێین زینۆن داهێنەری دیالێکتیکە جا با ئەودیالێکتیکە لە مێشکدا بێ و پەی بە واقیع نەبات. گرنگترین شت لە فەلسەفەی ئەم فەیلەسووفەدا هەروەك هیگڵ وتوویەتی ئەوەیە:

"ئاگری شەڕ لە ناو جەرگەی ئۆردووگای دوژمندا کڵپە ئەسێنی"[1] واتە دوو بیری ناکۆك و ناتەبایان بەراورد کردووە (مەبەست لە پارمەنیدس و زینۆن و میلسوسە) توانیویانە بەهۆی یەکێکیانەوە ئەوی تریان لەناو بەرن.

پێش ئەوەی کۆتایی بە فەلسەفەی زینۆن بهێنین وای بە باش ئەزانم کەرای مامۆستایەکی فەلسەفە لەمیسر بخەمە پێش چاو دەربارەی بەڵگەکانی زینۆن کە تێیدا ئەڵێ[2]:

لە بواری لۆژیکدا ئەتوانین یەکی بەڵگەکانی زینۆن بخەین، زینۆن ئەیسەلمێنێ کە ئەگونجێ یەکە نیوەی مەسافەکە بڕین ئنجا ساخی ئەکاتەوە کە ناگونجێ و

---

[1] امام عبدالفتاح امام: المنهج الجدلي عند هيجل، ص ٥٤، (نووسەری ئەم کتێبە بەم بەرهەمەی پلەی ماجستێری وەرگرتووە.)

[2] الدكتور فؤاد زكريا، نظرية المعرفة والموقف الطبيعي للانسان، القاهرة، مكتبة النهضة المصرية ١٩٦٢، (الحاشية)، ص ١٢٥.

ناتوانرێ و نابێ نیوەی دووەمی ببڕدرێ (مەبەستی ئەخیل و کیسەڵەکەیە) بەڵام ئەم قسەیە بە ئاسانی رەت ئەکرێتەوە بەوەی بڵێین چۆن یەکەم جار نیوەی مەسافەکە بڕدرا ئەوا بە هەمان شێوە ئەتوانرێ نیوەکەی دووەمیش ببڕدرێ. ئەگەر مەسەلەکە خۆی تێیدا بێ کە نیوەی یەکەمی ئەبڕدرێ، کەوابوو بەم پێودانگە وا پێویستە کە بشێ و ببێ دووەمیش ببڕدرێ... لێرەدا زینۆن ئەکەوێتە بەردەم ئەو رەوشەی بڵێ هەر لە سەرەتاوە ئەبوو بزووتنەوە نەبوایە... چونکە ئەگر بزووتنەوە سەرەتای هەبێ ئەبێ کۆتاییشی هەبێ.... خۆ ئەگەر مەسەلەکەشی هیچ جۆرە بزووتنەوەیەکی ساخ نەکردبایەوە ئەوا ئەمە بە پێچەوانەی هەموو بەڵگەکانییەوە ئەبوو.

قوتابی پارمەنیدسە لە ساڵی ٤٤٠ی پێش زایین هەندێکی تر ئەڵێن لە ساڵی ٤٤٤ی پێش زایین لە دایك بووە. نازانرێ کەی کۆچی دوایی کردووە، جگە لە فەلسەفە سەرکردەیەکی سیاسی بووە سەرکردایەتی لەشکری ساموسی کردووەو دژی ئاتین تیایدا سەرکەوتووە. کتێبێکی بەناو "دەربارەی سروشت یاخود بوون" داناوە، تەنیا دە پەرەگراف لەم کتێبە ماوە کە پرۆفیسۆر "بێرنت" کردوویەتی بە ئینگیزی. ملیسوس لەو بەرهەمەیدا داکۆکی لە فەلسەفەی پارمەنیدس ئەکات و ساخی ئەکاتەوە کە بوون هەر هەبووە و دروست نەبووەو بزوتنەوەش نییە.

لە بواری یەکەمدا ئەڵێ: بوون دروست نەبووە... واتە وانەبووە کە نەبووبێ و ئنجا دروست بووبێ... هەرچی دروستیش نەبووبێ سەرتای نییە... کەواتا بوون سەرەتای نییە... هەرچی سەرەتای نەبێ کۆتاییشی نابێ... ئەوی کۆتایی نییە لە هەموو شوێنێکدا هەیە کەوابوو بوون هەموو شوێنێکی گرتۆتەوەو جێگای تر نەماوە[1] یاخود هەروەك خۆی ئەڵێ:

"ئەوی هەیە و هەر هەبووە... هەتا هەتایە هەر ئەمێنێ... چونکە ئەگەر لە کاتێکدا دروست بووبێ ئەبێ هیچ شتێك لە پێشیەوە نەبووبێ... ئەگەر هیچیش بێ ئەوا لە هیچەوە دروست نابێت"[2].

"لەبەر ئەوەی بوون دروست نەبووە و ... بگرە ئەو هەیە.. هەمیشەییە لە کۆنەوە هەبووە، ئەوا سەرەتا و کۆتایی نییە. ئەگەر بوون نەبووبایە ئنجا دروست ببایە ئەوا سەرەتا و کۆتایی ئەبوو... کەوابوو هەمیشە لەکردن نایەت شتێك پەیدا ببێ بەبێ ئەوەی هەبووبێ"[3]. هەروەها ئەڵێ: "ئەگەر بوون یەك نەبێ ئەوا شتێکی تر سنووری بۆ دائەنێ"[4] "چونکە ئەگەر بێ کۆتایی بێ"[5]، ئەبێ یەك بێت، خۆ ئەگەر بوون دووان بوایە بێکۆتایی نەئەبوو، چونکە یەکێکیان دەوری ئەوی تریان ئەدا".

---

[1] ارسطو طاليس: الطبيعة، ص ١٨، ترجمة: اسحق بن حنين، تحقيق عبدالرحمن بدوي... هەروەها بڕوانە لێکدانەوەی ابن السمع لە لاپەڕە ١٩.

[2] Burnet: Ibid. para 1

[3] Burnet: Ibid. para 2

[4] Burnet: Ibid. para 5

[5] Burnet: Ibid. para 6

بە باوەڕی ملیسۆس بوون و جیهان ناجوولێنەوە و جوولانەوە هەر نییە... "بۆ ئەوەی جیهان بجوولێتەوە ئەبێ بۆشایی هەبێ... ناشتوانرێ ساخ بکرێتەوە کە بۆشایی هەیە، کەوابوو جیهان ناجوولێتەوە"[1] "هەروەها ئەگەر بوون دابەش ببێ ئەوا دەجوولێتەوە... ئەگەر جوولاشەوە ئەوا نەبوو دەبێ"[2] ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوە بوو کە داواکراوە، کەواتا بوون یەك شتە زۆر و فرەڕەنگ نییە ناگۆڕێ و ناجوولێتەوە.

---

[1] ارسطو طاليس: علم الطبيعة، ك٤، ب٨، ترجمة احمد لطفي السيد، ص ٢٠٢.

[2] Burnet: Ibid. para 7

# فەسلی چوارەم:

## فەلسەفەی فیزیك و ئەتۆمیزم:

### دیوكریتس

### ئەمپادوكلیس

### ئەنكساگوراس

## ئەمپادۆكليس:

فەيلەسووفێكە لەو فەيلەسووفانەی كە ژيان و كرداريان سەرنجراكێشن، ساڵی ٤٩٠ی پێش زايين لە ئەكراكاس ياخود لە ئەكريكانتا لەدايك بووە و ساڵی ٤٣٠ی پێش زايين كۆچی دوايی كردووە... ژيان و كرداری زۆر لە فيتاگۆراس ئەچن و خاسييەتی فەيلەسووف و پەيامبەر و زانا و خەمڕەوێن و "مهرج"ی تێدا بووە. هەندێ مێژوونووس لەو باوەڕەدان كە لافی پەيامبەرايەتی ياخود خواوەندی لێداوە و لەم بارەيەوە وتوويەتی:

"هۆ دۆستان دانيشتوانی ئەو شارە گەورەی بەسەر بەردە زەردە گەورەكەی ئەكراكاسدا ئەڕوانێ مژدەتان لێ بێ"[1]. ئەو بەردە بەرزەی لە تەنيشت قەڵاكەوە لووتی لە ئاسمان هەڵچووە.. هۆ ئەوانەی خۆيان بە باشترين هونەرەكانەوەخەريك كردووە... زەوی و زاريان كردۆتە دەشت و پانتايی لەبەردەم بێگانەدا... ئەوانەی بە هيچ جۆرێك نازانن سەرشۆڕيی چييە؟ من وەك خواوەندێكی نەمر لە نێويان‌دا دێم و دەچم من ئێستا نامرم! هەروەك پێويستە لەلای هەمووان ڕێزم ئەگيرێ... سەرتاپای لەشم بە گوڵ دائەپۆشرێ... هەر كاتێك لەگەڵ ژن و پياواندا سەرم بە دەرگای هەر شارێكی ئاوەداندا كردبێ ڕێز و حورمەتم گيراوە.. .خەڵك دەستە دەستە دوام ئەكەون و ئەندامانيان لە ژماردن نايەت.. لێم ئەپرسن چۆن شتيان دەست بكەوێ. هەندێكيان داوای ئاشكراكردنی نهێنی دواڕۆژم لێ ئەكەن. هەندێكی تريان داوای نوشتە و دوعام لێ ئەكەن بۆ ئەوەی لەو ئازار و نەساخييە ڕزگاريان ببێ كە دووچاری بوون. بەڵام بۆچی كەشخە بەم شتانەوە بكەم... هەر وەك ئەوەی كارێكی بەرزو چاك بێ كە لە سەرو ئەم خەڵكەوە بم كە دووچاری فەوتان و لەناوچوون ئەبن".

نزيكەی (١٢٠) ڕستە لە بەرهەمەكانی بەجێماوە كە پرۆفيسۆر برنت تۆماری كردووە و ئەرستۆ لە هەندێ گۆشەی بەرهەمەكانيدا چەند قسەيەكی پەرشوبڵاوی ئەگێڕێتەوە... لە مەسەلەی فەلسەفەی سروشتدا ئەم فەيلەسووفە لەو باوەڕدا بووە كە سەرچاوەی هەوێنی بوون چوار شتە:

---

[1] بيرتراند رسل: تاريخ الفلسفة الغربية ص١٠٣، ك١

"ئـاو، هــەوا، ئـاگر، گـڵ" وەك زانراویــشە ســێ کەرەســەکەی پێــشەوە لەلایــەن فەیلەسووفەکانی ئەیۆنانیاوە باس کراون ئەمیش گلّی خستوونە سەر. بەم شێوەیە ئەمپادۆکلس زۆربەی بیروڕای فەیلەسووفەکانی پێش خۆی هەڵسەنگاندووە و شی کردوونەتەوە و لەنێوانیاندا، ڕێبازێکی بۆ خۆی دەستنیشان کردووە:

با یەکەم جار گوێت لە چوار بنچینەکەی شتەکان بێت:

زیوسی درەوشاوە (ئاگر) هیرای هەڵگری ژیان (هەوا)، ئیدونیوس (گڵ)، نستیس کە فرمێسکی بەگوڕ هاتە خواریٚ و کانی و سەرچاوەکانی شێداریی بۆ گیانلەبەر دروست بوو (ئاو)[1]... ئەم "بنچینانە ئافەریدە نەکراون"[2] چونکە بەلای ئەم فەیلەسووفەوە ئەوەی نەبووە هەرگیز نابیٚ و نایەتە کایەوە و ئەوەی هەیە هەرگیز تێك ناچیٚ و نافەوتیٚ و بۆیە خەڵك چەند:

"حۆلن و چەند کورتبینن... چونکە وای بۆ ئەچن کە ئەوەی لەمەوبەر نەبووە ئەگونجیٚ ببیٚو لەو باوەڕەشدان کە بوون بە تەواوەتی لەناو ئەچیٚ"[3].

ئەمپادۆکلس بە توندی ئەو قسەیە ڕەت ئەکاتەوەو ئەڵیٚ: "ناگونجیٚ و نابیٚ شتێك کە نەبووبیٚ دروست ببیٚ و پەیدا ببیٚ... ئەوەی هەشە هەرگیز لەناو ناچیٚ، ئەمە کارێکەمەحاڵە و تەنانەت ناکریٚ ببیستریٚ"[4]، هەوێنی بوونی شت چوارە، ئەوی هەیە هەر هەبووە و هەر ئەمێنیٚ و لەناو ناچیٚ... کەواتا بە باوەڕی ئەم فەیلەسووفە ئەبیٚ چۆن سروشت و گەردوون و ئادەمیزاد دروست بووبن... ئەو گۆڕانەی لە هەندیٚ شتدا ڕوونەدات چییە؟ کە ئادەمیزادێك ئەمریٚ ئەبیٚ بەچی دابنێین و ناوی چی لیٚ بنێین ئەگەر ئەوەمان زانی کە ئەم فەیلەسووفە باوەڕی بە فەوتان و لەناوچوون نییە؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا با سەرنجێك لەم تێکستانە بدەین: "دوو سەرگوزەشتەت بۆ ئەگێڕمەوە: لە کاتێکدا، گەشەی کردووە و بووە بە یەك دوای ئەوەی زۆر بووە، لە کاتێکی تر دا دابەش بووە، بووە بە زۆر دوای ئەوەی یەك بوو[5]، جۆرە ئافەریدەکردنێکی دوو لایەنی بۆ شتە لەناوچووەکان هەیە، هەروەها لەناوچوونی

[1] Burnet: Ibid. 6
[2] Burnet: Ibid. para7
[3] Burnet: Ibid. para 11
[4] Burnet: Ibid. para12
[5] Burnet: Ibid. para 17

دوولایەنی هەیە... یەکگرتنی هەموو شتەکان ئەبێتە مایەی دەرکەوتنی رەگەزی شتە لەناوچووەکان و ئەبێتە هۆی ونبوونی رەگەزێکی تر، هەر کاتێك ئەم بنچینانە لە یەکتری جیابوونەوە و شتەکان دابەش بوون. ئەم بنچینە و کەرەسانە لە ئاڵ و گۆڕی بەردەوام دان لەژێر کارتێکردنی خۆشەویستیدا یەك ئەگرن هەتا ئەو شتانە هەموویان ئەبن بەیەك، لە هەندێ کاتی تردا شتەکان بەهۆی هێزی کینە لە یەکتری جیاکەرەوە بە هەموو لایەکدا ئەجوولێنەوە... بەم جۆرە شتەکان پەیدا ئەبن و هەبوون وەرئەگرن... ژیانیان درێژە ناکێشێ چونکە لە چارەیان نووسراوە یەکێکیان دوای _زۆری_ گەشە بکات، ئنجا یەکەکە جیا ئەبێتەوە _زۆر_ی لێ پێك دێت...." "خۆشەویستی و کینە لەمەوبەریش هەبوون و ئەشبن و کاتی هەرە کۆن "ئەزەلی" لێیان بێبەش نابێت[1].

بەم پێیە چوار بنچینە هەیە و ئەم چوار بنچینەیە بەهۆی دوو هێزەوە (خۆشەویستی و کینە)[2] ئەبنە هۆی یەکگرتن و لە یەکتری جیابوونەوەی شت و هەر ماوەیەك لە ماوەکانی بوون و گەردووندا هێزێك لەم هێزانە باڵ بەسەر گەردووندا ئەکێشێ... جا بۆیە کێشەکە بریتییە لە تێکەڵاوبوون و لە یەکتری جیابوونەوە... خۆشەویستی وەك هێزێك ئەبێتە هۆی دورستبوون و جێگیرکردنی سیستەم و رێکوپێکی، کینەش هەمان شت تێك ئەدات و هەڵی ئەوەشێنێتەوەو ئەیگێڕێتەوە بۆ سەر دۆخی جارانی. یاخود بۆ ئەو کەرەسەیەی لێوەی دروست بووە. هیچ شتێك سروشتێکی نەگۆڕاوی نییە بەڵکو هەموو شتێك بریتییە لە تێکەڵاوبوون و جیابوونەوە.[3] هەموو شتێك ساتێك لە بزووتنەوە دایە و ساتێك ناجوولێتەوە و ئەگەر خۆشەویستی شتە جیاکراوەکانی کۆ کردەوە و کردنی بەیەك شت ئەوا بزووتنەوە هەیە یاخود لەو حاڵەتەدا کە کینە لەیەك شت، شتی تری جیاکردەوە ئەوا بزووتنەوە بەرپا ئەبێت[4].

ئێستاکەش لەم خولەدا جیهان بەهۆی کینەوە ئەبرێ بەرێوە هەروەك لەمەوبەر جڵەوەکەی بەدەست خۆشەویستییەوە بوو[5].

---

1 Burnet: Ibid. para 16

2 Strife and Love

3 ارسطو طالیس: الکون و الفساد ص ١١٠، ك١، ب١، ف٦

4 ارسطو طالیس: علم الطبیعة، ص ٣٢٦، ك٨، ب١

5 ارسطو طالیس: علم الطبیعة، ص ٤٣٢، ك٢، ب٦، ف١٠

بـەم شـێوەازە ئـەم "زۆرانبازییـەی نێـوان کینـە و خۆشەویـستی، لـە ئەندامـەکانی گیانلەبەری لەناوچوودا دیار و ئاشکرایە... هەنـدێ کات هـەموو ئەندامەکانی لـەش لەکاتی گەشەکردنی ژیانـدا بەهۆی خۆشەویستییەوە کۆ ئەبنەوە... جارێکی تـر بـە کینەی شەڕخواز ئەم ئەندامانە لە یەکتری جیا ئەبنـەوە..."...[1] کەوابوو تێکەڵابوون و لەیـەکتری جیابوونـەوەی ئـەم بنـچینانە بەهۆی دوو هێـزی خواوەنـدەوە ئـەبن کـە ئەوانیش "خۆشەویستی و کینەن". چوار دەورە بەسەر بووندا دێ و لـە دوو دەوردا، یەکێك لەم دوو هێزانـە دەسەڵاتدا، ئەبێ و لـە ناوەڕاسـتدا گیانلەبەران و بوون بـەرپا ئەبن... شتی تـاك لـە قۆنـاخی دووەم و چوارەم دێتـە کایـەوە و لـە قۆنـاخی یەکـەم و سێیەم تێـك ئەچێت... ئەنـدام و پارچەکانی لەشـی گیانلەبـەرانیش بـە رێککـەوت و بـەهۆی خۆشەویـستییەوە دروسـت ئـەبن و زۆر جـار بـە شـێوەیەکی ناڕێکوپێـك گیانلەبەریان لێ دروست ئەبێت:

زۆر جار لەسەر زەوی سـەری بـێ مـل و دەسـتی بـێ قـۆڵ و چـاوی بـێ بـرۆ دروسـت بووە[2]، هەندێ جاری تر "چەندین گیانلەبـەری تـر دروست بـوون کـە چـەندین دەم و چاو و سینگی جۆربەجۆریان بووە و سـەیری هـەموو لایـەك ئەکـەن و گـا دەم وچـاوی ئادەمیزاد و ئادەمیزاد سەری گایان ئەبێ و گیانلەبەری تـر سروشـتی نێرینـەی تیـادا تێکەڵ بە مێیینە ئەبێ و موو هەر چوار پەرلی دائەپۆشی"[3].

هەر چەندە ئەم قسانە سادە و کاڵ و کرچن بەڵام بۆنی تیـۆری پەرەسـندن و "شـەڕی مان و نەمانیان" لێ دێت. لەلایەکی ترەوە بە باوەڕی ئەمپادۆکلس خواوەند و نـەفس و گیـان وەك هـەموو شـتێکی تـر بـەهۆی خۆشەویـستی و کینـەوە دروسـت ئـەبن و لـە چـوار بنـچینەکەوە پێکهـاتوون، بـەڵام ئەمانـە خـۆیـان لـە گیانلەبـەری تـر ناسـکترن... نەفسی ئادمیزاد دوای مردنـی لاشـە ئەچێتە بەر لاشـەیەکی تـر بـەبێ ئـەوەی گـوێ بدرێتە لاشە نوێیەکە کە ئایا لاشەی ئادەمیزادە یاخود ئاژەڵە جا بۆیـە ئـەمپادۆکلس لەبیریەتی کە لەمەوبەر:

"کوڕ و کچ و درەخت و ماسییەکی بێزمان بووە لە دەریادا"[4].

[1] Burnet: Ibid. para 20
[2] Burnet: Ibid. para 57
[3] Burnet: Ibid. para 61

[4] بێرنت: (بە ئینگلیزی)، ل ٢٢٣، پ ١١٧.

نەفسیش کەرەسەیەکی پیرۆزە و لە کاتی خۆیدا پلە و پایە و شوێنێکی تایبەتی و ڕێزی خۆی هەبووە و فڕێدراوەتە سەر زەوی... ئەمپادۆکلس بەرامبەر بە فڕێدانی نەفس ئەڵێ: "گریام و داد و فیغانم کرد کە لە کاتی لە دایکبووندا ئەم زەوییە غەریبەم بینی"[1]، هەروەها ڕوو لە نەفس ئەکات و ئەڵێ: "لەسەر چ تەختێکی شەرەف و خۆشی و بەختەوەرییەك کەوتیە خوارێ و ئێستاکە لێرە لەناو ئادەمیزاددا ئەڕۆم"[2]... ئەم فەیلەسووفە بەم چەند تێکستەی لە پاشی بەجێماوە دەستی خستۆتە سەر چەند خاڵێکی گرنگ .. کێشەی ئەو دوو هێزەی ئەبنە هۆی یەککگرتن و لەیەکتری جیابوونەوەی شت... زیادکردنی گڵ بۆ سەر کەرەسەکەی تر و تیۆری پەرەسەندن کە بە پەرشوبڵاوی باسی کردووە لە هەمووشیان گرنگتر تیۆرییە نیمچە زانستییەکەیەتی کە بیرتراند ڕەسل لە بارەیەوە وتوویەتی:

ئەمپادۆکلس باوەڕی بە یەك کەرەسە نییە و چوار کەرەسەی کردووە بە سەرچاوە و لەو باوەڕەدا بووە کە "بەرەوپێشچوونی سروشت _گەردوون_ و پەرەسەندنی، بەرێکەوت و ناچارییەوەبەستراوە پتر لەوەی بە مەبەستێکی دیاریکراوەوە بەند بێ... فەلسەفەکەشی لەم گۆشەوە لە فەلسەفەی پارمەنیدس و ئەفلاتوون و ئەرستۆ زیاتر لە زانستەوە نزیکە... لە لایەکانی تریشەوە پەنای بردۆتە بەر ئەفسانەی باوی سەردەمی خۆی... بەڵام لەم پەنابردنە بەر ئەفسانەیەدا لە زاناکانی سەدەی نوێ کەمتر نەبووە"[3]...

ئەمپادۆکلس تۆوی چەند تیۆرێکی فەلسەفە و زانست و سایکۆلۆژی چاندووە کە لە لای فەیلەسووفەکانی تر هاتۆتە بەر و گەیشتۆتە ئەنجامە ئاساییەکەی جا با بزانین ئەم تیۆرانە لەمەولا چییان بەسەر هاتووە.

---

[1] هەمان سەرچاوە: پ ١١٨

[2] هەمان سەرچاوە: پ ١١٩

[3] برتراند رسل: تاريخ الفلسفة الغربية، ك١، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محمود القاهرة، لجنة التاليف و الترجمة و النشر ١٩٦٧، ص ١٠٥.

## دیمۆکریتس

به فەیلەسووفی ئەتۆم ناسراوە لە مێژووی فەلسەفەی کلاسیکیدا پایەیەکی بەرزی هەیە، مارکس وتەنی: "یەکەم مێشکی ئینسکلۆپیدیاییە لەنێو یۆنانییەکاندا"[1] زانا و شارەزا و پسپۆر و فەیلەسووفە و پتر لە (٧٠) بەرهەمی هەبووە. بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان لەناوچوون، لە چەند قسەیەکی جۆربەجۆر بەولاوە هیچ تری نەماوە.

وازانراوە کە دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو بووە و پارە و سامانەکەی لە پێناو وەدیهێنانی ئارەزوو و ئاواتیدا پەخش کردووە... سەری لە میسر و بابل و فارس داوە، شارەزایی لە زانستی کلدانییەکانیشدا هەبووە... هەندێ سەرچاوە بە دووری نازانن کە سەری لە هیندستان دابێ بۆ زانین و شارەزابوونی لە بیروڕای فەیلەسووفەکانی ئەم وڵاتە.

سەری لە حەبەشە داوە و لە دواییدا گەڕاوەتەوە یۆنان لە ئاتین جێگیر بووە، بەڵام لەم شارەدا ڕێزی نەگیراوە و هیچ بایەخی پێ نەدراوە... جگە لەوەی لەم شارە کەس گوێی نەداوەتێ ئەفلاتوونیش لە بەرهەمەکانیدا بە یەکجاری پشتگوێی خستووە و تەنانەت تاکە جارێك ناوی نابات و باسی ناکات. بە پێچەوانەوە ئەرستۆ بە باشی و لە چەند بەرهەمێکدا باسی ئەکات و ڕێزی ئەگرێ.

دیمۆکریتس لە فەلسەفەی نوێدا پایەیەکی بەرزی هەیە و پڕ بە پێستی خۆی بایەخی پێ دراوە.. تەنانەت مارکی دوکتۆرای لە بابەتی "جیاوازی نێوان فەلسەفەی دیمۆکریتس و ئەپیکۆردا وەرگرتووە". فەیلەسووفە مەتریالیستییەکانی رووسیش بایەخی تەواوەتییان پێ داوە و لە فیزیك و کیمیای نوێدا دەوری دیارە ... ئەمو تیۆرەی ئەو فەیلەسووفە دایناوە کە بە تیۆری ئەتۆم دائەنرێ "داهێنانێکی پرشنگدار بوو، دۆزراوە گرنگەکانی کیمیای نوێ سەر لەنوێ ژیانیان بە بەردا کردووە ... تیۆری ئەتۆمی دیمۆکریتس لە هەموو تیۆرەکانی سەردەمی خۆی باشتر وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوە و گرێکوێرەکانی کردۆتەوە... ئەم تیۆرەییە دەربارەی سروشتی گەردوون لە مێژووی کۆندا.. ئەو بزوتنەوەیەی کە لە

---

[1] ئەم قسەیەی مارکس لە لاپەڕە (١٤٦)ی کتێبی The German Ideologyدا هاتووە و ئێمەش لەم کتێبەوە وەرمان گرتووە:

KHLYABICH: An out line history of philosophy. Progress PuBlishers, Moscow. P20

تالیسەوە[1] لە سەدەی شەشەمی پێش زایینەوە دەستی پێکردوە چڵە پۆپەی پێشبینی ئەقڵ بووە". جا با بزانین ئەم تیۆری ئەتۆمە، بگرە فەلسەفەی ئەم دانایە بەتێکڕایی چییە و بۆچی ئەم هەموو بایەخەی پێدراوە؟ بۆ ئەوەی بتوانین باسێکی ڕێکوپێکی ڕێبازی ئەم فەیلەسووفە بکەین... سەرنجێك لەم لقانەی بیروڕاکانی ئەدەین:

*گەردوون _ تیۆری ئەتۆم_

*دەروون _نەفس_

*تیۆری زانین

*ئاکار و سیاسەت

بە باوەڕی دیمۆکریتس گەردوون بە گشتی لە دوو شت دروست بووە و پێکهاتووە کە ئەمانەن:

١. شتی وردیلە (ئەتۆم) یاخود بوون.

٢. بۆشایی یاخود نەبوون.

ئەم ئەتۆمانە ئەوەندە بچکۆڵەن بە چاو نابینرێن، لە ژماردن نایەن و لە چۆنیەتیدا لەیەك ئەچن و لە شێوە و پلە و جێگادا لە یەکتری جیاوازن. ئەم ئەتۆمانە هیچ کاتێك نامرن و دروست نابن و سەرەتا و کۆتاییان نییە و هەر هەبوون و هەر ئەمێننەوە... ئەگەرکۆمەڵە ئەتۆمێك بە شێوەیەکی دیاریکراو یەکیان گرت ئەوا شتێکی دیاریکراو دروست ئەبێت و ئەگەر هەمان کۆمەڵە ئەتۆم بە شێوەیەکی تر یەکیان گرت ئەوا شتێکی تر دروست ئەبێت... واتە بزووتنەوە و یەکگرتن و جیابوونەوەی ئەم شتە وردیلانە (ئەتۆم) هۆی دروستبوون و گۆڕانی شێوەی شتن.

ئەرستۆ ئەڵێ: "دیمۆکریتس لەو باوەڕەدایە کە هەموو شتێك لە سەرەتاوە لە شتی وردیلەی دابەش نەبوو یاخود ئەتۆم پێك هاتووەو ئەم ئەتۆمانە لە ژماردن نایەن و شێوەیان دیارینەکراو و لەرادەبەدەر و شتەکان بەپێی ئەم ئەتۆمە و جێگا و پلەکەیان لە یەکتری جیا ئەکرێنەوە"[2]. لە لایەکی ترەوە "بەهۆی جیابوونەوە و

---

[1] بنیامین فارنتن: العلم الاغریقي، ج١، ترجمة: احمد شکري سالم، القاهرة، مکتبة النهضة المصریة، سلسلة الالف کتاب ١٩٥٨، ص ٧٤-٧٥.

[2] ارسطو طالیس: کتاب النفس، ك١، ب١، ف٤، ترجمة: احمد لطفي السید، القاهرة، لجنة التالیف و الترجمة و النشر ١٩٣٢، ص ١٠٩-١١٠.

یەکگرتنی ئەتۆمەکان دروست بوون و لەناوچوون روو دەدەن و گۆڕانیش بەهۆی پلە و ڕیز و شوێنی ئەتۆمەکانەوە ئەبێت[1]....

کەوابوو، بە باوەڕی ئەم فەیلەسووفە بوون بە گشتی و جیهان بە تایبەتی چۆن دروست بوون:

لە سەرەتادا ئەتۆمەکان لە بۆشاییدا ئەجووڵانەوە... بزووتنەوەش کۆنە و هەر ئەمێنێ... دوو جۆرە بزووتنەوە هەیە[2]:

١. بزووتنەوەی ئەتۆمەکان لە بۆشاییدا.

٢. بزووتنەوەی ئەتۆم لە پێناو دروستبوونی جیهاندا.

بزووتنەوەی یەکەم شێوەی دەستەکی هەیە و تیایدا ئەتۆمەکان بەر یەکتری ئەکەون و لەم بەیەك کەوتنەیان بزووتنەوەی دووەم دروست ئەبێت... دووەم بزووتنەو لەسەر شێوەی بازنەیە کە بۆتە هۆی دروستبوونی بوون. لە یەکەم جاردا لاشە ئنجا گەردوون و جیهان دروست ئەبن. چەند جیهانێکی هەمەچەشنە هەیە هەندێکیان بەرەو تێکچوون و هەندێکیان بەرەو هاتنە کایەوە و بوون ئەڕۆن کە ئەمەش بەهۆی بزووتنەوەی ئەتۆمەوەیە. بە باوەڕی دیمۆکریتس (هەروەك ئەرستۆ تۆماری کردووە)[3] نەفس واتە دەروون لە جۆری شتە بزوێنەرەکانە، دەروون جۆرێکە لە ئاگر و گەرمایی... ئەو ئەتۆمانەی هەن بێکۆتایین ئەوانەی لەسەر شێوەی -کۆ- دان ئاگر و نەفسن..... ئەمەش لەو شتە وردیلانە ئەچێ کاتێك لەناو تیشکی خۆردا کە لە کلاوڕۆژنەوە دێتە ژوورەوە دەرئەکەون... ئەو ئەتۆمانەی وەك تۆپ خڕن نەفسن چونکەئەم جۆرە ئەتۆمانە بە ئاسانی بە هەموو شتێکدا ئەچن و لە بزواندنی شتی تر بەتوانا ترن چونکە خۆیان جووڵاوەن... بە باوەڕی ئەم فەیلەسووفە (مەبەستی لە دیمۆکریتس و لۆکیبوس و فەیلەسووفەکانی ئەتۆمە _ ٤٠٤ ١٠):

نەفس گیانلەبەر و ئاژەڵیش ئەهێنێتە جووڵە و هەر بۆیەش هەناسەدانیان کردووە بە خاسیەتی هەرە گرنگی ژیان... کە هەوا تەوژم بۆ لەش ئەهێنێ ئەتۆمە خڕەکان دێنە

---

[1] ارسطو طاليس: كتاب النفس، ص ١١٦، ك١، ب٢، ف٤.

[2] عبدالرحمن بدوي: ربيع الفكر اليوناني، ط٤، القاهرة ١٩٦٩، ص١٥٤.

[3] ارسطو طاليس: كتاب النفس: ك١، ف٢، ٤٠٤ا، ترجمة: الدكتور احمد الاهواني، ص١٠٩، مراجعة الاب جورج شحاتة قنواتي القاهر، ط٢، دار احياء الكتب العربية، عيسى البابي الحلبي، ١٩٦٢.

دەرەوە چونکە نەفەسەکەیان ناسرەویٚ، لە دەرەوەش بەهۆی ئەتۆمی لە هەمان شێوە بـەتواناتر ئـەبن و لەگـەڵ هەناسـەدا ئەچـنەوە نـاو لـەش.... جیهـانیش هـەمووی زینـدووە، هەناسـە ئـەدات، بـەڵام هـیچ جۆرە خواوەنـدێك یـاخود هێزێکـی ئاسمـانیی نییە.

دیمۆکریتس تیۆری زانینی باس کردووە و کردوویـەتی بە باسێك لـە رێبازەکەیـدا و ئـەم لقـەش لـە فەلسـەفەکەیەوە چـرۆی دەرکـردووە کـە بریتییـە لـە سـەرەنجدانی ئەتۆمییانەی گەردوون. لەمەوبەر وتمان گەردوون لە "ئەتۆم و بۆشایی" پێکهاتووە و ئەمـەش دوو راسـتین و نکۆڵییـان لـیٚ ناکرێـت ئـەم ئەتۆمانـە قـەوارە و روخسـاریان هەیە... دیمـۆکریتس لـەم هەڵوێستە مەتریالییـەوە رازی نـابیٚ بەوەی هەسـتەکان بـە سەرچاوەی زانین دابنرێن و ئەو لەو باوەڕە دایە کە شتەکانی دەوروپشتی ئادەمیزاد وێنـە ئـەنێرن و ئـەو وێنانـە ئەچـنە نـاو چـاو و شـت ئـەبینریٚ، رەنـگ و بـۆن و سـیفەتەکانیش کـە هەسـتیان پـیٚ ئەکـەین تـەنیا روخسـارن و خـەڵك وەك نـەریت لەگەڵیانـدا راهـاتووە... لـە کـاتی شـت زانینـدا هـیچ نێـوان و نێوەنـدێك نییـە بـەڵکو مەسـەلەکە راسـتەوخۆ دروسـت ئـەبێت و ئەتۆمـەکانی دەرەوە کـار ئەکەنـە سـەر ئەتۆمـەکانی دەروون بـەبیٚ ئـەوەی هەسـتەکان لـەم کـارەدا دەورێکیـان هـەبیٚ چـونکە ئەتۆمـەکانی نـەفس ئەچـنە نـاو هـەموو گۆشـەیەکی لەشـەوە.... جـا بۆیـە دوو جـۆرە زانین هەیە:

- زانینی راست
- زانینی هەڵە یاخود چەوت[1].

جـۆری دووەمیـان پەیوەنـدی بـە سـیفەتە هەسـت پێکراوەکانـەوە هەیـە و جـۆری یەکەمیـشیان وردتـرە و پەیوەنـدی بـە راسـتەوخۆی بـە واقیعـەوە هەیـە. یـاخود بـە شێوەیەکی تر بوون دوو شێوەی هەیە: بوونی راستەقینە و بوونی روخسارییانە... یەکەمیان ئەتۆم و بۆشاییە و بە هەستەکان بەدی ناکرێن و دووەمیشیان بریتییـە لە بۆن و رەنـگ و تام و دەنـگ و گـەرمایی... ئەمانـەش بە هەستەکان بـەدی ئـەکرێن و روخسارن... چونکە لە سروشت و ناخی ئەتۆمدا نین بەڵکو بریتین لەو پەیوەندییـەی لەنێو ئەتۆمەکاندا هەیە.

---

[1] شارل فرنر: الفلسفة اليونانية ص٤٨، ترجمة: تيسير شيخ الارض –دار الانوار بيروت ١٩٦٨.
هەروەها بڕوانە: – الدكتور جعفر ال ياسين: فلاسفة يونانيون، ط٢، بيروت ١٩٧٥ ص٧٨.
هەروەها بڕوانە: –الدكتور كريم متى: الفلسفة اليونانية مطبعة الارشاد بغداد ١٩٧١، ص٧٨.

لە بواری سیاسەت و ئاکاردا هەروەك دوای لێکۆلینەوە دەرکەوتووە دیمۆکریتس رۆڵەی چینی ناوەڕاستی خاوەن کۆیلەکان بووە و "دیموکراتی بووە[1] و پشتگیری پەرەسەندنی پیشە و بازرگانی و زانستی کردووە" ... لە ئاکاردا لەو باوەڕەدا بووە کە چێژ و ئازار مانای بەختەوەریی دەستنیشان ئەکەن و بەختەوەری تەنیا لە ناخی ئادەمیزاددا دەستگیر ئەبێ نەك لە دەوروپشتمانەوە. دڵخۆشی و رەحەتی گیان و ئاسوودەیی ئەبێ خولیای هەمیشەییمان بن و چەند بەند و یاسایەك هەیە ئەبێ پەیڕەویان بکەین وەك[2]:

- ئەگەر بتەوێ لە هیچ نەزانینەوە بە دووربی هەوڵ مەدە هەموو شتێك بزانی.
- ئازایەتی سەرەتای کارکردنە و رێککەوتنیش ئاغای کۆتاییە.
- سەرنجدان لە شاکارە جوانەکان چێژو لەزەتی گەورە ئەهێنێتە کایەوە.
- ئاسوودەیی و سەرسووکی و رووخۆشی ئەنجامی حەددی ناوەڕاستن لە نێوان چێژ و لەزەت وەرگرتن لە ژیان و زیادەرۆیی و کورتهێنان دەبنە مایەی ئاڵۆزاندنی دەروون.
- ئەوی زوڵم بکات کلۆڵ ترە لەوەی زوڵمی لێ ئەکرێ.
- چاك وایە ئادەمیزاد پرس بکات پێش ئەوەی کارێك بکات و لێی پەشیمان ببێتەوە.
- لەگەڵ ئەمانەشدا پەشیمان بوونەوە لە کاری چەوت و ناڕەوا کلیلی سەرفرازییە لە ژیاندا.
- نەفسی گەورە و بەرز خراپە و بەدکاری خەڵکی تر بە هێمنی و نەرم و نیانی وەرئەگرێ.
- هەر کەسێك تاکە دۆستێکی دڵسۆزی نەبێ شایەنی ئەوە نییە بژیا[3].

---

[1] ف. افاناسیف: الفلسفة الماركسية، ص٢٣، ترجمة: عزيز سباهي – منشورات جريدة النور بغداد بدون تاريخ.

[2] جورج سارتون: تاريخ العلم، ج٢، ص٥٧.

[3] تا ئێستا چەند تێکستێکی فەلسەفەی فەیلەسووفەکانی قۆناخی پێش سوقراتمان کردووە بە کوردی، بە تایبەتی لە کتێبە بە نرخەکانی پرۆفیسۆر جۆن بێرنتەوە _ چاپی لەندەن ١٩٥٨، نیازمان وایە ئەگەر دەرفەتی چاپکردنیانمان بۆ هەڵکەوێ _ لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بەناوی "تێکستە فەلسەفییەکانی قۆناخی پێش سوقراتەوە چاپی بکەین... خۆ ئەگەر ئەم دەرفەتەش نەهاتە پێشەوە، ئەوا ناو بەناو لە گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاویان ئەکەینەوە...

# ئەنکساگۆراس

یەکەم فەیلەسووفە کە فەلسەفەی خستۆتە ناو شاری ئەتینەوە، خۆی لە شاری کلازومینا لە ساڵی (٥٠٠)ی پێش زایین لەدایك بووە، لەلایەن "بركلیس"ی فەرماندەی ئاتینەوە ریزێکی زۆری گیراوە نزیکەی (٣٠) ساڵ لەم شارەدا ماوەتەوە و لەدواییدا بەوە تاوانبار کراوە کە گوایە ئەڵێ مانگ و خۆر بەردی داگیرساون و لەسەر ئەم قسەیەی خراوەتە بەندیخانەوە بۆ ئەوەی دادگا سزای بدات و برکلیسی دۆستی فریای کەوتووە و رێگای راکردنی بۆ خۆش کردووە و ئەنکساگۆراس رووی کردۆتە شاری لامباکس و پاش ماوەیەك کۆچی دوایی کردووە... کتێبێکی بەناوی "سروشت"ەوە داناوە و نزیکەی (٢٢) رستەی لێ ماوەتەوە و ئەوی تری لەناو چووە.

بەلای ئەنکساگۆراسەوە ناگونجێ ئاو، هەوا، گڵ، ئاگر، هەموویان بەیەکەوە یاخود بەجیا سەرچاوەی دروستبوونی شت بن چونکە نابێ و ناگونجێ گۆشت یان ئێسقان لە شتێك دروست بن گۆشت و ئێسقانیان تێدا نەبێ... جا بۆیە ئەبێ سەرچاوە و هەوێنی شتەکان هەموو شتێکی تیادا بێت هەر شتێکیش کە لە گەردووندا هەیە بەبێ سنوور و کۆتایی دابەش ئەبێ و ئەگاتە رادەیەك ئەوەندە بچووك ئەبێت بە هەست بەدی ناکرێ بەڵکو تەنیا بە ئەقڵ (ناوس) بەدی ئەکرێ. ئەمانەش پێیان ئەوترێ "تۆو" و هەموو خاسییەتێکیان تیادایە و لە ژمارە نایەن و هەوێنی دروستبوونی هەموو شتێکن... هەروەها بەشی هەموو شتێك لە هەموو شتێکدا هەیە و "هیچ" لە "هیچەوە" نایەت و ئەو نانەی کە ئێمە لە گەنم و ئارد و ئاو دروستمان کردووە لە لەشدا ئەبێت بەخوێن و گۆشت و ئێسقان و مو ئەگەر ئەمانەی تیادا نەبێ ئەبێ "چۆن موو لە شتێك دروست کە موو نەبێ یاخود گۆشت چۆن لە شتێك دروست ئەبێ کە گۆشت نەبێ"[1] شان بە شانی ئەمانە ئەقڵ هەیە کە بێسنوور و بێکۆتاییە و خۆی دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا هەیە و تێکەڵاو بەهیچ شتێك نابێت، خۆی بە جیا و خۆبەخۆییە. It self by it self ئەقڵ هەیە کە بێسنوور بێ کۆتاییە و خۆی دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا دەست رۆیشتووە... هەر ئەقڵە بەسەر هەموو گیانلەبەرەکاندا بە بچووك و گەورەوە حوکم ئەکات، هەر ئەویش بوو یەکەم بزووتنەوەی بەرپا کردووە... بەلای ئەنکساگۆراسەوە دروستبوون و لەناوچوون

---

[1] Burnet: Ibid. para 10

نییە بەڵکو تێکەڵاوبوون و لەیەکتری جیابوونەوە هەیە، بە هۆی تێکەڵاوبوون شت دروست ئەبێت و شتێکی دیاریکراو بەو چۆنییەتییەی بەسەریدا زاڵە لە شتی تر جیا ئەکرێتەوە. کە ئەڵێم ئەم لاپەڕەیە سپییە... ئەوا ئەوی راست بێ ئەم لاپەڕەیە رەشیشە بەلام چۆنیەتی سپی پتر زاڵە بۆیە بە سپی ناو ئەبرێ یاخود وەك فەیلەسووف ناوس خۆی ئەڵێ:

"هێلنیاییەکان لەو قسەیاندا هەڵەن کە ئەڵێن: شت دروست ئەبێ و لەناو ئەچێ، هیچ شتێك نابێ و لەبەرچاو ون نابێت بەڵکوو لە یەکتری جیابونەوە یاخود تێکەڵاوبوونی ئەو شتانە هەیە کە هەن...

راست ئەوەیە بڵێین دەرکەوتنی شت و دروستبوونیان تێکەڵاوبوونە و نەمانیشیان جیابوونەوەیە"[1]. هەروەها ئەقڵ ئەو هێزەیە کە یەکەم بزووتنەوەی هێناوەتە کایەوە و ئاگای لە هەموو شتێك هەیە و:

"ئەقڵ رێ بە هەموو ئەو شتانە ئەبات کە تێکەڵاوبوون و لە یەکتری جیابوونەوە و دابەش بوون. ئەقڵ نەزم و سیستەم و رێکوپێکی خستۆتە ناو هەموو ئەو شتانەوە کە هەبوون و لەمەولا ئەبن هەروەها ئەقڵ ئەو بزووتنەوەیەی بەربا کردووە کە بە هۆیەوە خۆر و مانگ و ئەستێرە و هەواو ئەسیر کە لێی جیابوونەوە ئەخولێنەوە هەر ئەم بزووتنەوەیەش جیابوونەوەی داهێناوە و بەهۆیەوە خەست لە سووك و گەرم لە سارد، رووناکی لە تاریکی و وشك لە شێدار جیابوونەوە"[2].

"کاتێك ئەقڵ دەستی کرد بە بزواندنی شتەکان... لە هەموو ئەو شتانەدا کە نەبزووتنەوە جیابوونەوە روویدا... هەر شتێکیش ئەقڵ جووڵاندبێتیەوە جیا بۆتەوە، لەگەڵ پتر بوونی جیابوونەوە و جووڵانەوە و بزووتنەوەی شت، بزووتنەوە پتر بووە هۆی جیابوونەوەی شتەکان"[3] بەم پێیە ئەنکساگۆراس ئەقڵ ئەکات بە هۆیەکی کاریگەر لە بزواندن و دروستبوونی شتدا... بەلام ئەفلاتوونی یۆنانی لە دیالۆگی فیدۆندا لە زمان سوقراتەوە رەخنە لە ئەنکساگۆراس ئەگرێ ودەربارەی کێشەی ئەقڵ ئەڵێ"[4]:

---

[1] Burnet: Ibid. para 17. para 26
[2] Burnet: Ibid. para 12
[3] Burnet: Ibid. para13
[4] افلاطون: محاورات اوطيفرون، الدفاع. اقريطون، فيدون، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محمود، القاهرة – لجنة التاليف و الترجمة والنشر ١٩٦٦، ص١٧٩.

جارێکیان گوێم لە پیاوێك گرت کتێبێکی ئەنکساگۆراسی پێ بوو باسی ئەقڵی ئەکرد... تیادا ئەیوت ئەقڵ هۆ و بزوێنەری هەموو شتێکە... ئەمە زۆر دڵی خۆش کردم و لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر ئەقڵ هەموو شتێکە... ئەگەر ئەقڵ هەموو شتێك بەرەوپێش بەرێت ئەوا هەموو شتێك ئەگەیەنێتە بەرزترین شێوە، نموونەی بەرز و هەموو شتێك لە باشترین جێگادا دائەنێ. زۆر شادمان بووم چونکە وام ئەزانی ئەوەی بەدوایدا ئەگەڕام دۆزیومەتەوە و ئەنکساگۆراس ئەو هۆیانەی بوونم فێر ئەکات کە ئەمویست بیانزانم... بە پەرۆشەوە کتێبەکەم بەدەستەوە گرت و ... بەڵام بەداخەکەم... ئەوەندەی پێنەچوو دەستخەڕۆ بووم... هیوام بڕا... چونکە فەیلەسووفەکەم پاش ساتێك عەقڵی خستە لاوە و پەنای بردە بەر هەوا و ئاو ئەتیر....

من ئەو فەیلەسووفەم وەك ئەو کەسە هاتە بەرچاو کە سوور بێ لەسەر ئەوەی کە ئەقڵ هۆی هەموو کردەوەکانی سوقراتە بە گشتی و کاتێك ویستی ساخی بکاتەوە هۆی کردەوە جۆر بەجۆرەکانم چییە... دەستیکرد بە ساخکردنەوەی ئەوەی من لێرە دانیشتووم چونکە لەشم لە ئێسقان و ماسوولکە پێکهاتووە: ئەو فەیلەسووفە قسەکەی پێشووی خۆی خستە پشت گوێ ئەگینا ئەبوو بیوتبایە بۆیە لێرە دانیشتووم چونکە خەڵکی ئەتین تاوانبارکردنی منیان بەراست زانی و "مەبەستی زیندانەکەیەتی" منیش لەبەر ئەمە بە باشم زانی کە لێرەدا بمێنمەوە"... ئەرستۆی دەریا عیلم دەربارەی کێشەی ئەقڵ لەلای ئەنکساگۆراس ئەڵێ[1]:

ئەنکساگۆراس لەو باوەڕەدا بووە کە بە درێژایی زەمانێکی بێ کۆتایی شتە تێکەڵاوەکان لە خامۆشیدا بوون و لە ساتێکدا ئەقڵ هاتووە و نەزم و سیستەم و بزووتنەوەی خستۆتە ناویانەوە.

بە کورتی ئەنکساگۆراس لەو باوەڕەدا بووە کە دروستبوون و لەناوچوون لە گەردووندا نییە بەڵکو تێکەڵاوبوون و لە یەکتری جیابوونەوە هەیە... گەردوون لە سەرەتادا "تۆوێکی" تێکەڵاو لە ژماردن نەهاتوو بووەو ئەقڵ (Nous) سیستەم و وێنە و روخسار و بزووتنەوەی خستۆتە ناوەیە.... ئەم تۆوانەش وەك ئەتۆم نین چونکە بێبڕوانەوە مادده دابەش ئەبێت... ئەنکساگۆراس دوو خاڵی گرنگی درکاندووە کە زۆر بایەخدارن:

---

[1] ارسطو طاليس: علم الطبيعة، ك٨، ب١، ص٣٢٦.

یەکەم: دانانی ئەقڵ بەرامبەر بە مادده وەك هێزێك كە ورده ورده تێكەڵاوەكە لە ئاژاوە و هەرەمەكییەوە بەرەو رێكوپێكی ئەبات.

دووەم: یەکەم گەردەلوولی هەرکۆن[1] کە بە هۆیەوە وەك بزووتنەوە ماددەی رێکخستووە.

جا بۆیە سەیر نییە کە ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئەم فەیلەسووفەیان بە زیرەك و شارەزا داناوە و لە بەرهەمەكانیدا چەند جارێك باسیان كردووە. ئەرستۆ ئەنكساگۆاس لەگەڵ فەیلەسووفەكانی پێشوودا بەراورد ئەكات و ئەڵێ: ئەنكساگۆراس لەچاو فەیلەسووفەكانی پێش خۆی وەك "پیاوێكی بە رۆژوو وابووە لە نێو چەند كەسێكی سەرخۆشدا كە چییان بەسەر دەمدا هاتووە وتوویانە"[2].

---

[1] جورج سارتون: تاريخ العلم، ص ٤١_٤٢، ج١.

[2] پول موى: المنطق و فلسفة العلوم ، ترجمة: د.فؤاد زكريا، دارنهضة مصر للطبع و النشر القاهرة بدون تاريخ، ص٦.

# بابی دووەم:

# فەلسەفەی مرۆڤ پەروەریی و نسبیەت:
# ڕێبازی سوفستایی

## بەشی دووەم:
## فەسڵی پێنجەم
## فەلسەفەی سۆفستایی

## ســـەرەتا

بۆ ئەوەی سۆفستاییەت وەك بزووتنەوە و ڕێبازێك بخەینە جێگای شیاوی خۆی وا پێویست ئەكات سەرەنجێكی مێژوویی لەو دەوروبەرە بدەین كە تیایدا چەكەرەی دەركـردووە ئـەو زرووفـە خۆیـەكی و بابەتییانـە هەڵسەنگێنن كـە ڕێگاخۆشـكەری سەرهەڵدانی بوون.

لە سەرەتادا پێویستە ئەوەمان لـە یاد بێ كە سۆفستایی بە زمانی ئەوسای یۆنـان مامۆسـتا "فێركــەری" بــەیان و وتـاری ئەگەیانـد و ئـەو كەســەی خــەڵكی فێــری وتارخوێندنەوە بكردایە و كرێی بەرامبەر بەو فێركردنە وەربگرتایە سۆفستاییان پـێ ئەوت، ئەوە بوو دوای ئەو سەدەمە كێشەكە بە بارێكی تـردا شكایەوە و ئـەو وشـەیە بۆ توانج تێگرتن و تانە لێدان بەكارهێنرا.

دوو هـۆی گـرنگ بـەپێی سەرچاوەكان زەمینـەی شینبوونی درەختی ئـەم ڕێبازەیـان خۆش كرد:

یەكەم: دۆخـی سیاسـی ئەوسـای یۆنـان، بـە تایبـەتی لـە كۆتایی سـەدەی پێنجـەمی پـێش زایـین كـە لەشـكری فـارس پـەیتا پـەیتا هێرشـی ئـەبردە سـەر یۆنـان و چـەند ناوچـەیەكی داگیر ئـەكرد و چـەند شـوێنێكی كـاول ئـەكرد و دانیـشتوانی دەربـەدەر ئـەكرد... وای لـێ هـات یۆنانییـەكان لەشـكرێكی گـەورەیان پێكـەوەنا و لەشـكری فارسەكانیان بە خراپی شكاند. ئەم سەركەوتنەی یۆنان گوڕ و تەوژمێكی گەورەی بە بـەر شارسـتانی و كۆمـەڵی یۆنانـدا كـرد و خـستیە دۆخ و قۆنـاخێكی تـرەوە و هـەر ئەوەش بوو وای لەگەڵی یۆنان كرد كە دوای كۆبوونەوەی سامان و داهـاتی ئـابووری هەسـت بـەوە بكـات كـە ڕژێمەكـەی بگـۆڕێ و لـە جـاران پـتر بەچـاوی ڕێـزەوە سـەیری زانست و خوێندن بكـات بە تایبـەتی "وتارخوێندنـەوە" (الخطابـة) لـەنێو جـەماوەردا كە ئەمەش لە سەركەوتندا لە وەزیفەی گشتی حكومەتە دیموكراسییەكاندا كارێكی گەورەی ئەكرد و دەوری ئەگێڕا"[1]. ئاگرخۆشكەری ئەم گۆڕانە تـاقمێكی مامۆسـتا و فێركـاری گـەڕۆك بـوون كـە پێیـان دەوتـرا سوفـستایی فێركەرانـە بـەو پـارەو داهاتـە ئەژیان كە قوتابیان ئەیاندانێ. بەم پێیە بۆ زۆرانبازی و كێشە بەرپاكردن لە مەیدانی سیاسیدا دۆخـی لەبار هاتـە پێشەوە و چەندین ڕژێـم گـۆڕردان و خـەڵك پـتر چاویان

---

[1] جورج سارتون: تطور الفكر السياسي، ج١، ترجمة: حسن جلال العروسي القاهرة – دارالمعـارف بمصر ١٩٧١، ط٤، ص٣١.

کرایەوەو سیاسەت و زانین و وتارخوێندنەوە و دەمراستی لە سەرکەوتن لە جیهانی سیاسیدا دەوریان گێڕا و بۆیە ئەم فێرکەرانە -سۆفستاییانە- هاتنە کایەوە.
دووەم: ئەو کەلەبەرانەی لە فەلسەفەی سەدەی شەشەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش زایین و سەردەمی سۆفستاییەکان هەبوون... فەلسەفەی فیزیک کە لەلایەن تالیسەوە سەری هەڵدا ناچار بوو لە دواییدا بەرەبەرە مەسەلەی زانین بهێنێتە کایەوە... هەرچەندە ئەم فەیلەسووفانە لەو باوەڕەدا بوون کە هەست سەرچاوەی زانینە بەڵام کێشەکەیان ئەکرد بە دوو بەشەوە ... ئەیانوت جیاوازیی لەنێوان ئەوشتانەدا هەیە کە هەست پێمانی ئەگەیەنێ لەگەڵ ئەو شتانەدا کە خۆیان لە واقیعدا هەن... واتە ئەو شتەی ئێمە بە هەست (چاو، گوێ، زمان...) هەستی پێ ئەکەین لە شتەکە خۆی کە لە واقیعدا هەیە جیاوازە... ئەمەش ئەگاتە ئەو ئەنجامەی بڵێین زانیمان ناتەواوە و دەست کورتە... ئەم ئەنجامەش ڕێگاخۆشکەر بوو بۆ دەرکەوتنی سۆفستاییەکان و دانانی ئادەمیزاد بە پێوەرە و پێودانگی هەموو شتێك.. بەڵام سۆفستاییەکان وا بە ئاسانی کاریان بۆ نەچۆ سەرو دوژمنایەتییان کرا و بەربەرەکانی کران، پرۆتاگۆرسیان چەندین تۆمەتی درایە پاڵ... دانا و بلیمەتی یۆنان، سوقراتی گەورە لێیان راپەڕی.... لە کوچە و کۆڵان و بازاڕ و شوێنە گشتییەکاندا بیروڕاکانی شی ئەکردنەوە و ساخی ئەکردەوە کە فەلسەفەکەیان بنچینەیەکی قایم و پتەوی نییە.
ئەفلاتوون بە سێ دیالۆگ ئەم ڕێبازەی تۆمار کردووە:
*سۆفستایی
*پرۆتاگۆراس
*گۆرگیاس[1].
بەڵام ئەبێ ئەوەمان باش لە یاد بێت کە ئەفلاتوون وەك ناحەزێك نەك — وەك دۆستێك — فەلسەفەکەیان تۆمار ئەکات جا بۆیە ئەگەر لەمبارەیەوە شتێك لە ئەفلاتوون وەربگرین ئەبێ بڵێین سۆفستاییەکان لە بۆچوونی ئەفلاتوونەوە... بە باوەڕی ئێمە بوونی سۆفستاییەکان چ وەك قۆناخ چ وەك دیاردە شتێکی زۆر پێویست بوو، ڕێبازە ڕێژەییەکەشیان خزمەتێکی زۆری کۆمەڵ و زانست و شارستانی کردووە... کەچی ئەفلاتوون بەم شێوە باسیان ئەکات:
ئەو کەسانەی بازرگانیی بە زانستەوە ئەکەن و خەڵك بە سۆفستاییان ناو ئەبات، بەڕاستی لەو بیرو باوەڕانە زیاتر هیچی تر ناڵێنەوە کە خەڵك لە کۆبوونەوەکانیاندا

---

[1] ئەم سێ بەرهەمەی ئەفلاتوون کراون بە عەرەبی و یەکەمیان لە دیمەشق و دوانەکەی تر لە میسر چاپ کراون.

باسیان ئەکەن[١]. هەر ئەمەشە کە بە دانایی دائەنێن. لە مەشیاندا زۆر لەو کەسە ئەچن کە دڕندەیەکی گەورەی بەهێز بەخێو ئەکات و سەرنجی بزووتنەوەی و جووڵە و جموجۆڵ و ئارەزووەکانی ئەدات و ئەزانێ بە چی و چۆین هەڵئەچێ و دڕندەتر ئەبێ ئەویش بە هۆی ئەو ماوەدرێژەی لەگەڵیدا بردویەتییە سەر جا ئەم کەسە بێت و ئەم تاقیکردنەوەیەی بە دانایی دابنێ و بیکات بە ڕێبازێك خەڵکی پێ فێر بکات.... لەبەر ئەوەی نازانێ ئەم ڕەوشت و نەریت و ئارەزووانە کامەیان باشە و کامەیان خراپە ئەوا بەپێی ئارەزووی دڕندە گەورەکە ناویان لێ ئەنێت... ئەوەی دڵی خۆش ئەکات بە چاکە و ئەوی پەستیشی ئەکات بە خراپەی دائەنێ. بە ڕاستیش نازانێ مانای تەواوەتی ئەم دوو وشەیە "چاك و خراپ" چییە.... کەوابوو ئەم کەسە پەروەردەگار سەیر نییە؟".

ئەم سۆفستاییانە وەك ئەفلاتۆن بۆی چووە زۆر لە فەلسەفە و داناییەوە دوورن و فڕیان بەسەر زانین و زانستەوە نییە... بەڵام وەك لەمەوبەر وتمان ئەم هەڵوێستەی ئەفلاتوون تەنیا وەك ڕاوقسە و بۆچوونێك لە بۆچوونەکان وەرئەگیرێ... ئەوەتا بێرتراندرەسل لە سەدەی بیستەمدا دەربارەی سۆفستاییەکان ئەڵێ:

"سۆفستاییەکان قوتابخانە و ژیانی تایبەتییان نەبوو... ئەوەی ئەیانویست بە دەرس بیڵێنەوە و فێری خەڵکی بکەن، پەیوەندی بە ئاین و فەزیلەتەوە نەبوو بەڵکو خەڵکیان فێری تەکنیك و هونەری موناقەشە ئەکرد لەگەڵ جۆرەکانی زانین و چۆن ئەتوانن داکۆکی لە ڕایەك بکەین یان ئەو ڕایە بە درۆ بخەینەوە... بەلایانەوە مەبەست نەبوو داکۆکی لەو بیروڕایانە بکەن کە باوەڕیان پێیان بوو... بۆیە ئەم هەڵوێستەیان ئەو کەسانەی کە فەلسەفەیان کردبوو بە شێوازێکی ژیان و بە ئاینەوەیان ئەبەستەوە کەنەفت و شپرزە کردبوو... هەر ئەمەشە وای کردبوو ئەمجۆرە کەسانە بە چاوی گومڕاو چەوت و ناڕاست سەیری سۆفستاییەکان بکەن. ئەفلاتون و فەیلەسووفەکانی تر بۆیە ڕکیان لە سوفستاییەکان ئەبووەوە چونکە ئەم سۆفستاییانە زیرەك و خاوەن ئەقڵێکی بەرز بوون[٢]... جا بۆیە ئەفلاتوون لەگەڵ خۆشیدا ڕاست نەبووە".

بە باوەڕی ئێمە ئەم دوو ڕایە کەلەبەریان تیادایە و تاڕادەیەك لەسەر کردنەوە و دەمارگیریان تیادا بەدی ئەکرێ... خۆ ئەگەر ئەم تاقمە لە پاداشتی دەرس وتنەوەدا کرێیان وەرگرتبێ لەبەر ئەوە بووە ئەوان وەك ئەفلاتوون دەوڵەمەند و پارەدار

---

[1] افلاطون: الجمهورية، ك٦، ص٤٠٥، ترجمة و دراسة: فؤاد زكريا، القاهرة -الهيئة المصرية العامة للكتاب.

[2] برتراند رسل: تاريخ الفلسفة الغربية، ك١، ترجمة الدكتور زكي نجيب محمود، القاهرة- ط٢، لجنة التاليف و الترجمة و النشر ١٩٦٧، ص ١٣٥.

نــەبوون. دەربــارەی ئــەقڵ بەرزیــشیان ئەبوایــە هــەر نــەبێ گۆرگیــاس بــەو مەرەیــە نەچووبایە کە پێی چوو لە دەریای گوماندا نقوم بوو.
سۆفــستاییەکان چــەند کێــشە و مەســەلەیەکی گرنگیــان هێناوەتــەوە ســەر خــوانی باسکردن وەك: بنچینەی زمان و:
"ئایا زمان لەلایەن ئادەمیزادەوە داهێنراوە یاخود کاری گەردوون و سروشتە".
هەروەها رای تایبەتی خۆیان دەربارەی رەوشت و ئاکار و سیاسەت هەبوو، واتە ئەو لقانــەی لەلایــەن خەڵکییــەوە بــە گشتی بایــەخیان پــێ دراوە... بایــەخی بزووتنــەوەی سۆفستاییەکان بە هۆی کەرەسەی ئەو دەرسـەوە نەبوو کە ئەیانوتـەوە. بەڵکو لەبەر ئـەوە بـوو کـە مامۆسـتا بـوون بگـرە (یەکـەم مامۆسـتا پیـشە بـوون لـە یۆنـان و ئـەو شتانەیان بە خـەڵك ئەوت کە لـە ژیـانی سیاسـی و لـە کرداریانـدا یارمەتیی ئەدان... یـەکێك کـە چـووبایە بـۆ لایـان وەك بـۆ خوێنـدن چـووبایە بـۆ زانـستگا وابـوو)[1] ، زانـستگایەك پیـاوانی بـۆ ژیـانی پاشـەڕۆژ پـێ ئەگەیانـد... جا بۆیـە سـەیر نییـە کـە هەندێ مێژوونووس بڵێن ئەمانـە "نیمـچە مامۆسـتا و نیمـچە پروپاڵانتەکـەر بـوون بـۆ نـوێ و شـتی سـەیر، بـۆ شـتی ناسـاز و نـاکۆك و سـەیر و سـەمەرە کـە گـوێ و گـوێگر ئەحەپەسـێنن و بریتیـی بـوون لـە رادەیـەکی ناوەڕاسـت لـە نێـوان چاوبەسـتەکێ و فەلسەفەدا"[2].
دۆخی سیاسی ئەوسا و فەلسەفەی یۆنـان دوو هـۆی هـەرە گرنگـی سـەرهەڵدانی ئـەم بزووتنەوەیە بوون و بە هیچ جۆرێك ئەم بزووتنەوەیە لەو ژیانگە و ئەو دەوروبەرە کە تێیدا چاوی هەڵهێناوە جیاناکرێتەوە.

---

[1] ارنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، ج١، ترجمة: لويس اسكندر، القاهرة–سلسلة الالف كتاب١٩٦٦، ص١١٢.
[2] المصدر نفسه ص ١١٢،ج١.

## پرۆتاگۆراس

لە ناوچەی ئەبدیرا لەدایك بووە لەنێوان ساڵانی ٤٨٠ – ٤١٠ی پێش زایین ژیاوە... لە تەمەنی سیٚ ساڵیدا گەشتێکی بە یۆنان و چەند شوێنێکی تردا کردووە... یەکەم کەسە بە سۆفستایی ناوبراوە... لە ئاتین دۆستایەتی لەگەڵ برکلسدا هەبووە و ئەم فەرمانداەیە داوای لیٚ کردووە کە دەستوورێك بۆ هەرێمی توریای دابنیٚ ئەوەش بەڵگەی شارەزایی و زانایی پرۆتاگۆراسە.

پوختەی فەلسەفەی پرۆتاگۆراس بریتییە لەم رستەیەی خوارەوە:

"ئادەمیزاد پێوەری هەموو شتێکە" پێوەری هەبوونی بوونیەتی و پێوەری نەبوونی نەبوونیەتی.... ئەفلاتوون ئەم رستەیە بەم شێوەیە لێك ئەداتەوە[1]

چۆن شتم بۆ دەرئەکەویٚ ئەو شتە سەبارەت بە من وایە... وە چۆن بۆ تۆش دەرئەکەویٚ ئەو شتانە سەبارەت بە تۆ وان منیش و تۆش ئادەمیزادین. ئەگەر رەشبایەك هەڵکات و من هەستی پیٚ بکەم ساردە ئەواسەبارەت بە من ساردە، خۆ کە تۆش هەستی پیٚ بکەی گەرمە ئەوا ئەو رەشەبایە سەبارەت تۆ گەرمە... کەوابوو روخسار و هەست بە شتکردن یەك شتن و هەستکردن بریتییە لە هەستکردن بە بوونی بوونێك... هیچ شتێك دەستنیشان کراو، یاخود خاسییەتێکی نەگۆڕاوی نییە و لە حاڵێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر ئەگۆڕیٚ جا بەپێی کات یاخود شوێن یان ئەو کەسە بیٚ کە هەستی پیٚ ئەکات... بەم پێیە پرۆتاگۆراس لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا جاڕی رێژەیی، راهێشت و هیچ شتێك لە داوی رێژەیی دەربازی نابێت و ئەمە هەموو شتێك ئەگرێتەوە.

بە باوەڕی هیگڵ ئەم رستەیە زۆر گرنگە و ئەتوانریٚ بە قووڵی لێکبدرێتەوە و لەگەل فەیلەسووفی ئەڵەمانیایی "کانت"دا بەراورد بکرێت.

"ئادەمیزاد پێوەری هەموو شتێکە ... ئادەمیزاد بە گشتی زاتە.. ئەوەش کە هەیە بە شێوەیەکی جیاو دوورەپەرێز نییە... بەڵام ئەمەش سەبارەت بە زانینم لە بارەیەوە،

---

[1] افلاطون: تياتيتوس او عن العلم ترجمة: الدكتور اميرة حلمي مطر، القاهرة، الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٣، ص ٤٦ –٤٧.

ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـە مەوزووعـەوە هەیـە، هـۆش لـە پوختـە و جەوهـەردا بەرهەمهێنەری ناوەڕۆکە... کاریگەری بیری زاتی لە گەوهەردا ئەمەیە..."[1]

واتە ئەوەی وەك شتێکی مەوزووعی بۆمان دەرئەکەوێ نابێ و بەبێ پەیوەنییەکانی لەگەڵ هۆشدا هیچ حیسابێکی بۆ بکرێ و بە بێ ئەم پەیوەندییانە هیچ بوونێکی نییە.

ئاگادارن لەو باوەڕەدان کە پرۆتاگۆراس وتوویەتی:

"دەربارەی خواوەندەکان، نازانم ئایا هەن یاخود نین... چونکە چەند شتێك هەیە ئەبنە کۆسپ لە بەردەم ئەم زانینەدا، وەك: یەکەم ئاڵۆزیی بابەتەکەو، دووەم: کورتی تەمەن و ژیانی ئادەمیزاد"[2].

لێرەدا پرۆتاگۆراس حوکم بە کراوەیی ئەهێڵێتەوە و جارێکی تر مەسەلە نیسبییەکە ساخ ئەکاتەوە.

بـە بـاوەڕی پرۆتـاگۆراس دوو جـۆرە یاسـا هەیـە، یاسـای سروشـت و یاسـای ئـادەمیزاد.... ئـەم یاسـایەی دووەمیـشیان لەلایـەن هـیچ گیانلەبـەرێکی سـەرو سروشتەوە بە سەرماندا نەسەپێنراوە... بەڵکو ئادەمیزاد خۆی دایناوە... سەرەتا و بنـچینە و یاسـاکانی رەوشـت و نـەریت و بـەهاکانی لـە مەیـدانی ئاکـاردا نیـسبین و ئەگۆڕێن. ئەو شتانەی خەڵکی لەگەڵیاندا راهاتوون و بە پیرۆزی دائەنێن و رێـزی لـێ ئەگرن هەموویان شتی چەپەڵ و خراپن و بە پەردە داپۆشراون[3].

دوایێن پاکی چاوبەستەکێیە و لە ئەنجامی نەتوانینی تێرکردنی ئارەزووەوە هاتووە، ئـەوی لاف هـەق ویـستی و دادپـەروەریی لـێ ئـەدات بـێ هـیچ دوودڵـی لێکردنێـك بێدەسەلاتە و هیچی لەدەست نایەت... یاساش پەککەوتە و بێهێز و بـێ دەسەلاتان دایان ناوە بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ دەسەلاتدار و بەهێزان دابنێن[4].

---

[1] ئەم قسەیە "هیگل" لەم کتێبەی خوارەوە وەرگیراوە:

لینین : الدفاتـر الفلسـفـية

[2] جورج سـاترون: تاريخ العلم، ك٢، ص٦٣، ط٢، القاهرة –ترجمة: ابراهيم بيومي مدكور و جماعـة دارالمعارف بمصر ١٩٧٠.

[3] الدكتور توفيق الطويل: الفلسفة الخلقية، ص٢٤.

[4] ئەبێ فرەدریك نیتشێ لە رەنگ رشتنی فەلسەفەکەیدا تا چە رادەیەك سوودی لەم قسەیە وەرگرتبێ؟.

له تیۆری زانیندا پرۆتاگۆراس لەو باوەڕەدایە کە هەستەکان سەرچاوەی زانینن و هەموو ئەو شتانەی بەهۆی هەستەکانەوە ئەیانزانین بەبێ جیاوازیی راستن[1]. زانین نیسبیە و بەپێی کات و شوێن و کەسان ئەگۆڕێ و بوونی شت بەندە بەرێپێردنیەوە، هەموو مەسەلەیەك دوولایەنی هەیە کە بە پێچەوانەی یەکترییەوەن،. هیچ شتێکیش لە هیچ شتێك راستتر نییە بەڵکو ئەگونجێ باشتر یاخود سوودبەخشتر بێت.

بیروڕاکانی پرۆتاگۆراس کاربەدەستانی ئاتینی نارەحەت کرد و... لە بازاڕدا جاڕ درا کە هەرچی کتێبی ئەم فەیلەسووفەی لایەبیهێنێ بۆ ئەوەی بیسوتێنن.. هەر چۆنێك بێ پرۆتاگۆراس خۆی لە دەست دادگار دەرباز کرد بە کەشتییەك رای کرد... بەڵام لە دەریادا کەشتییەکە شکا و خۆشی خنکا.

---

[1] الدکتور کریم متي: الفلسفة الیونانیة، مطبعة الارشاد – بغداد ١٩٧١، ص١١٤.

## گۆرگیاس

دووەم فەیلەسووفی سۆفستاییە لە شاری لیونیتوم لە هەرێمی سقلیە لەدایك بووە لە نێوان سالانی ٤٨٠ – ٣٧٥ی پێش زایین ژیاوە... لەلای ئەنبادۆقلس خوێندوویەتی ... بایەخی بە زمان و وتارخوێندنەوە داوە... کتێبێکی بەناوی "نابوونەوە" داناوە... تیایدا باسی سێ مەسەلەی کردووە کە بە تێکرایی فەلسەفەکەی پێك ئەهێنن و "ئەنجامی" راستەقینەی فەلسەفەی "پارمەنیدن"[1] و بزووتنەوە و گۆڕان رەت ئەکەنەوە سێ بابەتەکەش ئەمانەن:

*هیچ شتێك نییە.

*ئەگەر شتێك هەبێت ناتوانرێ بزانرێ.

*ئەگەر ئەو شتە زانرا ناتوانرێ لە خەڵکی تر بگەیەنرێ [2] با بزانین چۆن گۆرگیاس ئەم سێ کێشەیە ساخ ئەکاتەوە و ئەگاتە چ ئەنجامێك ... ئەرستۆی دەریا عیلم لەم بارەیەوە ئەڵێت: گۆرگیاس بەم شێوەیەی خوارەوە کێشەکانی باس ئەکات:

هیچ شتێك نییە، ئەگەر شتێك هەبێ، ئەوا ئەبێ هەبێ یان ئەبێ نەبێ یاخود ئەبێ هەبێ و نەبێ بەیەکەوە. نابێ ئەو شتە، نابوون بێ، چونکە نابوون نییە. ئەگەر هەبێ ئەوا لە یەك کاتدا بوونە و نەبوونە، ئەمەش ناگونجێ و هەر نابێ.

ناشگونجێ ئەو شتە هەبێ، چونکە بوون نییە. ئەگەر هەبووایە ئەبوو ئەزەلی بێ یان ئافەریدەکراو بێ یاخود هەردووکیان بێ بە یەکەوە. ئەو شتە نابێ ئەزەلی بێ، چونکە ئەزەلی سەرەتای نییە، ئەوی سەرتاشی نەبێ بێسنوورە و دەستنیشانکراو نییە. ئەوی بێسنوور بێ جێگاشی نابێ، چونکە ئەگەر جێگای هەبووایە ئەبوایە لە شتێکی تردا بایە. ئەو کاتەش بێسنوور نەئەبوو، چونکە ئەوی شتی تیادایە گەورەترە لەو شتەی تیایدایە، هیچ شتێکیش لە بێسنوور گەورەتر نییە. ناگونجێ شتەکە لە خۆیدا بێت، ئەگینا ئەو شتەی تیایدایە و جێگاکەش یەك شت ئەبوون و بوون ئەبوو بە دو شت... ئەمەش بووچە... ئەگەر بوون ئەزەلی بێت بێسنوور ئەبوو، ئەگەر بێسنووریش بێجێگای نابێت، ئەگەر جێگاشی نەبێ نییە".

"هەروەها ناگونجێ بوون ئافەریدەکراو Created بێ... چونکە وابێ ئەبێ لە شت دروست کرابێ.. ئەو شتە بوونە یاخود نابوونە هەردووکیشیان ناگونجێن. لەلایەکی ترەوە نابێ بوون ئەزەلی و ئافەریدەکراو بێ لە یەك کاتدا چونکە ئەم دووانە دژ بە یەکترین، کەوابوو بوون نییە".

---

[1] جان فال: طريق الفيلسوف، ترجمة احمد حمدي محمود، القاهرة. سلسلة الالف كتاب. ص ٥٧ – ٥٨

[2] Zeller: Ibid.p 80

هەروەها نابێت و ناگونجێ شت لە تێکەڵاوی بوون و نەبوون پێکهاتبێ، چونکە بوون نییە ئەوا هیچ شتێك نییە.
*ئەگەر شتێك هەبێ ئەوا ناتوانرێ بزانرێ"[1].
ئەگەر رێمان بە شتێکی سپی برد ئەوا سپێتی بابەتی بیر ئەبێت. وە ئەگەر شتی زانراو نەبوو.. ئەوا نابوون بابەتی بیرە. ئەمەش لەو قسەیە ئەچێ "بوون، یاخود راستەقینە بابەتی بیر نین و ناتوانرێ رێیان پێ ببرێ". زۆر شتیش کە بابەتی بیرن راستەقینە نین. ئێمە ناتوانین بە خەیاڵی خۆمان بۆ ئەوە بچین کە عەرەبانە هەیە و بەسەر ئاودا ئەڕوات... گۆرگیاس لەمەوە ئەگاتە ئەو ئەنجامەی بڵێ: "راستەقینە بابەتی بیر نییە، بیریش ناتوانێ رێی پێ بەرێت، ئەقڵی رووت، لە بەرامبەر شت زانین بەهەست، وەك دووەمیان ئەفسانە و ناڕاستە.
*ئەگەر شتە زانرا ناتوانرێ بە خەڵکی تر بگەیەنرێ.
ئەرستۆ بەم شێوەیە سێیەمین بەڵگەی گۆرگیاس تۆمار ئەکات.... ئەو شتانەی هەن ئەوانەن هەستیان پێ ئەکرێ... بابەتەکانی بینین بەچاو ئەبینرێن و بابەتەکانی بیستن بە گوێ ئەبیسترێن... ئەم هەستانەش بەیەکەوە نالکێن و پەیوەندی لەگەڵ یەکتریدا نابەستن. قسەش ئەو رێگایەیە کە خەڵك لە نێوان خۆیاندا پەیوەندی پێ ئەبەستن. قسە لە جۆری ئەو شتانە نییە کە هەن کەوابوو ئێمە قسە بە خەڵکی ئگەیەنین نەك ئەو شتانەی هەن.. هەروەها چۆن ئەوشتانە بە چاو ئەبینرێن ناگونجێ بن بەم شتانەی ئەبیسترێن، هەروەها چۆن ئەو شتانە بە چاو ئەبینرێن ناگونجێ بن بەو شتانەی ئەبیسترێن، ئاوەها قسەش کە ئەیگەیەنین بە خەڵك، ناگونجێ و نابێ ببێ بەو شتانەی کە هەن چونکە لە یەکتری جیاوازن... دوای ئەمە گۆرگیاس ئەگاتە ئەو ئەنجامەی بڵێ ئەگەر شت بزانرێ ناتوانرێ بگەیەنرێتە خەڵکی تر[2].
یاخود بە شێوەیەکی تر: وشە و قسە کە بوون دەرئەبڕن خۆیان بوون نین.. ئەوەش کە ئەگەیەنرێتە خەڵکی تر بوون نییە بەڵکو تەنیا وشەو قسەیە[3].
هەرچەندە هەندێ شارەزا لەو باوەڕەدان کە گۆرگیاس بنچینەی ئەو فەلسەفەیەی هەڵتەکاندووە کە لە بوونەوە دەست پێ ئەکات و بە بیردا ئەگاتە زمان... لەگەڵ

---

[1] ارسطو: كتاب (في ميليسوس و في اكسنوفان و في غرغياس)، ص٣١٤، ب ٥، ف٥، ترجمة: احمد لطفي السيد القاهرة، بجنة التاليف و الترجمة و النشر ١٩٢٢، ئەم کتێبە پاشکۆی کتێبی (الكون و الفساد)ە کە هەمان وەرگێڕ کردوویە بە عەرەبی.

[2] ارسطو: هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان فەسڵ.

[3] لينين: الدفاتر الفلسفية، ٣ج٢: ص٣٤، ترجمة و تعليق الياس مرقص، دار الحقيقة، بيروت ١٩٧٤.

ئەمەدا دوو رای جیاواز ئەبینرێ یەکێکیان هی فەیلەسووفێکی هاوچەرخە کە گۆرگیاس هەڵئەخەڵەتێنێ و ئەڵێ:

"هەر کەسێك باوەڕ بەو سێ مەسەلەیەی گۆرگیاس بهێنێ ئەوا بێ چەندوچۆن کردن بە لایەوە ژیان هیچی تیدا نامێنێ"[1].. هەموو شتێك بەلایەوە چاوبەستەکێ و سەراب ئەبێ... ئەو کاتەش ژیان هیچ مانایەکی نامێنێ و جیاوازی لەنێوان رەسەن و نارەسەن و راست و چەوت و چاکە و خراپەدا نامێنێ".

بە پێچەوانەی ئەم رایەوە، هیگڵی مەزن گۆرگیاس[2]بە پایە بەرز و زیرەك و بلیمەت دائەنێ و ئەو شتەی لەلای ئەدۆزێتەوە کە ئەو وێڵ بووە بە دوایدا ... هیگڵ لەو باوەڕەدا بووە کە سێ مەسەلەکە "مەسەلە و پێچەوانە و تێکەڵکێش"[3] لەلایەن گۆرگیاسەوە باس کراوە و لە بەشی یەکەمدا بابەتییانە ساخی کردۆتەوە کە هیچ شتێك نییە و لە بەشی دووەمدا "زاتییانە" سەلماندوویێتی کە ئەگەر بوون هەبێ ئەوا نازانرێ و لە بەشی سێیەمیشدا "زاتی و مەوزووعی"یانە ساخی کردۆتەوە کە هیچ پەیوەندی لەنێوان ئەوەی ئەزانرێدا نییە.

بەم پێیە گۆرگیاس یەکەم جار بوون و دووەم جار زانین و سێیەم جار پەیوەندی نێوانیان پەك ئەخات و رەتی ئەکاتەوە.

---

[1] جوزیف بوخينسكي: مدخل الى الفكر الفلسفي، ص٣٧، ترجمة: الدكتور محمود حمدي زقزوق، القاهرة – مكتبة الانجلو المصرية ١٩٧٣.

[2] امام عبدالفتاح امام: المنهج الجدلي عند هيجل.

[3] Thesis, Antithese, Synhtesis.

## پێشەکی

لە بەشی یەکەم و دووەمدا باسی فەیلەسووفەکانی ئەم قۆناخەمان کرد کە بە بەهاری بیری یۆنان یاخود بە قۆناخی پێش سوقرات ئەزانرێ و ئەوەمان روون کردەوە کە فەلسەفە لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا بایەخی بە سروشت و گەردوون و دەورووپشتی ئادەمیزاد داوە و بە شێوەیەکی میکانیکیانە سەیری ئەو رووداو و دیاردانەی کردووە کە لەسەر شانۆی جیهاندا یاخود راستتر لەسەر شانۆی سروشتدا روو ئەدەن و گەردوونی بە مەکینە، مەکینەیەکی گەورە داناوە ئەم بۆچوونەش وردە وردە پەرەی سەند تا وای لێهات لەلای سۆفستاییەکان سەرنجدانی سروشت و گەردوون بوون بە پاشکۆی لێکۆڵینەوەی ئاکار و سیاسەت و کاروباری ژین و لەلای سوقراتیش فەلسەفە لە ئاسمان هاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و سوقرات لە بازاڕ و کوچە و شوێنە گشتی و یانەکاندا لەگەڵ خەڵکی کۆ دەبۆوە باسی کاروباری ژیانی رۆژانەی لەگەڵدا دەکردن... ئەو رایەی هەیان بوو لەلایان جێگر و قایمتری ئەکرد یاخود بۆی ساخ ئەکردنەوە کە ئەوان بە هەڵەچوون و باش لە مەسەلەکە نەگەیشتوون.

هەڵسەنگاندنی ئەو قۆناخەی فەلسەفەی یۆنان کە ئێمە بە قۆناخی پێش سوقراتمان ناوبرد بەپێی بۆچوون و رای تایبەتی شارەزا و مێژوونووسان ئەگۆڕدرێ هەندێك بە قۆناخێکی سادە و ساوای دائەنێن و هەندێکی تر لەمانە هێگڵ و نیتشە و پرۆفیسۆر هایدگەر بە قۆناخی زێڕینی دائەنێن.

بە باوەڕی من ئەم قۆناخە هەرچەندە تەقەللاو بۆچوونی سادە و ساکاری تیادایە ئەوا لەگەڵ ئەمەشدا باسی چەند کێشەیەکی گرنگی کردووە و چەند مەسەلەیەکی داگیرساوی هێناوەتە سەر خوانی باسکردن کە تا ئێستاش کاریگەری و گەرم و گوڕیی خۆیان لە دەست نەداوە.

لەلایەکی تریشەوە رێگاخۆشکەرێك بوو بۆ سەرهەڵدانی رێبازی شاسوارانی فەلسەفەی یۆنان (سوقرات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ) و ئەو بابەتانەی ئەوان باسیان کردووە ئەم سێ بلیمەتە جارێکی تر دانایانە لە رێبازە گشتییەکانیاندا دوای بژارکردن دایانڕشتۆتەوە و لە شێوەیەکی رێکوپێکدا وەك دیارییەکی گرانبەها پێشکەشی ئادەمیزادیان کردووە پێشکەشکردنێك کە هەرگیز مێژوو لە یادی ناکات و دەستی رێزی بۆ بە سنگەوە ئەگرێت.

## سوقرات

فەیلەسوفێکی داناو بلیمەتێکی دلێرو چاو نەترس و ڕاستگۆیە فەلسەفەی یۆنانی کردووە بە دوو بەشەوە... فەلسەفەی پێش و پاش سوقرات... داستانی ژیان و کردارو فەلسەفەو مردنی ئەوەندە سەیر و سەرنج ڕاکێشن وایان لە زۆربەی نووسەران کردووە بایەخ بەم لایەنەی بدەن و تا ڕادەیەك بیر و ڕاکانیا لە بیر بچیٚ... سەرەڕای ئەمانە لە سەردەمێکی شێواوی وەك کۆتایی سەدەی پێنجەمی بەر لە زایینـدا ژیاوە... ئەو سەردەمەی لە ژان و هەژان دا بووە، کۆمەڵ شڵەژا بوو بەهاو نەریت پەکیان کەوتبوو،

ئەوەی جاران بە پیرۆز دا ئەنران، بە گومانەوە سەیر ئەکران. ئا لەم کاتەدا سوقرات وەك ئادەمیزادێکی کارامەو دانایەکی بلیمەت خۆی ڕاگرتووە. قسەو کرداری یەك بووە ژیانی کردووە بە قوچی قوربانی ئەو شتەی بڕوای پێی بووە و بەشادمانییەوە پێشوازی لە مەرگ کردووە.

سوقرات لە دەورو بەری ساڵی ٤٧٠ ی بەر لە زایین لە ئەسینا لە دایك بووە نزیکەی (٧٠) ساڵ ژیاوە. واتە لە ساڵی ٣٩٩ ی پیش زایین پیاڵە ژەهرەکەی خواردووە و گیانی دەرچووە.

سوفرو نیکسوسی باوکی پەیکەر تاش و _ڤایناریت_ی دایکی مامان بووە. دانای یۆنانی چاو زەقی کەللە گەورەی لچ ئەستور و لووت پوچ بووە بەڵام خاوەنی دڵ و دەرون و گیان و ڕەوشتێك بووە کە لە مێژوودا نموونەی زۆر کەمە... ماوەیەك پەیکەر تاشی کردووە...

لە ڕیزی لەشکردا کاری کردووە... لە شەردا نموونەی نەبەزین و خۆ ڕاگری و دلێری و ئازەیەتیی بووە...

ئینجا ڕووی کردۆتە فەلسەفەو بە پەیامێکی پیرۆزی داناوە لە ژیاندا ، شارەزایی لە ژمێرە و ئەندازەو ئەستێرە ناسیی و سیاسەتدا هەبووە..

ژنێکی هاری زمان درێژی هەبووە ناوی( ئەکسانتیپ ) بووە وا دەرئەکەویٚ کە سوقرات بە دەستیەوە پەرێشان بووە زۆر جار وتوویەتی(ئەکسانتیپ وەك ئاسمان لە پڕ هەور تێیدا ئەگرمێنی کەچی لە دواییدا یەکسەر دەست ئەکات بە باران بارین).

سـوقراتی دانـا بـه پێـچەوانەی سوفستاییەکانەوە هـیچ جـۆرە کرێیـەکی لـە کـەس وەرنەگرتووە، فیزی نەبووە... لە شوێنە گشتیەکان ، لـە کوچـەو کـوڵان و نـاو بـازاردا بە پێ خواسیی گـەڕاوە و لەگـەڵ خـەڵکی سـادەدا تێکـەڵاو بـووە، بـەبێ ئـەوەی گـوێ بداتە پلەو پایەو دەست ڕۆیشتنیان لەگەڵیانـدا دەربارەی کـارو بـاری ژیـانی ڕۆژانـەو مردن و ڕەوشت و نەریت و ئەو مەسەلانە دواوە کە ئادەمیزادی ئەو سەردەمە پێوەی خەریك بوون.

ئەفلاتون قوتابییەکی سوقرات بووە و لە بەرهەمەکانی دا ژیـان و کـردار و فەلـسەفەی سوقراتی مامۆستای دڵسۆزانە تۆمار کردووە...

سـوقرات بەرهــەمی نووســراوەی نـەبووە تـاوەکو لـە پاشـی بـەجێ بمێنـێ بۆیـە بەرهەمەکانی ئەفلاتون بە ڕاسـترین سەرچاوە دا ئـەنرێن بـۆ نووسـین و لێکۆڵینـەو و خوێندنەوە لەبارەی سوقراتەوە...

ئەفلاتون ئەڵێ:

سوقرات لەو باوەڕەدا بووە کە لـە ئـەنجامی پـەیامێکی یەزدانییـەوە ئەرکێکی گرنگـی کەوتـە سـەر شـان و پێویـستە تەقـەللای جێبـەجێکردنی بـدات. وە ئـەڵێ ڕۆژێکیـان شرێفۆن( دۆست و هاوڕێی منداڵیی سوقرات بووە) چووە بۆ پەرستگای دیلفی و لـە خزمەتچییەکەی پرسیوە: ئایا کەسێك هەیـە لـە سـوقرات دانـا تـر بـێ ؟ لـە وەڵامـدا وتوویەتی نەء[1]. سوقراتیش بۆ ئەوەی ڕاستی و ناراستی ئەم قسەیە ساخ بکاتـەوە لەگەڵ خەڵکیدا کەوتۆتە دەمەتەقێ و لەم بارەیەوە وتوویەتی:

من لاسایی دایکم ئەکەمەوە ، ئەو مامانەو یارمەتی ژنان ئەدا بۆ ئەوەی منداڵیان ببـێ و منـیش یارمـەتی خـەڵك ئـەدەم بـۆ ئـەوە لـە کـاتی تێفکـرین و بیرکرنـەوەدا بگەنـە ڕاستەقینەو بیریکی تر بهێننە کایەوە،

لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا سێ کەس... (ئەنتیس کە سیاسییەکی دیموکرات خـوازی ئەوسا بووە، میلیتس شاعیر بووە، لیقۆن خطیب بوره) سـوقراتیان بـەم سـێ تۆمەتـەی خوارەوە گوناهبار کردووە و دانای یۆنان دراوە بە دادگا:

١. مێشکی لاوانی تێك داوە و خوو ڕەوشتی خراپ کردوون.

---

[1] افلاطـون:محـاورات اطيفـرون، الـدفاع، افريطـون، فيـدون، ص٥١،ترجمـة الـدكتور زكـي نجيـب محمود، القاهرة، لجنة التاليف الترجمة و النشر ١٩٦٦.

٢. نكوڵیی لە بوونی  خواوەندە ڕەسمیەکانی یۆنان ئەکات.
٣. داوای پەرستنی خواوەندێکی تر ئەکات [1] .

لە دادگادا داوا لە سوقرات کرا کە بدوێ.. ئەم تۆمەتانە ڕاستن یا نا؟ ئەڵێ چی؟ بۆ چی وای کردووە؟ تا ئەو ڕادەیە لە ئەنجامدا فرمانی مردنی بەسەردا دراو ئەویش پیاڵە ژەهرە کەی خواردەوە.

ئەفلاتون زۆر وردو دڵسۆزانە ئەم ڕووداوانەی تۆمار کردووە رەسل وتەنی: دڵسوزییەکە وای لێکردووە جلەوی خەیاڵ بۆ خامە ڕەنگینەکەی شل بکات و هەندێ جار وا دێتە بەر چاو کە لەوانەیە سوقراتی ڕاستەقینە زۆر لەم سوقراتە جیاواز تر بێ کە ئەفلاتون یا نووسەری تر  تۆماریان کردووە.

ڕاستە سوقرات مامۆستای ئەفلاتون بووە و کارێکی گەورەی کردۆتە سەر قوتابییەکەی بەڵام ئەفلاتونیش تەنیا گوێگر یاخود میرزا نەبووە.

## ڕێبازە گشتییەکەی

سوقرات وەك ئادەمیزاد و فەیلەسوفیك لە ڕەفتارو ژیانی ڕۆژانەیدا لە پەیوەندی دا لەگەڵ خەڵك، ڕێبازێکی تایبەتی  خۆی هەبووە کە مۆرکی تایبەتی خۆی پێوە دیار بووە و پەیرەوی کردووە.... ئەو ڕێبازەش شێواز و تیور ی تایبەتی خۆی هەبووە... بە پێچەوانەی فەیلەسوفەکانی ئەیونیاوە کە ئەنجامی پێشووی خۆیان پوختە ئەکردو بە پەخشان یان بە شیعری تەم و مژاوی  دایان ئەڕشت.. وە بە پێچەوانەی سۆفستاییەکانەوە کە بابەتەکانیان بە پێی نەخشەی ڕەنگ ڕێژراو ڕیز ئەکرد....

بە پێچەوانەی ئەمانەوە سوقرات شێوازی پرسیار و وەڵامی گرتبووە بەر [2] کە پێی ئەوترێ دیالێکتیك واتە دەربارەی کارو باری ئادەمیزاد ئەیپرسی: چاکەو خراپە چییە؟ جوان و ناشرینی کامانەن؟ دادپەروەری و زۆرداری چین؟ دانایی چییە و شێتی کامەیە؟ جیاوازی نێوان ئازایەتی و ترسنۆکی چییە ؟ دەوڵەت و ئادەمیزادی سیاسی کامانەن؟ حکومەت و حاکم کێن؟ ئەم جۆرە پرسیارو داواکردنی وەڵامەکەی بە لای خەڵکییەوە گران و ناخۆش بوو. بۆیە خەڵکی لێی  دڵ نیگەران بوون؟ زۆر

---

1 فلاطون :هەمان سەرچاوە ل٥٥.

2 ارنست باركر: النظرية السياسية عند الاغريق،ج١، ص١٦١.

کەسی خۆی بە زیرەك و زل زان کە لە گەڵیاندا ئەکەوتە پرسیار و دەمەتەقێ لە ئەنجامی ووتو ویژدا بۆی ساخ ئەکردنەوە بەهەڵە لەو کێشەیە گەیشتوون و مەسەلەکە بە شێوەیەکی ترە. تیورەکەش بریتییە لە تیور زانین... بە باوەڕی دانای یۆنان خەڵکی دوو جۆرە شت ئەزانن.. جۆری یەکەمیان دڵنیای لێ ناکرێ جێگای گومانەو جۆری دووەمیان زانین ڕاستەقینەیە کە هەمیشە لەبەر دەستی ئەقڵ دایە و هیچ گومانێکی لێ ناکرێ.

ئەم ڕێبازەش جگە لە شێوازی تیورەکەی بریتیی بووە لە دوو بەش :

- گالتە پێکردن.
- هێنانە کایەوە.

یەکەمیان وەکو باسمان کرد خۆ بە نەزان نیشاندان و پرسیار کردنە ئینجا گەیشتنە ئەنجام و هێنانە کایەوە ی بیرێکی ترە... جا بۆیە سوقرات وتوویەتی من لاسایی دایکم ئەکەمەوە .

ئەم ڕێبازەش کە مۆرکی تایبەتی سوقراتی دانای پێوە دیارە بە سێ قۆناخدا تێپەریوەو هەریەکێك لەو قۆناخانەخاسییەتی تایبەتی خۆی هەیەو هەر سێکیشیان توند و تۆڵ بەیەکەوە بەستراون.

## یەکەم:

خۆناسین. ئەمەش دروشمی سەردەرگای پەرستگای دیلفی بووە و بریتیی بووە لەم ڕستەیە( خۆت بناسە) سوقراتیش هەر لەسەرەتاوە کردوویەتی بە سەرمەشقی ژیان و لەو باوەرە دا بووە نەزانین یەکەم هەنگاوە بەرەو زانین و پێویستە خۆمان بناسین ئەمجار هە وڵ بدەین شتی تر بزانین.

## دووەم:

پرسیار کردن و هەڵسوراندنی دەمە تەقێ و وتووێژەکەو گەیشتنە ئەنجام کە بریتیی بووە لە ساخ کردنەوی نەزانینی خەڵك کەچی لەگەڵ ئەم نەزانینەیاندا لافیان لێ داوە کە شت ئەزانن.. بەڵام سوقرات لەیەك شت بەو لاوە هیچی تری نەزانیوە و دانی پێ دا ناوە و وتوویەتی من تەنها یەك شت ئەزانم ئەویش ئەوەیە کە: ( هیچ نا زانم) .

لەم قۆناخەوە سوقرات لە واتای تاکەوە گەیشتۆتە چمك و واتای گشتی... واتا پرسیوێتی داد پەروەریی چییە.... ئەگەر ئەفلاتون وەك ئادەمیزادێك ڕەوشت و ئاکاری تایبەت بە خۆی هەبێ و بە دادپەروەر دابنرێ ئەبێ دادپەروەریی بەگشتی چۆن و چی بێت؟ چ کاتێك ئەو دادپەروەرییە لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا هەر داد

ئەبێ ئارەزووی تاکە کەسان ناگۆڕێ و دەستی گۆڕان نایگاتێ... جا بۆیە ئەرستۆ ئەڵێ سوقرات یەکەم کەسە کە سەودا سەری (حەدی هەمەکی ) بووەو بە ئیندەکشن پێی گەیشتووە.

**سێیەم:**

زگماکی زانین: بە باوەڕی دانای یۆنان هەموو ئادەمیزادێك لە ناخەوە ڕاستەقینە هەقیەتی تەواو ئەزانێ و ئەتوانێ بە هۆی یارمەتی دان ئەم ڕاستەقینانە بهێنێتە دەرەوە و بیانزانێ... بۆ نمونە ئەگەر نەخوێندەوارێك بێنین و پرسیاری لێ بکەین و یارمەتی بدەین ئەوا ئەتوایْ گرانترین تیوری زانستییانە چار بکات ، جا بۆیە سوقرات لەو باوەرە دابووە کە:
(منداڵ کە لە دایك ئەبێ هەموو جۆرێکی زانین لە ناخدا هەیە و تەنیا پێویستی بە تۆزێك یارمەتی هەیە تاوەکو ئەم زانینانەی بیر بکەویتەوە) [1].
دەربارەی تیوری نموونەی بەرز Ideals ئەرستۆ لەو باوەڕەدایە کە ئەفلاتون دایناوە و [2] پرۆفیسۆر بیرنت و تایلۆریش ئەڵێن هی سوقراتە و هەرچۆنێك بێت بە باوەڕی سوقرات لە جیهاندا نموونەی بەرز هەیە و هەموو شتێك هەوڵ ئەدات بگاتە ئەم نموونانە یاخود خۆیان لێ نزیك بکاتەوە و لەوان بچێ... هەروەها لەو باوەڕەدا بووە کە ئەو شتانەی تر کە هەست بە بوونیان ئەکرێ ئەگۆڕێن و لەناو ئەچن و نموونەی بەرزیش ناگۆڕێ و لەناو ناچێ و هەر هەبووە و هەر ئەمێنێ. شتی هەست پێکراو زۆرن بەلام نموونە تاکە یەکێکە... کە ئەڵێین جوانیی.. ئەوا مەلی جوان و ئاژەڵ و ئافرتی جوان وگوڵی جوان هەیە بەڵام جوانیی وەك نموونەی بەرز یەك شتە لەبارەی ڕەوشت و ئاکارەوە سوقرات لەو باوەڕەدا بووە کە فەزیلەت و چاکیی و ڕەوشت بەرزی زانینەو چەپەڵی و ڕەوشت نزمیی و چەوتیی نەزانینە بۆیە( فەزیلەت زانینە و ڕەزیلەت نە زانیینە) وە هەر کەسێك لەم دنیایەدا کە کاری خراپ ئەکات... ئەو کارەی لە ئەنجامی نەزانینەوەیەتی، چونکە ئەگەر بەڕاستی ئەنجامی ئەم کارەی بزانیبایە ئەوا نەیئەکرد ... لێرەدا چەندین ڕەخنە ئاراستەی دانای یۆنان ئەکرێ ئەویش ئەوەیە کە مەرج نییە پیاوی خەراپ نەزن بێت... زۆر جار ئادەمیزاد ئەزانێ پیاو کوشتن خراپە بەڵام هەر ئەشیکات. لە لایەکی ترەوە سوقرات بەردی

---

[1] امام عبدالفتاح امام: المنهج الجدلی عند هیجل، ص٦٦.

[2] بڕوانە تیۆری نموونەیی بەرز لە لای ئەفلاتون .

بەباوەڕی سوقرات یاسا (قانون) پیرۆزەو ئەبێ هەموو کەسێك ڕێزی بگرێ... سوقرات بە پێچەوانەی سۆفستاییەکانەوە لەو باوەڕە دا بووە کە یاسا جا ئەوەیان کە نووسراوەیە و ئادەمیزاد بۆ جێگیرکردنی ئاشتی و بەختەوەری لە کۆمەڵدا دایناوە یاخود ئەوەی نەنووسراوەیە، لە ویستی خواوەندەکانەوە وەرگیراوە، ڕاستیی نەگۆڕاون و پێویستە لە لێشاوی گۆڕین و دەستکاری کردن بپارێزین و ڕێزیان بگرین. یاسا نیشانەو بەڵگەی بوونی ئەقڵە [1] کە پێویستە کاری خۆی بکات بۆ بنەبڕکردنی ئاژاوە و گێرە شێوێنی . بەڵگەی ڕاستی ئەم قسەیەش ئەوەیە کە دۆستەکانی سوقرات پاسەوان و یاساوڵەکانی بەندیخانەکەیان بە پارە قایلکرد کەچی سوقرات لە بەندیخانەو لەدست مردن ڕای نەکرد، بەڵکو دلێرانە چاوەڕوانی کرد تاوەکو پاپۆرەکە گەڕایەوە و ژەهرەکەیان بۆ هێنا و خواردییەوە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە سوقرات زۆر ڕێزی یاسای [2] گرتووە و ئەو تۆمەتەی دوژمنانی دابوویانە پاڵی ڕاست نەبووە.

لە کۆتایدا ئەڵێن... سوقرات دامەزرێنەری زانست و ئاکارە و ئەو فەلەیلەسوفانەی لە دوایەوە هاتن ئادەمیزادیان کرد بە بابەتی بنچینەیی فەلسەفەکەیان و لەو باوەڕەدا بوون هەموو شتێك لە جیهاندا مەبەستێکی تایبەتی هەیەو بەرەو جێبە جێکردن و بەدی هێنانی ئەم مەبەستە هەوڵ ئەدات کە ئەمەش بە ئامانجەکیی ناو ئەبرێ. هەر ئەمەش وای لێکردبوون کە بڵێین لە شتدا هێزی نادیار و شاراوە هەیەو ئەو شتە هەوڵی کامڵ کردن و جێبەجێکردنی ئەدات.

---

[1] الدکتورة امیرة حلمی مطر :الفلسفة عند الیونان، ص١٥٨.

[2] قانون وشەیەکی ڕۆمانییەو بەم جۆرە ئەنوسرێ: Canon

# ئەفلاتون

فەیلەسوف و بلیمەتێکە لە بلیمەتە هەرە گەورەکانی دنیا دۆست و دوژمنانی دەستی ڕێزلێنانی بۆ بە سینگەوە ئەگرن. ئەمرسۆن ناهەقی نەبووە کە دەربارەی کتێبی کۆمار وتوویەتی:
هەرچی کتێب لە دنیادا هەیە بیسوتێنن تەنیا کۆمارەکەی ئەفلاتون جێگای هەمووی ئەگرێتەوە.
لە ساڵی ٤٢٧ی پێش زایین لە خێزانێکی خانەدان و دەست ڕۆیشتو لە شاری ئەسینا هاتۆتە دنیاوە لە تەمەنی ٢٨ ساڵیدا بوو کە سوقراتی مامۆستای بە ژەهر خواردنەوە فرمانی مردنی بەسەردا درا... تەتیا ئەوەندە بەسە بڵێین:
ئەفلاتون قوتابی سوقراتی داناو مامۆستای ئەرستۆی زانا بووە.
لەبەر ئەوەی ئەفلاتون ڕۆڵەی خیزانێکی دەست ڕۆیشتوو بووە لە باشترین قوتابخانەی سەردەمی خۆیدا خوێندوویەتی و ئەو قۆناخەی تیایداژیاوە زنجیرەیەك گۆڕان و گیرو گرفتی سیاسی تیایدا ڕوویداوە کەس و کاریشی لەپارتی ئورستوکراتد کە ئەوساکە لەسەر حوکم بووە پلەو پایەی بەرزیان هەبووە جا ئەگەر سوقراتیش ومردنەکەی بخەینەوە سەر دوو هۆیەکەی تر ئەوا ئەم سێ دیاردانە کارێکی گەورەیان لە دروستکردنی کەسایەتی ئەفلاتووندا کردووە.
لە کاتی لاوێتی ئەفلاتوندا پارتی ئورستکرات حوکمی ئەکرد خوێنێکی زۆری ڕشت... ڕژێمی دیموکراسی ئەوسای یونانیش دادپەروەرترین کەسی لەناو بردکە سوقرات بوو ئەمانەش وایان لە ئەفلاتون کرد کە لە کاروو باری ڕۆژانەیدا بەشدار نەبێ و زۆربەی ژیانی بۆ بیرکردنەوە ودانانی نەخشیەك تەرخان بکات تاوەکو بتوانێ بە هۆیەوە ڕێژێمێکی سیاسی بۆ فەرمانڕەوایی وڵاتەکەی دابنێ کە ئالای یەکسانی و دادی لەسەردا بشەکێتەوە و ئەویش کتێبی کۆمار (جمهوریەت) بوو....
حەکیمی ئیلاهی لەم بەرهەمەیدا ساخی ئەکاتەوە کە چاککردنی کۆمەڵ هەر کۆمەڵێك، بە گۆڕینی ڕەوشت وئاکاری تاکە کەسانەوە بەستراوەتەوە.
ئەفلاتون چەند گەشتێکی بەرەو دەرەوەی یۆنان کردووەو ئەڵێن گوایە سەری لە میسر و میگارا داوە. دوای کوژرانی مامۆستاکەی ماوەی دوانزە ساڵ لە نێوان وڵاتانی یۆنان و میسر و ئیتالیا و سقلیە خەریکی گەشتکردن بووە جارێکیان لە گەرانەوە لە سیراکوسە بە دیل ئەگیرێ و دۆستێکی ئەیکڕێتەوە وئازادی ئەکات لە تەمەنی چل سالیدا لە نزیك باخی ئەکادیمۆس قوتابخانەیەکی کردۆتەوە دەرسی

تێادا وتۆتەوە و قوتابخانەکەی بە ئەکادیمیای ئەفلاتون ناو براوەو...لە تەمەنی هەشتاو یەك ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.
ئەفلاتون لە ماتماتیك و ژمێرە و ئەندازە زۆر شارەزا بووە و تەنانەت لەسەر دەرگای ئەکادیمیایەکەی نووسیویەتی" هەر کەسێ ئەندازیار نەبێ نابێ بێ بۆ لامان "
ئەفلاتون سەرەڕای شانازی کردنی بە پشت و ڕەچەڵەکی و ڕەگەزییەوە، شانازی بەوەوە کردووە کە قوتابیەکی سوقرات بووە و بێ سڵکردنەوە لەم بارەیەوە وتوویەتی:
خوایە سوپاست ئەکەم چونکە یۆنانی ڕەگەزم و بەر بەری نیم، پیاوم و ئافرەت نیم... بەڵام لە هەموویان پتر سوپاست ئەکەم چونکە لەسەردەمی سوقراتدا لە دایك بووم.

## بەرهەمەکانی

بە پێچەوانەوەی فەیلەسوفەکانی پێشووەوە دەستی ڕۆژگار نەیتوانی زەفەر بە نووسینەکانی حەکیمی ئیلاهی بەرێت و بەرهەمەکانی بەتەواوی ماونەتەوە...
بەرهەمەکانی ئەفلاتون بە تێکرای لەسەر شێوەی دیالۆگ و گفتوگۆ دەمەتەقێن و سێ جۆرە هونەریان تێدا بەدی ئەکرێ کە ئەمانەن:

- دراما....
- موناقەشە...
- شیکردنەوە و باسکردن و لێکۆڵینەوە....

لەیەکەمیاندا شوێن و دۆخ و زروف و قسەکەران دیاری ئەکات و نوکتەو ڕووداوی وا باس ئەکات کە شێوەی ڕیالستییانەی پێ ئەبەخشی"[1].
لە دووەمیشدا مەسەلەیەکی تایبەتی موناقەشە ئەکات و لە سێیەمیشدا قسەی بەشداربووان و کێشەکە لە بنەڕەتەوە شێ ئەکاتەوە ئنجا ئەگاتە ئەنجام...
بەرهەمەکانی ئەفلاتوون بە تێکڕایی ئەکرێن بە چوار بەشەوە[2]

### یەکەم:

ئەو دیالۆگانەی پێش گەڵاڵەکردنی تیوری نموونەی بەرز داینراون وەك. دیفاعی سوقرات، پرۆتاگۆراس، گۆرگیاس، مینون.

---

[1] یوسف کرم: تاریخ الفلسفة الیونانیة، ص٦٧، القاهرة،١٩٧٠.ط٥.

[2] شارل فرنر: الفلسفة الیونانیة، ص٩٢، ترجمة تیسیر شیخ الارض، دار الانور، بیروت ١٩٦٨.

**دووەم:**

ئەو بەرهەمانەی سەرەتایی باسی تیوری نموونەی بەرز ئەکەن: میوانیی، فیدون، کۆمار، فایدروس.

**سێیەم:**

ئەو بەرهەمانەی تێیاندا ئاورێك لە بەرهەمەکانی پێشوی ئەداتەوە ڕەخنەیان لێ ئەگرێ و دەستکارییان ئەکات: تیاتیتۆس، پارمەنیدس، سوفساتییی، سیاسی.

**چوارەم :**

ئەم بەرهەمانەش بە کاملی دوا وێنەو ڕوخساری ڕێبازەکەی نیشان ئەدەن: تیماوس، ئەکریتاس، قانون.

فەلسەفەی ئەفلاتون لە دەریایەکی قوڵ ئەچێ کە لەچەند سەرچاوەیەکەوە ئاوەکەی هەڵئەقوڵێ و لقەکانی ئەچنەوە سەر دەریایەکە... ڕێبازەکەی ئەفلاتون، لە لایەکەوە پوختەو ئەنجامی فەلسەفەکانی پێش خۆیەتی و بلیمەت و شارەزاو وردە کارییانە بژاریان ئەکات و جارێکی تر بە مۆرکێکی تایبەتی داین ئەرێژێتەوە. ( لە فەلسەفەی ئەفلاتوندا شوێنەواری فیتاگۆراس و پار مەندیس و هیراکلیتس و سوقرات) [1] بەدی ئەکرێت. لە فیتاگۆراسەوە بڕوا بوون بە نەمریی گیان و ژیانی دنیای تر و بایەخدانی بە ژمێرەو وەرگرتووە. وە لە پارمەندیس ئەو ڕایەی کە ئەڵێ جیهانی ڕیالیستی و ڕاستەقینە ناگۆڕێ و گۆڕانیش لەسەر بنچینەی لۆجیك خەیاڵەو لە هیراکلیتسەوە ئەوەی وەرگرتووە کە ئەڵێ: جیهانی ( هەست پێکراو) ئە گۆڕێ و ساتێك لەسەر یەك شێوە نامێنێ. بە هۆی سوقراتیشەوە بایەخی بە کێشەکانی ئاکار داوە و لە بەرهەمەکانی دا بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخان کردووە...ئەگەر بە گشتی سەرنجی ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی حەکیمی ئیلاهی بدەین بۆمان دەر ئەکەوێ کە فەلسەفەکەی لەم لقانە پێکهاتووە:

- تیوری زانین.
- بوون و گەردوون.
- تیوری نموونەی بەرز.
- نەفس و دەروون.
- کۆمار

[1] برتراند رسل: تاريخ الفلسفة الغربية، ك١، ص١٧٧.

ئێمەش لەم کتێبەدا هەوڵ ئەدەین نموونەیەکی گشتی فەلسەفەی ئەفلاتون پێشکەش بە خوێنەر بکەین و لایەنەکانی تری بەرهەمەکانی کە پەیوەندییان بە ئێمەوە نییە ئەخەینە پشتگوێ

## تیوری زانین

ئەفلاتون هەروەك لە بەرهەمەکانیدا دەرئەکەوێ کتێب و نووسینی تایبەتی بۆ ئەم تیورە تەرخان نەکردووە، بەڵکو ئەم لقە بە پەرشو بڵاوی لە چەند بەرهەمێکیدا دەرئەکەوێ کە ئەمانەن و زۆربەیان کراون بە عەرەبی:
جمهوریەت، فیدون، تیاتیتوس،... لێرەوە پەنا بۆ دوو چەشنە سەرچاوە ئەبەین، بەرهەمەکانی خۆی و نوسینی ئەو شارەزایانەی لەسەر ئەفلاتون نووسیویانە . لە جیهانی فەلسەفەدا ئەفلاتون دوو ڕێبازی لەبەردەستا بوو، ڕێبازی هیراکلیتس، کە بریتییە لە گۆرانی بەردەوام و هەمیشەیی( هەموو شتێك ئەگۆرێ هیچ شتێك هیچ ساتێك لەسەر یەك شێوە نامێنێ).
دووەم ڕێبازیش فەلسەفەی پارمەندیس بووە، هەموو جۆرە گۆڕانێك ڕەت ئەکاتەوە بڕوا بە وەستان و نەگۆڕان و بوونی ڕووت هەیە و (بوون هەیە و ناگونجێ نەبێ...)
بەم پێیە لە لای هیراکلیتس هەست و لە لای پارمەندیس ئەقڵ سەرچاوەی هەموو زانینێکن. ئەفلاتون هەردوو ڕایەکەی لێکداوە و هەر یەکەی لە مەیانێکدا بەکار هێناوە... لە مەیانی جیهانی هەست پێکراودا ڕای هیراکلیتس و لە مەیانەی جیهانی مەعقول[1] دا ڕای پارمەندیسی پەسەند کردووە...
وەك ئاشکرایە ، ئەفلاتون بوون ئەکات بە دوو بەشەوە، بەپێ بوونی دوو جیهانەکەی سەرەوە یەکیان ئەگۆرێ و بە هۆی هەستەکانەو( کە ئەوانیش ئەگۆڕێن) ڕێی پێ ئەبرێ.جیهانی دووەمیش جیهانی بیری ڕووتەو نموونەی بەرزە لە گۆران بەدوورە و بەهۆی ئەقڵی ڕووتەوە ئەزانرێ. جیهانی یە کەم سێبەر و لاسایی کرنەوەی جیهانی دووەمە... جا بۆ ساخکردنەوەی ئەم ڕێبازەو گەیشتنە ئەم ئەنجامە لە جیهانی دووەمدا ڕای هیراکلیتسی ڕەتکردەوە و پەنای بردە بەر ئەقڵ.

---

[1] بروانە : افلاطون: الجمهورية، ك٦، ص٤٢٩-٤٣٠،ترجمة : فواد زكريا.

بەلای حەکیمی ئیلاهییەوە ئەو شتانەی ئێستا ئەیزانین هەر لە زکماکەوە واتا پێش لە دایك بوونمان زانیومانن و ئێستاش بەهۆی شتی ترەوە بیرمان ئەکەونەوە و دینەوە یادمان، جا بۆیە زانین( وەبیر هاتنەوە ژیانی پێشوویە) [1] خۆز ئەگەر منداڵێك یان کەسێك کە ئەندازەی نەخویندبێ و پرسیاری لێ بکەین و وردەوردە یارمەتی بدەین ئەگاتە ئەنجام و بەڕاستی وەلامی پرسیارە کە ئەداتەوە کە لەسەر ئەندازەبووە. ئەمەش لەوەوە هاتووە نەفس( دەروون) پێش ئەوەی بچێتە بەر لەشەوە لە جیهانی نموونەی بەرزدا بووە بە تەماشاکردنی لە جیهانی مەعقول بەختیار بووە، شتی زانیوە، توانای بینینی لە ئە ندازە بەدەر بڕی کردوە، بەلام هەڵەی کردووە و فڕێ دراوەتە ناو جیهانی ئێمە( جیهانی هەست پێکراو) کەوتۆتە ناو لەشەوە و لەشی ئادەمیزادی هێناوەتە جوولە هەروەك بەردێك فرێدەدەیتە ناو گۆمێك ئاوەوە... لەشیش بەندیخانەی نەفسە و ئەو فرێدان و هاتنە خوارەوەشی کە سزادانی بووە هەموو شتێکی لەبیر بردۆتەوە و ئێستاش چاومان بە شت ئەکەوێ شتە کۆنەکەمان بیر ئەکەوێتەوە.

کەواتە ئەم نەفسە چۆن لەم سزایە دەربازی ئەبێت؟ ئێمەی گیانلەبەری لە مادده دروستکراو چۆن نموونەی بەرزو جیهانی ئەقڵیی ئامادە ئەناسین؟
لە ولامدا فەیلەسوفی ئیلاهیی ئەڵێ :
بە پەروەردەی تایبەتی و هەردوو دیالێکتیکی بەرەو خوارو بەرەو سەر زانینی ئادەمیزاد بەرەو سەروو هەنگاو ئەنێ و ئەگاتە ئەو ڕادەیەی پەی بە زانینی ئەم جیهانە بەرێت و نە فسیش بگەرێتەوە دۆخی جارانی. " ئەقڵ بەم ڕێبازە لە جیهانی هەست پێکراوە بەرەو جیهانی ئەقڵیی بەرزئەبێتەوە، تائەگاتە قۆناخێك ڕاستەوخۆ بەبینینی نموونەی بەرزوخێرو بوونی ڕووت شاد ئەبێت..." .
کەوابوو لەم مەسەلەیەدا دوو ڕێگا لەبەردەم ئەقڵدا هەیە پێیاندا ئەڕوات:

- تەرکیبی یاخود تێکەڵکیش لە هەنەدەکییەوە (جزئی) بەرەو هەمەکی( کلی) و نموونەی بەرز ئەچێ.
- شیکرنەوەوی (تەحلیلی) یە کە لە نموونەی بەرزەوە سەرە ژێر ئەبێتەوە.

---

[1] افلاطون : فيدون، ص٣٨و٣٩، ترجمة و تحقيق،د.علي سامي النشار وعباس الشربيني ، القاهرة، دار المعارف بمصر١٩٧٤.

لەم دوو پرۆسێسدا ئەقڵ بە بەهیچ جۆرێك پەنا ناباتە بەر هەست (حەواس) چونکە ئەم کەرەسەیە درۆزنەو هیچ جێگای دڵنیایی نییە[1] بۆ پتر ڕوونکردنەوەی ئەم کێشەیە ئەفلاتون نموونەی ئەشکەوت ئەهێنێتەوە و ئەڵێ:

وای دائەنێین تاقمە کەسێك لە سەرەتای لە دایك بوونیانەوە لە ئەشکەوتێکدا کۆت و پێوەند کراون، ناتوانن بە هیچ لایەکدا جوولە بکەن و ئاوڕ بدەنەوە . لە دەرەوری ئەشکەوتەکە و لە جێگایەکی بەرزدا ئاگرێك کراوەتەوە، لە نێوان ئاگرو ئەشکەوتدا ڕێگایەك هەیە، خەڵکی پێدا هاموو شۆ ئەکەن، تیشکی ئاگرەکە وا ئەکات سێبەری ئەو کەسانەو ئەوشتانە پێیانە لە دیواری ئەشکەوتەکەدا بدات و خەڵکی ناو ئەشکەوتەکە ببینن، خەڵکی ناو ئەشکەوتەکە وا ئەزانن ئەو سێبەرانە شتی ڕاستەقینەن چونکە لە سەرەتای ژیانیانەوە لەگەلیاندا ڕاهاتوون و شتی تریان نەدیوە...[2] خۆ ئەگەر یەکێك لەو بەندکراوانە بەرەڵڵا بکەین و بیهێنینە دەرەوە، ئەبێ چی بەسەر بێت ؟ چی ئەبینێ؟ یەکسەر ئەحەپەسێ و تیشکی ئاگرەکە ئازاری چاوی ئەدات، چونکە هەر لەگەڵ دیتنی سێبەری شتدا ڕا هاتووە.

بەڵام وردە وردە ئەو کەسە لەگەڵ شتە ڕاستەقینەکاندا ڕادێت و ئینجا ئەتوانی نەك هەر تەمەشای ئاگرەکە بکات بەڵکو ئەتوانی سەرنجی خۆریش بدات کە سەرچاوەی هەموو ڕووناکییەکەو خێری ڕووتە... ناو ئەشکەوتەکە جیهانی هەست پێکراوی درۆزنە، دیتنی سێبەرەکان زانینە بەهۆی هەستەکانەوە، ڕزگاربوون لەم جیهانە تەنیا بەهۆی دیالێکتیکەوە شان بەشانی پەروەردە ئەبێ، شتە ڕاستەقینەکانیش نموونەی بەرزن و خۆر بەرزترین نموونەی خێرو چاکەو سەرچاوەی بوون وکاملییە.

لە دوای ئەم نموونەیە ئەتوانین هەنگاوێك بەرەو پێش بهاوێژین و بڵێین بە باوەڕی ئەفلاتون زانینی ئادەمیزاد بە چوار قۆناخدا تێئەپەرێ تا ئەگاتە ( قۆناخێك) ڕاستەقینەی ڕووت ئەزانێ و ڕێی پێ ئەبات و پەردەی گومان لا ئەبردرێت:

ئەو چوار قۆناخە کە مێشك و بیری ئادەمیزاد پێیاندا تێئەپەرێ بەرەو جیهانی ئەقڵیی ئەمانەن:

- هەست .
- بڕوا یاخود باوەڕ.
- تێگەیشتن.

---

[1] افلاطون: تیاتیتوس او فی العلم ص٦١.

[2] افلاطون: الجمهورية، ص٤٣٢-٤٣٣.

• ئەقڵی ڕووت یان زانیینی نموونەی بەرز[1].
بە باوەڕی ئەفلاتون هەست یەکەم قۆناخی زانیینە، بەڵام دڵنیایی لەم زانیینە ناکرێ چونکە هەست ئەگۆڕێ و هەر شتێکیش بگۆڕێ دروزنە( ئەگەر سوقرات نا ساخ بێ ئاو لە دەمیدا تاڵەو کە ساخیش بوو تامەکەی لە دەمیدا خۆشەو تاڵ نییە).
سەبارەت بە بڕواش هەمان شت ئەیگرێتەوە ...بڕواو باوەڕ پەیوەندیان بە شتی نەگۆڕاوەوە نییە و بە پێ ی بابەتەکە ئەگۆڕێن و خۆیشیان پەیوەندیان بە ماددەوە هەیە و هیچ کاتێك لەسەر یەك شێوە نابن و ئەم شتەی لەم قۆناخەدا ئەیزانین ناتوانیین بە باشی هۆیەکانی بۆ خەلکی تر ڕوون بکەینەوە بۆ ئەوەی پێیاین بسەلمێنیین ... لە قۆناخی سێیەمدا ئەفلاتون سیستەمێکی تایبەتی خوێندن و پەروەردە پێشنیار ئەکات کە تیایدا ژمێرەو ماتماتیك و ئەندازەو فەلەك و مۆسیقا ئەخوێندرێ و ئەم بابەتانە پلەیەکی تر نەفسی ئادەمیزاد بەرز ئەکەنەوە...لە قۆناخی چوارەمدا نەفس لە چەپەڵی ماددە دەربازی ئەبێت و ئەو کەسە کە (فەیلەسوف) بە زانین و بینینی جیهانی عەقڵی و ( بیری ڕووت ) شاد ئەبێت .
ئەفلاتون وەك فەیلەسوفێکی ئایدیالیست ( بگرە داهێنەری ئەم ڕێبازە) بە هەموو توانایەکیەوە (هەست و تاقیکردنەوە) وەك کەرەسەو ئامرازی و ڕێگای زانیین ڕەت ئەکاتەوە و بە توندی پێ دائەگرێ و ئەڵێ ئەقڵ، بە تەنیا ئەقڵ و بیر سەرچاوەی بێگەردو گومان لێ نەکراوەی زانیینن...
چونکە ( هەروەك خۆی ئەڵێ) هەست درۆزنەو لە دەرەوە شت بە بچوکی و لە نزیکەوە بە گەورەیی ئەبینێ یان سەراب لە بیابان ئەبینین و وا ئەزانین ئاوە و هەر ئەڕۆین و نایگەینی. ئەفلاتون دوای کۆششێکی زۆر گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە ماتماتیك و لقەکانی بە باشترین مەیداین زانیین دابنێ[2]، کە هیچ گومانیات لێ ناکرێ...هچ کەسێك ناتوانێ بڵێ (٢+٢) ناکاتە چوار و سێگۆشەیەك هەموو کاتێ (١٨٠) دەرەجەیە جا بۆیە وتوویەتی هەرچی ئەندازە نەزانێ با نەیەتە لامان.
لە سەرێکی ترەوە وردتر سەرنجی قسەو نموونەکانی ئەفلاتون بدەین و لایەنە ئایدیالیستییەکەی پشت گوێ بخەین کە جیهانی نموونەی بەرزو بیرو ماهییەتە[3]

---

[1] افلاطون الجمهورية ،ل ٤٥٩.

[2] هانز ريشنباخ: نشاة الفلسفة العلمية، ص٣٨، ترجمة:د.فواد زكريا، القاهرة، دارالكتاب العربى للطباعة و النشر١٩٦٨.

[3] الدكتور ياسين خليل: منطق المعرفة العلمية، ص١٨١،ليبيا١٩٨١.

ئەبینین کە هەنگاوێکی دلێرانەی بەرەو پێش هاوێشتووە ئەویش پەنا بردنە بەر ماتماتیکە وەك بابەت و زانستێك.

خۆ ئەگەر ئەو جیهانەی سەرەوە بگۆڕین بە پلەو قۆناخ و ئاستێکی ڕووتی بیری زانستییانە ئەوا ئەوەندەی تر ئەفلاتون لە تیورییەکانی فەلسەفەی هاوچەرخ و بیری هەندێ زانایانی فیزیك نزیك ئەبێتەوە...چونکە ئەو زانایانە بە جۆرێك سەرنجی زانیین زانستییانە ئەدەن کە ئایا تا چ ڕادەیەك ئەو موعادەلەو بیرو زانیینە لە ماددەوە دورە و تا چەند پەیوەندی بە واقیعەوە هەیەو جۆری ئەم پەیوەندیە چۆنە.

## بوون و گەردوون

هــەروەك لەمەوبــەر بۆمــان دەركــەوت مەســەلەی سروشــت و گــەردوون و بــوون جێگایــەكی یــەكجار شــیاوو بایەخــداریان لــە بەرهــەمی فەیلەســوفەكانی یۆنانــدا هەبووە... هەر فەیلەسوفەش بە پێی بۆچونی خۆی ئەم مەسەلانەی دەست نیشان كــردووە هــەڵی ســەنگاندوون. دەربارەیــان دواوە، خــەریكی كردنــەوەی گــرێ كوێرەكانیان بووە.. سەیریش نییە كە فەیلەسوفەكانی سەدەی پێنجەم و شەشەمی بــەر لــە زایــین بــە كۆسمۆلــۆجی نــاو بــراون. ئەرســتۆ دەریــای زانــست ئــەڵێ: فەیلەسوفەكانی یۆنان لە قۆناخی پێش سوقراتدا باسی( ئەو كەرستانەیان كردووە كە هەموو شتێكیان لێ پێك دێت...)
هەموو شتێكیان لێ دروست ئەبێت)[1]
زانای یۆنانی لەم قسەیەدا مەبەستی لەم چوار كەرسەیەیە كە فەیلەسوفەكانی پێوەی خەریك بوون و ئەمانەن( مبدا، ماهییەت، ڕەگەز، گەردوون) .... وە ئەوەی بە لای ئێمەوە مەبەستە وشەی گەردوونە.. با بزانین لە لای یۆنانییەكان گەردوون چۆن لێكدراوتەوە بە چی دانراوە؟ بە پێی ئەو نووسراو و بەرهەمانەی لە پاش فەیلەسوفە كلاسیكیەكانی یۆنان بەجێ ماون وشەی گەردوون یاخود_ سروشت_ ئەو كۆمەڵە شت و بوونانە ئەگەیەنێ كە لە جیهانی مەوزوعیدا هەن واتە وشەی سروشت پڕ بە پێستی وشەی گەردوونە[2] . وە مەبەست لە بوونیش بوونی گشتی و ئافەریدە كارە (الخالق) كە ئەفلاتون بە دروستكار (الصانع) و ئەرستۆ بە هۆی یەكەم یاخود( ئەو بزوێنەرەی كە خۆی ناجولێتەوە) ی دا ئەنێ ئەفلاتون دیالۆگی (تیماوس) ی بۆ باسكرنی سروشت و گەردوون تەرخان كردووە و قسەكەری دیالۆگیش تیماوسی قوتابی ڕێبازی فیتاگۆرسە. شارەزایان لەو باوەڕەدان كە هەڵبژاردنی تیماوس بۆ ئەم شانۆو مەبەستە، نیشانەی ئەوەیە كە فیتاگۆریزم و ماتماتیك چەندە كاریان كردۆتە سەر بیرو فەلسەفلەی ئەفلاتون... كەواتا چۆن سروشت دروست بووە؟ بۆ ئەم شیوەو ڕووخساری ئێستای وەرگرتووە كە هەیەتی؟ جیهان كۆنە یا نوێیە؟ پەیوەندی بوون كات و بزوتنەوە بە یەكترییەوە و چۆنەو چییە؟
بە ڕای ئەفلاتون بوون بە تێكرای ئەكری بە دوو بەشەوە:

---

[1] Aristole: meta physica.1014 b-150

[2] عبدالرحمان بدوی: خریف الفكر الیونانی، ص١٦٣، القاهرة، ط٤، مكتبة النهضة المصرية.١٩٧٠

**یەکەم:** جیهاتی نمونەی بەرز، لە گۆڕان و مادەوە دوورە.

**دووەم:** جیهانی هەست پێکراو، کە جیهانی ئێمەیە و ئەگۆڕدرێ و مادەیەو لەسەر یەك شێوە نامێنی. ئنجا هەمان دووەلیز [*] ئادەمیزادیش ئەگرێتەوە کە لە دوو بەش پێك هاتووە:"

**نەفس** : گەوهەرێکی ڕووناك و بێ گەردەو لەمادەوە دوورە.

**لەش:** ماددەیە و هۆی چەوتی و چەپەڵییەو نەفسی تێدا بەند کراوە، ئەفلاتون ئەم پێشەکییە ئەکات بە بەردی بناخەی فەلسەفەی سروشت و ئەڵێ: لەبەر ئەوەی ئەو جیهانەی ئێمە تێیدا ئەژین جیهانێکی هەست پێکراو و ماددەیەو ئەگۆڕدرێ و لەسەر یەك شێوە نامێنێ ئەوا ناگونجی( ئەزەلی) بێت.

بەڵکو ئەبێ لەکاتێکی دیاریکراودا دروست کرابێ [1].. وە ئەبێ دروستکار دروستی کردبێت لەبەر ئەوەی دروست کار خێری ڕووتەو لەکەم و کوڕی و کینەوە دوورە ویستوویەتی جیهان لەسەر شێوەی بونێکی هەرە کۆن دروست بکات و لە خۆی بچێ... کەوابوو جیهان و سروشت یەك جیهان و سروشتن چونکە دروستکارەکەی یەکێکەو بوونێکی دیارکراوی هەیە هیچ شتێك لە دەرەوەی دا نیە تا بتوانێ کاری تێبکات و توشی پیری و نەخۆشیش نابێت.... شیوەکەشی بازنەییە چونکە بازنە تەواوترین شێوەیە. وە لە جێگای خۆیدا بە ڕێکو پێکی بە دەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوە.
(گیان) نەفسی جیهان، لە پێش لەشەکەیەوە دروستکراوە... خوا لە دوو گەوهەر بۆی دروست کردووە[2] ... ئەو نەفسەش دەوری جیهانی داوەو ڕەگ و پەلی کوتاوەتە ناویەوە ئاراستەی بەرەو پێش چوونی ئەکات... دوو گەوهەرەکەش، گەوهەری هەمیشەیی نەگۆڕاو و گەوهەری ناسادەو دروست بووی دابەش بووی سروشتە...هەردوو کیانی تێکەڵاو کردووە و جۆری سێیەمی لێ دروست کردووە کە لە نێوان هەردوکیاندا یە ئینجا هەرسێکیانی تێکەڵاو کردووە و وێنەیەکی لێ دروست کردن. خۆشی و ناخۆشی و ترس و کینە و خەمباری کار ئەکەنە سەر نەفسی گەردوون...ئەگەر نەفسی گەردوون لە یاسای ئەقڵ و سەرکێشیی کرد، بزوتنەوەکەی

---

* ثنائی، وشە بیانیەکەی لە کوردییەوە نزیکە دووەلیزم.

1 افلاطون:طیماوس واکریتیس،ص٣١١، ترجمة الاب فؤادجرجی بربارة. دمشق١٩٦٨

2 افلاطون: طیماوس،ص٢٢٢،(٢٥٥و٣٥)

ئەشێویٚ و تێك ئەچێت و نەگبەتی و قاتو قڕی و گرانی بەسەر گەردووندا دێت.
لەبەر ئەوەی سروشت دروست کراوەو ئەبینریٚ و هەست بە بوونی ئەکرێت و لەشی هەیە و دروستکار لە سەرەتادا لە ( ئاگرو گڵ) [1] دروستی کرد، بۆ ئەوەی بە ئاگرەگە ڕووناك و بە گڵەکەش لوس و نەرم بێت، بەلاّم وەك ئاشکرایە گڵ و ئاگر بەیەکەوە نالکێن و یەك ناگرن بۆیە دروستکار بەڕادەیەکی دیاری کراو ئاوو هەوای خستە ناویانەوە ئەم ڕادەیەش بەم شێوەیە بوو:
ڕادەی هەواو ئاگر ئەوەندەی هەواو ئاو بوو، ڕادەی هەواو ئاو ئەوەنەدەی ڕادەی ئاو لەگەڵ گڵ بوو[2] ... بەم پێیە لەشی جیهان لەم چوار مادیە دروست بوو، دروستکار بەیەکەوەی لکاندن و گونجاندنی ئەمەش وای لە سروشت کرد کە پتەو قایم بێت و لە دروستکار بەو لاوە هیچ هێزێکی تر زەفەری پیٚ نەبات.
ئایا بۆچی دروستکار سروشتی دروست کردووە؟ نهێنی ئەم دروستکردنە چییە؟ ئەگەر سروشتی دروستکرد کات هەبوو یان نا؟ بۆچی لەکاتێکی تایبەتیدا سروشتی دروستکردوو لە کاتێکی تردا دروستی نەکرد؟ ! ئەفلاتون بەم شێوەیە وەلاّمی ئەم پرسیارانە ئەداتەوە:
لەبەر ئەوەی دروستکار چاکەو خێرو کاملییە، سیستەم و ڕێکوپێکی لە ئاژاوە بە باشتر زانی... وای بەباش زانی کە مادەی شێواوو تارێك ڕووناك و ڕێك بخات و سیستەمی بخاتە ناوەوە، ئەم سیستەمەش بوون و جیهان بگرێتەوە... بۆ دروستکردنی جیهانیش وەك ئەندازە، نموونەی بەرزی بەکار هێنا بۆ ئەوەی لەسەر شێوەکەی دروستی بکات...
هەروەها ئەفلاتون ئەڵیٚ :
کاتیٚ دروستکار دەست کردەکی خۆی بینی کە زیندووە و ئەجولێتەوە شادمان بوو...ویستی کاملٚ تری بکات بۆ ئەوەی بێتە سەر شێوەی گیانلەبەرێکی هەرە کۆن و ئەزەلی، بەلاّم ئەمە نەگونجا چونکە بە تەنیا نموونەی بەرز ئەزەلییە. ئینجا هەوڵی دا فۆرمێکی جولاوەی هەرە کۆن دروست بکات.... ئەوە بوو خوا جیهانی دروستکردو ئەو فورمەشی داهێناو ڕێکوپێکی و سیستەمی خستە ناو ئەستێرەکانی

---

[1] افلاطون: طيماوس،ص٢،٢١٥-٣١.

[2] افلاطون: طيماوس، ص٢١٦-٣٢.

ئاسمانەوە و وای لێکرن بە شێوەی( ژمارە) بجولێنەوە، ئەم وێنەیەش ئەمرۆ بە کات (الزمن) [1] ناو ئەبرێن. ئەو سەردەمەش شەوو ڕۆژو مانگ و ساڵ نەبوون چونکە ئەوانیش لەگەڵ پەیدابوونی کاتدا هاتنە کایەوە.

چون و بۆ ئەستێرە دروست بوون؟! ژمارەیان چەندە؟ پەیوەندیان بە جیهانی مەوزوعییەوە چییە؟ کاتێك نەفس ئەبزوێ گەردونیش دەست بەجولآنەوە ئەکات ... لەبەر ئەوەی گەردوون بە حەوت لادا ئەسوڕێتەوە.. دروستکار حەوت ئەستێرەی گەڕۆکی دروست کرد کەبەدەوری زەویدا ئەسوڕێنەوە ئەمانەن: خۆر، مانگ، زوهرا،عەتارد، مەریخ، مشتەری، زوحەل.

لەمەوبەر وتمان ئەفلاتون دروستکار بە خوا ناوئەبات و لە چەند شوێنێکدا لە بەرهەمەکانیا دوبارەی ئەکاتەوە... بەلآم ئەبێ ئەم دروستکارە چی بێ؟ چۆن بۆمان ساخ ئەبێتەوەکە هەیە؟ کۆنە یا نوێیە( ئەزەلییە یا نا؟) واتا بوونێکی تر لەپێش ئەودا هەبووە یا نا؟ خاوەنی ئەکادیمیا لەم بارەیەوە ئەڵێ: دروستکار نابێ کۆن بێت بەڵکو ئەبێ ئەزەلی و لە هەرە کۆنەوە هەبووبێ و هیچ شتێك لەو کۆنتر نەبێ چونکە ئەکەر هەر تەنیا خۆی کۆن نەبێ نابێ بە دروستکار Demirgos. ئەگەر نوێ بێ ئەبێ لەکاتێکی تایبەتی و دیاریکراودا هاتبێتە کایەوە و ئەبێ لەکاتی دیاریکراوشیدا نەمێنێ چونکە ئەوەی سەرەتای هەبێ ئەبێ کۆتایشی هەبێ.... کەوابوو دروستکار لە هەرەکۆنەوە هەر هەبووە و هەر ئەشمێنێ لە گۆڕان و لەناوچوون دورە... ئەفلاتون ئەڵێ ئێمە چەند بەڵگەیەکمان لەبەر دەستدایە هەبوونی دروستکار ساخ ئەکاتەوە وەك:

- بەڵگەی بزوتنەوە.
- بەڵگەی سیستەم( ڕێك و پێکی).

فەیلەسوفی ئیلاهی لەیەکەم بەڵگەدا ئەڵێ.. جیهان تابلۆیەکی جوانی هەنەرمەندییە.. ئەو سیستەم و جوانی و ڕێکوپێکییە کە لە گەردوندا هەیە نا گونجێ لە خۆیەوە دروست بووبێ.... بەڵکۆ ئەبێ هۆیەکی هەبێت.. ئەم هۆیەش ئەم ڕێکوپێکی و سیستەمەی داناوە ئەقڵێکی کاملی خێری ڕووتەو لە شەڕو خراپەو کەم و کوڕییەوە دوورە.

---

[1] افلاطون: طیماوس،ص ٢٢٨-٢٧، چەند شوێنێکی تریش.

هەموو شتێکی بۆ مەبەستی تایبەتی دروست کردوو... ئەم هۆیەش دروستکارە[1]، لەدووەم بەڵگەشدا ئەڵێ: حەوت جۆروە جولانەوە هەیە لەپێشەوە بۆ دواوە ، لە دواوە بۆ پێشوە، لە چەپەوە بۆ ڕاست، لە ڕاستەوە بۆ چەپ. لەسەروە بە خوارەوە ، لە خواروە بۆ سەرەوە، حەوتەمیش بزووتنەوەوی بازنەییە[2]...جیهانیش بە شێوەی بازنە ئەسوڕێتەو ئەم جولانەوەی جیهانیش هۆیەکی هەیە کە وای لێ کردووە بەم شێوەیە بجولێتەوە و جۆرە جوولانەوەکانی تری لێ قەدەغەکراوە[3]، ئەم هۆیەش دروستکارە.

لە کۆتایدا بە باوەڕی ئەفلاتون دروستکار دەوری دانانی ڕێکوپێکی بووە لە ناو سروشتی شێواوو پڕ لە ئاژاوەدا سێ بوونی هەرە کۆن هەن کە ئەمانەن: دروستکار، نەفس، ماددە. نەك ماددەی ئاسایی بەڵکو شێوەیەکی تایبەتی کە ئەفلاتون باسی کردووە.

## تیوری نموونەی بەرز

ئەفلاتون لە کۆتایی کتێبی شەشەمی جمهوریەتدا( بوون) ئەکات بە دوو بەشەوە

- جیهانی هەست پێکراو.
- جیهانی عەقڵیی.

جیهانی یەکەم ماددەیەو دروزنەو ئەگۆڕدرێ... لە بەرامبە رئەم جیهانەدا جیهانی ڕاستەقینە هەیە کە لەماددەوە دوورەو دەستی شێواندن و گۆڕان نایگاتێ ئەویش جیهانی عەقڵییە.. جیهانی( نموونەی بەرزە) ئەو جیهانەی ئێمە تیایدا دەژین سێبەرو لاساییکردنەوەی جیهانە ڕاستەقینەکەیە.. کەوابوو با بزانین نموونەی بەرز چییە کە ئەم جیهانەی لێ پێك هاتووە.

ئەگەر بپرسین بڵێین جوانیی چییە؟ درۆ نییە لە وەلامدا بڵێیی ئەو خاسییەتەیە کە لەو کچە جوانەو ئەو گوڵەو ئەو دیمەنەو ئەو باڵندەیەدا هەیە...

بەلام ئێمە لێرەدا لەو وەلامە جوانی تاك و هەندەکی (جزئ) یمان بیست نەك جوانی هەمەکی ... دیسان لە وەلامدا ئەڵێین نموونەیەکی بەرزی جوانیی لە جیهانی عەقڵییدا هەیە کە جوانە تاکەکانی ئەم سەر زەمینە ( گوڵ و کچ و دیمەن و باڵندە)

---

[1] یوسف کرم: تاريخ الفلسفة الايونانية. ص٨١.

[2] افلاطون: طيماوس، ص٢٤٨-٤٣.

[3] افلاطون: طيماوس واكريتس، ص٢١٩-٢٤٠.

کۆ ئەکاتەوەو ئەوان لاسایی و سێبەری ئەو نموونەیەن. ئەوەش سەبارەت بە چاکەو ئازایەتی و دادپەروەریی و ئادەمیزاد و ئەسپ و پشیلەو ئاژەڵ کە هەر یەکە لەو جیهانەدا نموونەیەکیان هەیە و بوونە تاکەکان لاسایی ئەکەنەوە...

وتمان ئەم جیهانە لە مادەوە دوورە ئێمەیش وەك گیانلەبەرێکی لە مادە پێك هاتوو چۆن ئەتوانین ئەم جیهانە ڕاستەقینەو ئەم نموونە بەرزانە بزانین؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەفلاتون ئەڵێ بە هۆی دیالێکتیکەوە ئەتوانین ئەم بوونانە بزانین و نەفسیش پێش ئەوەی بێتە بەر لەشەوە خۆی لەم جیهانەدا ژیاوەو لەوێ هەموو شتێکی بەدی کردووە بەڵام بە هۆی فرێدانییەوە بۆ ناو لەش، وەك سزایەك ئەم شتانەی لەبیر چۆتەوە ئێستا ش کە تاکە ئەسپێکی هەست پێکراو ئەبینێ وردە وردە نموونەی بەرزی ئەسپی دێتەوە یاد.. لە دواییدا ئەفلاتون باسی تیوری ئەشکەوت ئەکات [1] و ئەڵێ : هەموو شتێك کە ئێمە لەم جیهانەی خۆماندا ئەیبینین نموونەیەکی بەرزی هەیە کە لە جیهانی مەعقوڵدایەو پەیوەندی ئەم بوونە هەست پێکراوە لەگەڵ نموونەی بەرزەکەی لە مەسەلەی (یەکسانی ماتماتیك) ئەچێ ... بەم پێیە ئەم بوونە ناڕاستەقینەیە سەرچاوەو بوونی خۆی لە شتە ڕاستەقینەکەوە وەرئەگیرێ.و لاسایی ئەکاتەوە بە بێ ئەوەی پێی بگات...

جا بۆیە ئەگەر بمانەوێت باسی هەرشتێك بکەین ئەبێ وردبین و وشەی ڕاستی بۆ هەلبژێرین... هەروەك ئەگەر چاومان بە ئاگر کەوت نابێ بڵێن ئەوە ئاگرە بەڵکو بڵێین ئەمە لە ئاگری ڕاستەقینە ئەچی کە نموونە بەرزەکەیتی ...

ئەرستۆی زانا بە توندی هێرش ئەباتە سەر ئەم تیورەی ئەفلاتون و ئەڵێ: ئەفلاتون چاکی بۆ نەچووەو نموونەی بەرزیش دەورو کاریگەریەکیی ئەوتۆی نییە و کار ناکاتە سەر تاکەکانی چونکە پزیشك کە ئادەمیزادە، نەك نموونە بەرزەکەی، خەڵکی چاك ئەکاتەوە و زانا شت دا ئەهێنی نەك نموونەکەی، لەگەڵ ئەمەشدا تەندروستی و زانستیش هەن و بوونیان هەیە [2] .

ئەگەر ڕاستیش بێت دوو شتی لەیەك چوو نموونەی بەرزیان هەبێ ئەوا ئەبی نموونەی بەرزەکەو دوو شتەکەی تریش نموونەی بەرزی دووەمیان هەبێ و بەم شێوەیە تاوەکو هەتا هەتایە کۆتایی نایەت.

هەرچەندە ئەم تیۆرەی ئەفلاتون کەم و کورِیی و کەلەبەری تیادایە ئەوا دوو لایەنی قوڵی هەیەو پێویستە باسیان بکەین:

- لایەنی لوجیکی.

---

[1] افلاتون: الجمهورية، ترجمة د. فواد زكريا، الهيئة ا لمصرية، العامة للكتاب-القاهرة-١٩٧٤.

[2] ارسطو:علم الطبيعة، ص٢٤٤،ك٢، ب٩، ف٦، ترجمة: احمد لطفي السيد.

- **لایەنی میتافیزیقایی[1].**
- **لە لایەنی یەکەمان ئەڵێین : ئەگەر بڵێین پشیلە مەبەستمان لە چییە؟ بێ گومان وەك زاراوەو وشەیەکی گشتی لە یەکەم جاردا پشیلە ناگرێتەوە، وەك گیانلەبەرێك، بەڵکو نموونەی بەرزو گشتیەکەی ئەگرێتەوە، وە گیانداریش کاتی ئەبێ بە پشیلە کە خاسیەتی ئەم پشیلەی تێدابوو... خۆ ئەگەر ئەم وشەیە واتایەك بەدەستەوە ئەوا تەنیا مەبەست لەو پشیلە ڕەشەو ئەم پشیلە سپیە نیە بەڵکو مەبەست لە ماناو خاسیەتی گشتی پشیلەیە کە لە هەموو پشیلەیەکدا هەیە بە مردنی ئەم پشیلەیەو ئەو پشیلەی تر لەناو ناچێ هەر ئەمێنێتەوە و لەشوین و کاتێکی تایبەتیشدا نییە[2]. سەبارەت بە لایەنی دووەمیش کە میتا فیزیقیایەکەیە وشەی پشیلە مانای گشتی نموونەی پشیلە ئەداتە دەست کە ئەویش نموونەی بەرزی پشیلەیەو هیچ جۆرە تاکە پشیلەیەك لە وێنەی نییە وەك ئەفلاتون ئەڵێ دروستکار دروستی کردووەو کە بە چاو ئەیانبینین... وەك ئەو تاکە پشیلانەش کە هەن بە پێی دوور و نزیکیانەو لە نموونەی بەرزی پشیلە لە کامڵیەوە دووره یاخود نزیك ئەبن، نموونە بەرزوەکە ڕاستەقینەیەو تاکەکانیش ڕواڵەت و ڕوخسار و لاسای کرنەوەن[3] .**

---

1 **برتراند رسل: تاریخ الفلسفة الغربیة، ك١، ص٢٠١.**

2 **دیسان ئەرستۆ ڕەخنە لە ئەفلاتون ئەگرێ و ئەڵێ: ئەگەر بوون وەك تاك لەشوێن و بوونی داریکراودا هەبێ بۆ نموونەکەشی لە کات و شوێندا نەبێت.(علم الطبیعة،ك٤ ، ب٤، ص١٨٧، القاهرة١٩٣٥.**

3 **بە باوەڕی ئەفلاتون شت بە سێ جۆر هەیە:**

- **بونێکی واقیعی لە دەرەوەی ئێمەدا وەك هەندەکی... ئەم کتێبە، ئەم پەندانە،**
- **بوونێکی هەمەکی(جنس ونوع) وەك کتێب پەندان، ئەمەش بوونێکی (تصور) کراوە.**

**بونێکی هەمەکی (وەك نموونە ) ئەمەش بونێکی واقیعییە لە دەرەوەی جیهانی هەستپێکراودا، لێرەوە کاتێ ئەفلاتون وتویەتی هەمەکیەکان لە دەرەوەی ئێمەدا بوونێکی واقیعانە هەیە بە ڕیالیست ناوبراوە.**

حەكیمی ئیلاهی دیالۆگی فیدۆنی بۆ نەفس تەرخان كردووە لە بەرهەمەكانی تریشیدا ڕای پەرش و بڵاو لەم لاو ئەولا دەربارەی دەروون بەرچاو ئەكەوێت. بە باوەڕی ئەفلاتون ... ئادەمیزاد لە نەفس و لەش پێك هاتووە.
نەفس پێش هاتنە لەشەوە هەبووە، گەوهەرێكی گیانی ڕووناكەو لەشیش ماددەو شەڕو تاریكیەو نەفسی تێدا بەند كراوە، ڕزگاربوونی نەفس لە لەش بە ڕزگاربوونی لە تاریكی و چەپەڵی ماددەوە ئەبێت . خاوەنی ئەكادیمیا لەو باوەڕەدایە كە نەفس پێش ئەوەی سزا بدرێ و فرێبدرێتە سەر زەمین و ناو لەشەوە، لە جیهانی نموونەی بەرزدا بەختەوەری ژیاوەو نەفس " لە عەرەبانەیك چووە كە دوو ئەسپی باڵدار ڕایناكێشاوەو عەرەبانچییەك لێی خوریوە " [1] بەڵام گوناهو هەڵەی كردوەو لەم جیهانە خۆشە بێ بەش كراوە .. ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە و كە نەفس نامرێ و بە مەرگی لەش نافەوتێ، بەڵكو هەر بەنەمری ئەمێنێتەوە... بۆ ساخكرنەوەی لەم ڕایەشی چەند بەڵگەیەك ئەهێنێتەوە كە گرنگەكانیان ئەمانەن كە باسیان ئەكەین:
بەلگەی دژایتی[2] ئەگەر سەرنجیك لە دەورو پشتمان بدەین بۆمان دەرئەكەوی كە هەموو شتێك دژێكی خۆی هەیەو بوون لە دژەكان (اللاضداد) پێك هاتووە... (ساردو گەرم، مردن و ژیان، خەوتن و خەبەر بوونەوە.... هتد) هەروەها ئەگەر وردبینەوە بۆمان دەرئەكەویْ كە هەر یەكێك لەمانەی لە دژەكەیەوە دروست ئەبیْ... بەخەبەر هاتن لە دوای خەوتنەوە دێت، كە ناشرینی نەما جوانیی لیْ پەیدا ئەبێت. كە نەخۆشی ڕۆیشت لەشی ساخی دیتە كایەوە بە پێچەوانەشەوە ڕاستە... دیسانەوە گەورە لە بچوك دروست ئەبێت و ژیانیش لە مردنەوە پەیدا ئەبیْ... خۆ ئەگەر وا نە بووایە ئەوا بیْ گومان ژین و تاكە زیندوویەك لەم جیهانەدا نەئەما... كەوابوو نەفس پێش لەدایك بوون هەبووە و دوای مردنیش ئەمێنی... بەڵام جیاوازی لە نێوان چارەنوسی نەفسی گوناهبارو چاكدا هەیەو دوای جیابوونەوەی لە لەشی مردووەكە حیسابی خۆی لەگەڵدا ئەكرێت.

---

[1] افلاطون: فايدروس او عن الجمال ، ص٧٠، ٢٤٦، ترجمة الدكتورة اميرة حلمى مطر، القاهرة ط١، دارالمعارف بمصر ١٩٦٩.

[2] افلاطون: فيدون... ص، ٣٥(ضمن سلسلة الاصول افلاطونية، ترجمة: دكتور على سامى النشار وعباس الشيرينى القاهرة. ١٩٧٤.)

**بەلگەی وەبیر هاتنەوە**[1]..

دەربارەی ئەم بەڵگەیە ئەفلاتون ئەڵێ: لەمەوبەر ساخمان کردەوە کە زانیین وەبیر هاتنەوەیە[2]... وەبیر هاتنەوەی ئەم شتانەی لەمەوبەر زانیومانن. چونکە لەمەو بەر نەفس لە جیهانی نموونەی بەرزدا ژیاوەو رێی بەم نموونانە بردووە بەلاّم لەدوایدا فرێدراوەتە خوارەوە و لە لەئەنجامی ئەم سزادانەدا ئەوشتانەی لەبیرچونەتەوە کەئەیزانین... ئێستاش لەم جیهانەدا کەهەندی شت بەدی ئەکات ئەوشتانەی بیر ئەکەوێتەوە کەکاتی خۆی لە جێهانەکەی تردا زانیبونی.

بۆیە ئەگەر نەفس پێش لەدایکبوون و ژیان هەبوبێ ئەوا بێ هیچ گوومانێك دوای مردنیش هەر ئەمێنێتەوەونامرێ.

**بەلگەی بزوتنەوە**[3]: ئەوی هەمیشە خۆی بجولێتەوە ئەبێ نەمر بێ... چونکە ئەوی شتی تر ئەجولێنێتەوە دەبێ خۆشی بەهۆی شتی ترەوە بجولێتەوە و نەمانی بزوتنەوەکەی نەمانی ژیان و خوی ئەگەیەنێ... ئەوی خۆی ئەجولێنێتەوە سەرچاوەو مەبدەئی بزوتنەوەکەی خویەتی و ئەم دووانەش نوێ نین بەڵکو ئەزەلین چونکە نوێ بەهۆی سەرچاوەوە دێتە کایەوە... هیچ شتێکی تر لە پیش مەبدەئەوە نایەت.. بۆیە ئەوشتە دروست نابێ و لە ناو ناچێ... کەوابوو ئەوی خۆی سەرچاوەی بزوتنەوەی خۆیەتی نامرێ و لەناو ناچێ.. خۆ بزواندنیش و سروشت و ماهیەتی نەفسە چونکە هەر لەشێك لەدەروەی خۆیەوە بزوتنەوە وەر بگرێ یان پیێ بگات زیندوو نییە. بە پێچەوانەوە زیندو لە ناخی خۆیەو بزوتنەوەو سەرچاوەی بزوتنەوە وەرئەگرێ نەفسیش بەم شێوەیە کەوابوو نامرێ.

دوای ئەمە ئەفلاتون دێتە سەر ئەوەی کە نەفس سێ کرداری تایبەتی خۆی هەیەو لە سێ هێز پێك هاتووەو ئەمانە بەرامبەر بە چین و توێژەکانی دەولەت دەوەستن(ئەقڵ، تورەبوون، ئارەزوو)[4]... تورەبووون کەوتۆتە نێوان هەردوو هێزەکەی ترەوە و هەریکە بۆلای خۆی رای ئە کێشێ.

بەلاّم ئەقڵ هەوڵ ئەدات لەنگەر لەنێوان تورەبووون و ئارزوو(شەهوەت) دا بگرێ.

---

[1] افلاطون: هەمان سەرچاوە .. ل٣٨و٣٩ .

[2] بروانە تیوری زانیین لە لاپەرە ٢٢٨دا.

[3] افلاطون: فايدروس، ص٦٩ –٧٠، (ە ٢٤٥ء) ترجمة، الدكتورة اميرة حلمى مطر.

[4] افلاطون: الجمهورية... ل٣٢٦-٣٢٨.

زۆر جاریش تووڕەبوون بەلای ئەقلدا ئەشکێنێ.. چونکە ئێمە ئەگەر یەکێك ئازارمان بدات و بزانین ئەو کەسە لەسەر هەقە هیچ پێی سەخلەت نابین!!

## کۆمـــار

کۆمار بەرهەمیکە لە بەرهەمە بایەخدارەکانی ئەفلاتون و وا زانراوە کە لەتەمەنی چل ساڵیدا دایناوە ، بەرهەمەکە بە تێکرایی لە دە بەش پێك هاتووە، خاوەنەکەی هەر بەشەی بە کتێبێك دا ئەنێ.

ئەم کتێبە لە نیمچە ئینسکلۆپیدیایەك ئەچێ، نووسەرەکەی تێیدا ڕەنگی نەخشەی دەوڵەتی نموونەی ڕشتووە. دەوڵەتێك تێیدا ئادەمیزاد بە ئاسودەیی و بەختەوەری بژیاو لە شەڕو شۆڕ دور بێت ئالای دادپەروەری هەمیشەیی بەسەردا بشەکێتەوە....

ئەفلاتون پیش ئەوەی دەست بداتە ئەم پرۆژەیە وتوویەتی: لەمەیدانی کاروباری گشتیدا زۆر تامەزرۆی کارکردن بووم... لە کاروباری ژیانی سیاسی وردبوومەوە .. بەدوای یەکتری دا هاتنی ڕوداوەکان و دەست لە بینە قاقەی یەکتری گیرکردنیان ترساندمی.. هەستم کرد سەرم ئەسوڕێ.. لە دواییدا گەیشتمە ئەو ئەنجامەی بلێم: هەموو ئەو ڕژیمانەی فەرمانڕەوا کە لەم سەردەمەدا هەن، بەبێ جیاوازی ڕژێمی چەوتو خراپن... دەستوورەکانیان ئەوەندە بێ کەلکن بە بێ موعجیزە[1] .. . چاك ناکرێن جا بۆیە گەیشتمە ئەو باوەڕە کە بلێم: بەبێ ئەم دوو ڕێگایە ژیانی بەختەوەر بۆ ڕەگەزی ئادەمیزاد وەدی نایەت " ئەبێ ئەم فەیلەسوفانەی کە بەڕاستی پەیڕەوی فەلسەفە ئەکەن جلەوی حکومڕانیان بدرێتە دەست یاخود چینی فەرمانڕەوا کە کاروو باری سیاسیان بە دەستەوەیە بە موعجیزەیەکی خوایی ببن بە فەیلەسوفی ڕاستەقینە"[2].

بەم پێیە دوای ئەوەی ئەفلاتون دۆخی سیاسی ئەوسای یۆنانی هەڵسەنگاندووە، ئەو دۆخەی سوقراتی دانای کوشت.. ئەو سوقراتەی داپەروەرترین کەس بوو .. ئەفلاتون ڕەنگی نەخشەکەی ڕشت و سیتەمێکی پەروەردەکردنی دانا بۆ ئەوەی فەیلەسوفی کارامە پێ بگات و جلەوی فەرمان ڕەواییان بدرێتە دەست. لەسەرەتای نەخشەکەدا ئەفلاتون بڕ یاری لەسەر سێ خاڵ داوە .. ئنجا هەنگاویکی تر چۆتە پێشەوەو بۆ دانانی بناخەی پرۆژەکەی، سێ خالەکەش ئەمانەن:

---

[1] جورج سارتون: تطور فكر السياسي، ج١، ص٤٤، ترجمة: حسن جلال العروسي، القاهرة.

[2] – افلاطون: الجمهورية، ص٢٧٩، فقرة(٤٧٣) ترجمة ودراسة: د.فوادج زكريا.

•ئەبێ شیرازەی خێزان و مولکداریەتی تایبەتی تێك بدرێت و حوکمڕانی بەیەك جاری بە دەست ئەوانەوە بێت کە خزمەتکردنی گشتی بە ئەرکی سەرشانیان ئەزانن.

•چاك کرنی کۆمەڵ، جا هەر کۆمەڵێك بێ کە بمانەوێ چاکی بکەین بە گۆرینی رەوشت و رەفتارو ئاکاری ئەندام و تاکە کەسانییەوە بەندە..جا بۆیە ئەبێ سەر لەنوێ پەروەردە بکرێنەوەو بخوێنن تاکو زاناو شت زان بن و (فەزیلەت زانینەو رەزیلەتیش نەزانینە).

•کۆمەڵ لە سێ چین پێك هاتووە:

١. فەرمانڕەوا.
٢. پاسەوانان.
٣. کارکەران(کۆیلەکان).

دادپەروەریی لەوە دایە کە هەر کەسە ئەو کارە بکات کە بۆی دانراوە و لە توانایدا هەیە بیکات و ئەبێ پێشی قایل بێ.. چونکە ئەبێ حوکم کردن هونەرو شارەزاییەك بێت پشت بە زانینی ڕاست ببەستێ و کۆمەڵیش بریتی بێ لە ئاڵ و گوڕکردنی شت و مەك و زامن کردنی پێویستیی نێوان تاکە کەسانێك کە بەهرەو شارەزاییەکەیان یارمەتیدەری نێوان یەکترییان بێت[1]... لە لایەکی ترەوە وەك ئەفلاتون خۆی ئەڵێ:
هەموو شارێك لە شارەکانی یۆنانی بریتی بووە لە دوو شار لەناو یەکدا ، شاری دەوڵەمەندو شاری هەژارەکان. ئەو ڕژێمانەی کە لە نێوانیاندا حوکمڕانییان کردووە هەمان پێودانگ ئەیانگرێتەوە و. وەك ئامرازێك خزمەتی بەرژەوەندی چینێکیان کردووە دژی بەرژەوەندی چینێکی تر.. بۆنموونە : " لە ژێر سێبەری ڕێژیمی دیموکراسیدا هاولاتییان تەنیا چاویان بەو پارەیە پڕ نەئەبۆوە کە لە خەزێنەی دەوڵەت وەریان ئەگرت.. بگرە بۆ تالانکردنی دەوڵەمەندەکان و داگیرکردنی موڵك و ماڵیان دەسەلاتی سیاسی خۆیانیان بەکار ئەهێنا..لە سایەی ڕێژێمی ئۆلیگارکیش دا، کە خزمەتی توێژێکی کۆمەڵی کردووە، ڕێگای دەوڵەمەندەکانی داوە کە سیاسەت بکەنە ڕێگاو سەرچاوەی دەستکەوتی ئابووری"[2]... ئەم دۆخە شپرزە سیاسییە وای لە ئەفلاتون کردووە کە بگاتە ئەو ڕادەیەی بە بڕواوە بڵێ:

---

[1] افلاطون: الجمهورية، ص٢٩٩، ترجمة : د. فواد زكريا.

[2] جورج سارتون: تطور الفكر السيلسي ،ك. ص٥١.

" پەیامی فەلسەفە[1] دامەزراندنی دەسەلاتێکی بەهێزی بێ لایەن بێت...لایەنی دەوڵەمەند نەگرێ دژی هەژاران و پشتگیری هەژاران نەکات دژی دەوڵەمەندەکان".
بەڵکو ئەبێ لە نێوان ئەم دوو لایەنە بووەستێ .. ئینجا ئەفلاتون ئەڵێ:
ئێمە مەبەستمان جێگیر کردنی دادە لە دەوڵەتەکەماندا..وێنەی دادیش بە گەورەیی باشتر ئەبینرێ لەوەی بچووك بێت.. کەواتا لە دەوڵەتی داد پەروەرەوە دەست پێ ئەکەین... ئنجا دێینە سەر تاکەکەسی دادپەروەرو هەردووکیان بەراورد ئەکەین[2]...
ئادەمیزاد لە خۆیدا گیانلەبەرێکی کۆمەلایەتییە.. چونکە ناتوانێ خۆی بە تەنیا هەموو پێوستییەکی ژیانی خۆی وەدەست بهێنێ...ئەمەش ناچاری ئەکات کە لەگەڵ کەسانی تردا هاوکاری بکات و لەمەوە کۆمەڵ پێك هاتوە...ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێکیش لە هەرێمێکدا جێگیرو نیشتەجێ بوون پێان ئەوترێ دەوڵەت[3].
لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە .. ئایا پەیوەندی تاکە کەسان بە دەوڵەتەوە لەسەر چ بنچینەیەکی فەلسەفەییانە بەندە؟ ئەبێ بۆچی ئەفلاتون دەوڵەت لەگەڵ ئادەمیزاد بەراورد بکات ئەنجامی ئەمە ئەمانگەیەنێتە چی؟ ئەفلاتون لەو باوەڕە دایە کە دەوڵەت لە(بەرد یاخود لە دارو بەرد) پێکنایەت بەڵکو لەو کەسانە پێك دێت کەتێیدا ئەژین و بە هیچ جۆرێك ناتوانین هوشیاری دەوڵەت لە هۆشیاریی ئادەمیزاد جیا بکەینەوە،چونکە هۆشیاریی دەوڵەت هی ئەندامانیەتی و کە بیر ئەکەنەوەو ئەندامن تیایدا...بونموونە ئازایەتی دەولەتێك ئازایەتی ئەندامانیەتی کە بیر ئەکەنەوەو کار ئەکەن..هەریەکێکیش لەوتاکەکەسانە کە لە ڕێگا تووشی مەترسیی بوو ئازایەتی تاکە کەسی دەنوینێ [4] هەروەها هەمان کەس لەگەڵ کەسی خەڵکی تر لە میدانی جەنگدا دژی دوژمن ئەو ئازایەتییە دەرئەبڕێ کە ئەفلاتون بە ئازایەتیی دائەنێ جا بۆیە نابێ بە هیچ جۆرێك لە یادمان بچێ کە :
هەموو دیاردە کۆمەلایەتییەکان ئەنجام و بەروبوومی ( نەفسی ئادەمیزادن...) و (هەموو ڕێژیم و قانوون و دادێك بەشێکن لە چالاکیی ئەقڵ و بیرو ڕاو نەریتی ئەقڵی ئادەمیزاد [5] .

---

1 و(٦) ارنست باركر: النظرية السياسية عندالاغريق، ج١، ص٢٦٣-٢٦٤.

2 افلاطون: الجمهورية.. ل٢٣٢، (پەرەگرافی ٣٦٨).

3 افلاطون: الجمهورية.. ل٢٣٣، (پەرەگرافی ٣٦٩).

4 و(١٠) ارنست باركر: النظرية السياسية عند الاغريق، ج١،ص ٢٨١-٢٨٢.

5 افلاطون: الجمهورية فقرة(٣٩٨)، ص٢٧٥، ترجمة د.فواد زكريا القاهرة ـ الهيئة المصرية العامة للكتاب١٩٧٤.

ئەفلاتون ئەڵێ: بۆ ئەوەی دەوڵەتەکەمان بە هێز بێ و مەترسیی پاشا گەردانییی و تێکچوون و ئاژاوە و شەڕوشۆڕی لێ نەکرێ پێویستە سەرنجی ئەم دوو لایەنە بدەین:

- خوو ڕەوشت و نەریت و دۆخی کۆنی کۆمەڵایەتی و سیاسی مێشکی خەڵکیان تێك داوە و دادپەروەریی و دیموکراسییان لەبیر بردوونەتەوە... کەواتا پێویستیمان بەوە هەیە کە نەوەیەکی نوێمان دەستگیر ببێ و بە شێوەیەك پەروەردەیان بکەن کە دەستە بەریی مانەوەی ئەم دەوڵەتە نموونەییە بێ .

- هەر لەسەرتاوە مەترسیی لەناو چوونی دەوڵەتەکە لە ئارادایەو بۆیە پێویستیمان بە پاسەوان و سەرباز هەیە.. کەواتا چۆن ئەم پاسەوانە دلسۆزانەمان دەستگیر ئەبێ.

بۆ ئەم مەبەستە پێوستە لەسەرمان لەناو مندالاندا( کوڕ و کچ) تاقمێکی لەش ساخ و هەڵکەوتە هەڵبژێرین، لە شوێنێکی تایبەتی دا دەست بە پەروەردەکردنیان بکەین، نابێ هیچ منداڵێك لەم منداڵانە دایك و باوکی خۆی بناسێ، بۆ ئەوەی وا پێ بگەن کە هەستی خۆش ویستنی خێزان و موڵکداریی تایبەتییان تێدا نەبێ، چونکە ئەوان تەنیا بۆ خزمەت کردنی گەل و پاراستنی دەوڵەت پێگەیەنراون.
لێرەدا ئەفلاتون مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی شیرازەی خێزان و موڵکداریەتییە، چونکە لەو باوەڕەدا بووە کە هەست و سۆزی بوون بە خاوەن خیزان و پەروەردە کردنی منداڵ و لەو کەسە ئەکات کە نەیپەڕژێتە سەر خزمەت کردنی دەوڵەت و کۆمەڵ.
هەستی موڵکدارێتی ئادەمیزادێکی خۆ پەرست دروست ئەکات کە ئێمە نامانەوێ و ئەبێ هەوڵی لە ڕیشە هەڵکێشانی بدەین.
لەسەرەتاوە ئەم منداڵانە وەرزش و مۆسیقا ئەخوێنن بۆ ئەوەی لەش ساخ و مێشك ساف و بێ گەرد بن. ئینجا ئەدەب و چیرۆکیان پێ ئەلێین....
بەلاّم لە شیعری خەیاڵی دوریان ئەخەینەوە ... چونکە ئەم جۆرە شیعرە خوویان خراپ ئەکات و مێشکیان تێك ئەدات و هەروەها شاعیری خەیاڵییش لە دەوڵەتی ئێمەدا جێگەی نابێتەوە .
( خۆ ئەگەر لە دەوڵەتەکەماندا پیاوێکی شارەزا لەلاسایی کردنەوەدا دەرکەوت، ویستی باسی شیعرەکانی بۆ خەڵکی بکات... ئێمەش ڕێزی ئەگرین و کڕنۆشی بۆ ئەبەین هەروەك گیانلەبەرێکی پاك و پیرۆز بێ... هەرچەندە یاساش ڕێگای ئەمە نادات ... بۆنی خۆشی پێدا ئەکەین و ناوچەوانی بە گوڵ ئەرازێنینەوە و بەرەو دەوڵەتێکی تر ڕەوانەی ئەکەین... چونکە ئێمە شاعیری وامان ئەوێت ئەگەر لاسای

بکاتەوە، ئەبێ لاسایی شێوازی پیاوچاکان بکاتەوە و پەیڕەوی ئەو یاساو بنچینانە بکات کە لەسەرەتاوە بۆ فێرکردنی پێخوێندنی جەنگاوەرانمان دامان ناون) [1]. ئەم پەروەردەکردنە بەم شێوەیە بەردەوام ئەبێ تاوەکو تەمەنیان ئەگاتە هەژدە ساڵ. دوای هەژدە ساڵیی فێری مەشقی لەشکر و جەنگ ئەکرێن. زیرەکەکان جیا ئەکرێنەوە و دەرسی ژمێرەو ماتماتیك و ئەندازەو فەلەك ئەخوێنن، ئەوانی تریش ئەکرێن بە پاسەوان.

ئەبێ ژیانی تاقمە جیاکراوەکە مسوگەر بکرێ بۆ ئەوەی هەموو کاتێکی خۆیان بە خوێندن و پەروەردەو پێگەیشتن دا بنێن....

ئەبێ ئەندامانی ئەم تاقمە هەموو بەیەکەوە بژین و لەو خێزانەیان بەو لاوە ئارەزوو تامەزرۆی هیچ خێزانێکی تایبەتی خۆیان نەبن.

پاساوانانیش ژن و پیاو ( یاخود ڕاستر نێر و مێ) نابێ ئەوە لە مێشکیاندا بێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەبن بە خاوەن ژن و منداڵ، ئەوان پاساوانن و پاراستنی ڕێژیمیان ئەرکە بەسەر شانەوە.... بەڵام لە ساڵێکدا ڕۆژێك تەرخان ئەکرێت تیایدا ئاهەنگ ئەگێڕدرێ و پاسەوانان، نێر و مێ تیایدا جووت ئەبن و ئاهەنگی بووك و زاوای ئەگێڕن.. ئنجا هەردوو لەیەکتری جیا ئەکرێنەوە ڕۆژێك بۆ منداڵ بوونەکە دەست نیشان ئەکرێ و پیاوە پاسەوانەکان ئاگایان لە هیچ نابێ نازانن کامە منداڵە، منداڵی ئەوانە! ئەو منداڵانەی لەو ڕوژە دیاریکراوەدا لە دایك ئەبن کۆ ئەکرێنەوە ساخ و هەڵکەوتەکان هەڵئەبژێردرێن و ناساخ و سەقەت و ئەوانەی لەپێش یاخود دوای ڕۆژی دیاریکراو لە دایك بوون لەناو ئەبرێن و دەست بە پەروەردە کردنی هەلبژاردراوەکان ئەکرێت.

زیرەکەکان لە تەمەنی( ٣٠) ساڵیدا تا ماوەی پێنج ساڵ فەلسەفەو بابەتەکانی زانست ئەخوێنن لە دواییدا لە دەزگاکانی دەوڵەتدا کارو باری ژیانی ڕۆژانەیان پێ ئەسپێردرێ تاوەکو تەمەنیان ئەبێ بە پەنجا ساڵ ئنجا هەرە زیرەکەکان یاخود یەکێکیان ئەبێ بە فەرمانداروو ئەبێ بە فەرماندارە ( کە بەرامبەر بە شا یاخود سەرکۆمارە) هەموو کاتێکی خۆی بۆ بیرکردنەوەو سەرنجدانی ئەقڵیی و بۆ خێری ڕووت دابنێ.. خۆ ئەگەر ئەم فەیلەسوفانە ( یاخود ئەم فەرماندارانە ) لە ژمارەی پێویست پتر بوون بە نۆرە یان لە دوای یەك فەرمان دار ئەبن یاخود بە کۆمەڵ ئەم

---

[1] جون لويس" مدخل الى الفلسفة، ص٤١،ط٢، بيروت ٩٧٣، دارالحقيقة للطباعة والنشر. ترجمة انور عبدالمليك.

کارەیـان پـێ ئەسـپێردرێ.... ئەمـە کورتـە باسـێکی بەرنامەوپـەروەردەو ڕژێمـە نموونەییەکـەی ئـەفلاتون بـوو دەربـارەی دەوڵـەتی نموونـەیی. ئـەتوانم بڵـێم لـەم دەوڵەتەدا هەموو جۆرە گۆڕان وپەرەسەندن و بەرەو پێش چوونێك قەدەغەیەو ڕێگای نادرێت.ئەبێ هەر چینە خەریکی ئەوکارە بێ کە پێی سپێردراوەو نابێ هەوڵی گۆڕان و چوونە ناو چینێکی تربدات ....بۆئەوەی دەوڵـەت تێك نەچێ ودادپـەروەریی تێدا بپارێزرێ پێویستە: (فەرمانـدە حوکم بکات و کرێکار هـەر ئیش بکات و کۆیلەش هەر کۆیلە بێ [1].

ئەفلاتون بە توانای بەهرەدار دەربارەی چەند لق و بابەتێکی تری ژیان و کۆمەڵ و بیری ئادەمیزاد بەرهەمی هەیەو بە نووسین بەشداری کردووە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بابەتانە تا ڕادەیـەك لـە فەلسەفەوە دوورن و پەیوەندییـەکی ڕاسـتەوخۆیان بـە ناوەڕۆك و بابەتی ئەم کتێبەوە نییە پشت گوێمان خستن.

---

[1] جون لويس :مدخل الى الفلسفة ص ٤١ ط ٢ بيروت ١٩٧٣ ، دار الحقيقة للطباعة والنشر. ترجمة انور عبدالملك.

## ئەرستۆ تالیس
## " گەورەیی ئەسکەندەری مەقدۆنیا
## ئەو دەورە ساخ ئەکاتەوە کە فەلسەفە ئەیگێڕێ "

## هیگڵ

ئەرستۆی دەریا عیلم، قوتابی ئەفلاتون و ماموستای ئەسکەندەری مەقدۆنیا، بلیمەتێکە لە بلیمەتە هەرە گەورەکانی جیهان. لەبەرهەم بە پێزیدا لە وێنەی زۆر کەمە ڕابەرو داهێنەری لۆجیکە، بۆیە بە ماموستای یەکەم ناو ئەبرێ.. لە هەموو لق و بابەتەکانی زانیندا نووسین و لێکولینەوەی لە پاش بەجێ ماوە:

وەك فەلسەفە، لۆجیك، سیاسەت، ئابوری، قانوون، ئاکار، سایکۆلۆجی، شیعر، میژووی سروشتی، ساڵی ٣٨٤پێش زاین لە شاری ئەستاگیرا لە دایك بووە. ئەوساکە ئەم ناوچەیە لەژێر کۆنترۆڵی یۆناندا بووە و بەندەرێکی هەرێمی مەقدۆنیا بووە. باوکی ناوی نیقوماخوس بووە و پزیشکی باپیری ئەسکەندەری مەقدۆنیا بووە، ئەدەب و ڕۆشنبیری و زانستی ئەیونیا و مەقدۆنیاو پزیشکیی کە پیشەی باوکی بوون کارێکی زۆریان لە هەست و دەرونی کردوەو هۆشیان هەژاندووە، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا، باوکی بۆ خوێندن ناردویەتییە ئەسیناو نزیکەی بیست ساڵ لەو شارەدا ماوەتەوە، لەو ماوەیەدا دۆست و قوتابی ئەفلاتون بووە لە ئەکادیمیاکەدا.

ئەرستۆ لە هەموو قوتابییەکانی تری ئەکادیمیا زیرەك و شارەزاتر بووە، بۆیە ئەفلاتون بە ( ئاقڵ) ناوی بردووە، دوای مردنی ئەفلاتون ساڵی ٣٤٨ ی پیش زاین، ئەرستۆ ئەسینای بە جێهێشتووەو بەرەو لای هرمیاس فەرمانداری ئەتارنیوس کەوتۆتە ڕێ و لەوی خوشکەزای ئەو فەرماندارەی خواستووە، پاش فەوتانی هرمیاس، ئەرستۆ لەسەرداخوازی مەلیك فلیپ بووە بە ماموساتای ئەسکەندەری کوڕی ئەوکاتە تەمەنی ١٣ _١٤ ساڵان بووە، کاتێ ئەسکەندەر گەیشتۆتە تەمەتی هەرەتی ١٦ -١٧ ساڵی، لە جێگای باوکی دانیشتوە و دەستی لە خوێندن هەڵ گرتووە... پاش ماوەیەکیش کوڕە زایەکی ئەرستۆی کوشتووەو ئەرستۆ بەمە دڵگیر زویر بووە، گەراوەتەوە ئەسینا و لە یاریگەی ( لۆقیون) قوتابخانەیەکی کردوتەوە

وكه هەموو چەشنە سەرچاوەيەكی تێدا دەست كەوتوە و بەيانيان و ئێواران دەرسی تیادا وتووتەوه.
لەو سەردەمەدا ئەسكەندەری مەقدۆنيا لە لا ی خەڵكی ئەسينا خۆشەويست نەبووه، ئەرستۆش بە دۆستی ئەو دانراوه بۆيە هەركە ئەسكەندەر فەوتاوه كوێرەوەريی ئرستۆ دەستی پێ كردووه و خەڵكی دەستيان كردووه بە بلاوكردنەوەی پڕو پاگەندە دژی ئەرستۆ بە گومڕا تاوانباريان كردووه.. ئەرستۆش بە ناچاری ئەسينای بە جێهێشتووەو وتوويەتی:
" نامەوی دەرفەتێكی تر بدەمە دەست خەڵكی ئەسينا تاوانێكی تر بەرامبەر بە فەلسەفە بكەن — مەبەستی كوشتنی سوقراتە" .
لە ساڵی ٣٢٢ پێش زاين لە شاری (خلقيس) بە نەخۆشيی كۆچی دوايی كردووه.

## بەرهەمەكانی

بەرهەمەكانی مامۆستای يەكەم ئەكرێن بە دوو بەشەوه ، بەشێكيان فەوتان و لە ناوەكانيان بەو لاوە شوێنەوارێكی تريان نەماوه.
بەشەكەنی تريشيان زۆرن ئەمانە هەندێكيانن:
**لۆجيك:**
بە ئۆرگانۆن ناو ئەبردرێ و لەم لقانە پێك هاتووه: كاتيگۆرياس، عيبارە، شيكردنەوەكانی يەكەم ( ئەنالۆتيكا)، شيكردنەوەكانی دووەم دياليكتيك
فەلسەفەی فيزيك : پەيدابوون و لەناوچوون(*) ئاسمان، شوێنەوارەكانی سەرو، نەفس، مێژووی ئاژەڵ.

ميتافيزيقا: جەوهەری ماهييەت، هەيوڵا و فۆرم، ئيلاهييات.... ئەرستۆ ئەم بابەتە بە فەلسەفەی يەكەم ناو ئەبات، دوای مردنيشی كە بەرهەمەكانی كۆكراونەتەوه، ئەمەيان خراوەتە دووای فەلسەفەی فيزيقاوە بۆيە بە ميتافيزيقا ناو نراوە كە مانای —لە دوای سروشتەوە — ئەبەخشێ.
١) فەلسەفەی ئاكار:
ئاكار ، سياسەت، ئابوری، (خطابة) ، شيعر.

---

* كاك (جعفر الشكرچی) لێكۆڵينەوەيەكی لەژێر ناونيشانی ( اثر الرياضيات فی فلسفة افلاطون) دا نووسيووە و لە بەشی فەلسەفەی كۆليجی ئادابی زانكۆی بەغدا شهادەی ماستەری پێ وەرگرتووه.... تێيدا ئەم بابەتەی بە تەواوەتی ڕوون كردۆتەوه.

**شێوەی نوسینەکانی :**

ئەرستۆن لە نووسینەکانیدا لەچاو نووسەرەکانی تری ئەوسای یۆنان ڕێگاو شێوەی زانستییانەی گرتۆتە بەر، ئەو شێوەیەش ئەکری بە چوار قۆناخەوە:

- دەست نیشانکردنی بابەتی نووسین و لێکۆڵینەوە.
- تەتەڵە کردنی ئەو بیر و ڕایانەی لەسەر ئەم بابەتە هەن.
- تۆمارکردنی ئەو گیرو گرفتانەی دێنە بەردەم و ئەو کەلەبەرانەی ئەکەونە ناو لێکۆڵینەوەکەوە.
- ئەنجام دانە دەست. ئەویش دوای ئەوەی سەرنجی بابەتەکان ئەداتەوەو بە دوای چارە سەریەکانیاندا ئەگەڕێ ، ئەگەر پشت ئەستور بوو بەو ئەنجامانەی لە قۆناخەکانی پێشوو پیان گەیشتووە. نوسینەکانی ئەرستۆ سەرەڕای ئەو وەستایی و وردەکارییەی تێیاندایە وشك و ڕەق و پوخت و كورتن، تێگەیشتنیشیان هەروا ئاسان نییە ، هیچ جورە دیالۆگ و شیوەی ئەفلاتونیان تێدا بەدی ناکرێ.. ئەمەش شتێکی ئاساییە ، چونکە ئەرستۆ ئەدیب نەبووە بەڵکو زانا بووەو، شێوەی نووسینی زانستیانە بایەخ بە بیرو ناوەروك و كاكلەو ئەنجام ئەدات نەك بە شێوەو روخسارەکەی، بە پێچەوانەی ئەدیبەوە كە ناوەڕوك ئەخاتە ژێر سمی ئەسپی باڵداری خەیاڵ و شێوەو روخسارەوە. هەوڵ ئەدات وشەی قەبەو زل و بریقە داری بۆ هەلبژێری .. واتا ئەرستۆ ناوەڕۆك و ئەنجامی لێکوڵینەوەکانی لە شێووەو ڕوخسار بەلاوە مەبەست تر بووە.

**فەلسەفەکەی بە تێکرایی**

بۆ ئەوەی بتوانین پوختەیەکی فەلسەفەی مامۆستای یەکەم پێشکەش بە خوێنەری کورد زمان بکەین وای بە باش ئەزانم کە سەرنجی ئەم لایەنانەی بەرهەم و نووسین و فەلسەفەی ئەرستۆی دەریا عیلم بدەین.. وە لەهەر خەرواڵە مشتێ بکەین بە دیاری :

- میتایزیقا.
- لۆجیك(المنطق).
- فیزیقاو بوون.
- نەفس و دەرون.
- ئاکار.

## میتافیزیقا

پێش ئەوەی باسی لقەکانی ئەم بابەتەو ناوەڕۆکەکەی بکەین و ڕوونی بکەینەوە کەچۆن ئەرستو میتافیزیقای داهێناوە بەپێویست ئەزانین کەبەخێرایی بیری ئەفلاتۆن وئەرستۆ بەراورد بکەین ولەبەر تیشکی ئەم بەراورد کرنەدا بابەتی میتافیزیقای مامۆستای یەکەم روون بکەینەوە.

- بیروڕ و ڕۆشنبیری ئەفلاتون بەماتماتیك زاخاو دراوەوئەرستۆ لەبنەماڵەو خێزانێکەی باوکیەوە کاروباری پزیشکیی زۆرکاری تێکردووە. ئەفلاتون وەك ماتماتیك ناسێك* بەهۆی کارتیکردنی ژمارەی فیتاگۆرسەوە لە لێکۆڵینەوە دا پەنای بردوتە بەر ئیستدلال. بەڵام ئەرستۆ وەك ڕۆڵەی خیزانێکی پزیشکیی پیشە، بەلایەوەمەبەست بووە کە پەنابەرێتە بەر تێبینی ولەحوکمداندا پەلە نەکات...کەوابوو ئەفلاتوون خەیاڵیی هەست ناسك[1] وئەرستۆ بیرومێشکێکی پراکتیکانەی هەبووەو تاقیکردنەوەوتێبینی(الملاحظة)بەکەم زانیوە.

ئەرستۆ کتیبێکی بەناوی فەلسەفەی یەکەم یاخود(دانایی Sophia)داناوە...لەدووایدا ناوی میتافیزیقای بەسەردا براوە، لەبەشێکی ئەم بەرهەمەیدا بەمشیوەیە دەستپی ئەکات: ئەبێ زانینی هۆیەکانی شت ئەرکی فەلسەفە بێت، ئەوهۆیانەی ئەبنە مایەی خوڵقان و ڕوودان و دروست بوونی شت و بوونەکەیانی لێ وەرئەگرن...کەواتافەلسەفە زانینی هۆیەکانە .. بەڵکو زانستی یەکەم هۆیەکانە ... چونکە فەلسەفە لە لقەکانی زاستەوە جیاوازە ... ئەم جیاوازیەش بەم جۆرەیە: ئەرستۆ لە سەرەتای ئەم کتێبەدا دەڵێ:

" هەموو کەسێك ئارەزوی شت زانینی هەیە، بەڵگەی ئەم قسەیەشمان ئەو تام و چێژەیە کە لەکاتی کارکردنی هەستەکادا پێمان ئەگات"[2] . بەڵام لە نێوان زانست و ئەو زانینەدا کە بەهۆی تاقیکردنەو دەستگیرمان ئەبێت جیاوازییەکی زۆر هەیە.

" ئێمە بەدوای ئەو زانینە دا ئەگەرێین کە لە تاقیکردنەوەی سادەو ە جیایە[3] .

تاقیکردنەوە بە وەبیرهاتنەوە بەندە، چەند بیرەوەرییەکیش دەربارەی شتێك، تاقیکرنەوەیەك پێك ئەهێنین ... زانست ئەیەوی بیرێکی گشتی پێکبهێنێت کە دەربارەی هەموو حاڵەتە هەندەکی و تاکەکان ڕاست بێ...

---

[1] جورج سارتون: تارخ العلم، ج٣، ص١٩٠،ترجمة: ابراهيم بيومى مدكور وجماعة من العلماء، القاهرة- دارالمعارف بمصر١٩٦١.

[2] ARISTOTLE:METAPHYSICA

[3] شارلس فرنر: الفلسفة اليونانية، ص ١٣٣ ترجمة: تيسر شيخ الارض لبنان١٩٧٤.

تاقیکردنـەوە تـەنیا بـوونی شـتمان پـێ ئـەڵێت وەك بڵـێین ئـاگر هەمیـشە گـەرموو سوتێنەرەو ئەم دەرمانە فلانە نەخۆشی لەناو ئەبات.. بەلام ئێمە ئەمانەوێ بزانین بۆچی ئاگر گەرم و سووتێنەرە... هۆیەکەی چییە؟ لەبەر چی فلانـە دەرمان فیـسارە نەخۆشـی چـاك ئەکاتـەوە؟ هـەر لەبـەر ئەمەشـە ئێمـە بـە دووای زانـستدا ئەگـەڕێین، چونکە ئەبێتە مایەی ئەوەی هۆیەکانی بزانین... کەوابوو فەلسەفە سەرەتای هـەموو زانستیکە، زانـین یەکـەمین هـۆو زانـستی یەکـەم هۆیـەکانی بـوونی ڕووتـە.. ئەمـەش میتافیزیقایە.

پێویستە میتافیزیقا هەبێ....! چونکە :

" زانستییە تایبەتییەکان کە هەر یەکەیان بابەتێکی تایبـەتییان هەیـەو جۆرە زاراوەو چـمکێك بـەکار ئەهێنین وەك[1] : خۆیـەکی، جیاوازی، یەکایـەتی و زۆری و هـیتر. ئـەم زاراوانەش بە هەموویانەوە بابەتی زانستی بوونی گشتین، واتا میتافیزیقان "

بـەش و لایەنە جیاوازەکـانی تـری بـوون کـە هەریەکـەیان خاسیـەتی تایبـەتی خۆیـان هەیــە، بابــەتی لێکۆڵینــەوەی هەنــدەکیین ... ئەمانــەی خــوارەوەش لقــەکانی میتافیزیکان:

**جەوهەرو ماهیەت:**

ئەرسـتۆ جەوهـەر Substance ئـەکات بـە دوو جـۆرەوە: (جەوهـەری یەکـەم و جوهەری دووەم) یەکەمیان پەیووەندی بە بوونی ڕووتـەوە هەیـە و بنچینـەی هـەموو بوونێکـەو هـەڵگری هـەموو (صـفە) تێکـە بـەلام خـۆی هـەڵناگرێ. جـا بۆیـە جەوهـەر تـاکێکی هەنـدەکی( جزئـی) یـەو هۆیـەك هەیـە بوونەکـەی سـاخ ئەکاتـەوە ئـەو هۆیـە ماهییەتە Essince کەواتە پەیوەندی نێوان ئەم دووانە چۆنە و چییە؟

لە وەلامی ئەم پرسیارەدا ئەم نموونەیە ئەهێنینەوە و ئەپرسین ئەوفلاتون چییە؟

ئەگەر لە وەلامدا بڵێین:

ئـەفلاتون قەڵـەوێکی کورتـە بـالای پێـست سـپی چـاو شـین و فەیلەسـوفە، ئـەوا نەمانتوانی بوونەکەی ساخ بکەینـەوە هەقیقەتەکـەی کـە ماهییتەکەیـەتی دەربخـەین، چـونکە ئەوانـەی وتمـان چـەند ( صـفە)تـێکن و ئـەگۆڕدرێن و هەقیقـەتی بوونەکـەی ئاشـکرا ناکـەن.... خـۆ ئەگـەر بڵـێین ئـەفلاتون ئادەمیزادە ئـەوا ڕاسـتی بونەکـەییمان درکانـدو لێـرەدا (ئـەفلاتون جەوهـەر) و ئادەمیزادییەکەشـی ماهییەتـە هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە وتمـان جەوهـەر هـەڵگری (صـفە) تـەو خـۆی هـەڵناگیرێ. ئـەفلاتون کـە ئادەمیزادەو مامز کە ئاژەڵە هەردووکیان هەڵگری ( صـفە) تـی ئـادەمیزادو ئاژەڵن...

---

[1] دی.اف. بیرز: طبیعة المیتافیزیقا ص٥، ترجمة: د.کریم متی، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٦٨.

جەوهەر بوونە، ماهییەتیش کۆمەڵە (صفە)تێکە ئەگەر لە دەست چوون ئەوا ئەو شتە لە سرەوشت و شتە سەرەکییەکەی خۆی ئەشۆردرێ و ئەو شتەی پێشوو نامێنێ . دووەم جەوهەریش ( جنس و نوع) ە، وشەو زارەوەکی هەمەکیی و ئەو بوونانەیە کە تەنیا لە مێشکدا هەن و بوونێکی ماددی واقعییان نییە وەك ئەفلاتون لاف لێئەدات[1] ... لەم گۆشەیەوە ئەرستۆ تیوری بەرزی ئەفلاتون ئەداتە بەر نەشتەری ڕەخنەو زەنگی جیابوونەوە لە ئەفلاتونی مامۆستای لێ ئەدات .
ئەرستۆ لەم بارەیەوە چەند بەڵگەیەك ئەهێنێتەوە کە گرنگترینیان بەڵگەی (سییەمین ئادەمیزاد) و لەم بەڵکەیەدا ئەڵێ..
ئەفلاتون لە تیوری نموونەی بەرزدا وەك ئەوکەسەی لێ قەوماوە کە بیەوێ چەند شتێك بژمێرێ و بۆی نەکرێ. بچێ چی بکات باشە؟ ژمارەی ئەو شتانەی دوو ئەوەندە پتر ئەکات بۆ ئەوەی گوایا ژماردنیان ئاسانتر بێت چونکە وەك خۆی ئەڵێ:
هەموو شتێکی هەندەکی یاخود تاك لەم جیهانە گۆڕاوەدا ، نموونەیەکی بەرزی لە جیهانی نموونەی بەرز یاخود لە جیهانی ماقووڵدا هەیە. نموونەی بەرزی ئەفلاتون ناتوانن چۆنیەتی دروست بوونی جیهانی گۆڕاو لێك بدەنەوە. ئەو قسەیەشی کە ئەڵێ " نموونەی بەرز نموونەیە و شتە هەست پێکراوەکانیش بەهۆی بەشدار بوونیان لە نموونەی بەرزدا پەیدابوون، قسەیەکی پووچ و بێ مانایەو هەر لە شیعر ئەچی..."[2] .
چونکە –هەمەکیی _شتی پێ دروست ناکرێت ..ئەندازیار (نەك نموونەی بەرزی ئەندازیاری ) ئەتوانێ خانوو دروست بکات... بەڵگەکەش کە بەمانای بەڵگەی سێیەمین ئادەمیزادەوەیەو ئەرستۆ دژی نموونەی بەرزی ئەفلاتون ئەهێنێتەوە بەم شێوەیەیە[3] :
ئەو لە یەکتری چوون و (صفە) تەی لە نێوان چەند شتێکدا هەیە نموونەیەکی بەرزی لێ پێك دێت ... ئادەمیزاد و نموونە بەرزەکەی لە یەکتری ئەچن کەوابوو ئەبێ لە ئادەمیزادی ئاسایی نموونە بەرزەکەی نموونەیەی بەرزی تر پێك بێت و لە نێوان دوو نموونە بەرزەکەو ئادەمیزادە ئاساییەکەدا کە لەیەکتری ئەچن و دیسانەوە نموونەی بەرزی سێیەم پێك بێت و بەم جۆرە ... هتد .
لەو ڕەخنانەی ئەرستۆ لە ئەفلاتون گرتووە مەبەستی ئەوە بووە ساخی بکاتەوە کە هەمەکییەکان یاخود نموونەی بەرز لە دەرەوەی تاکەکاندا نین بەڵکو لەناو تاکەکاندا

---

1 یوسف کرم: تاریخ الفلسفة الیونانیة، ص١٧٤، ط٥ ١٩٧٠.

2 ARISTOTLE:OP.CT.

3 ارسطوطالیس: علم الطبیعة، ك٢، ب٩، ف٦، ص٢٢٤، ترجمة :احمد لطیف السید،١٩٣٥.

هەن. وە ناوە گشتییەکان دەلالەت لە شتی هەمەکی (کلی)ی ئەکەن و لەسەر شێوەی شتی هەندەکی (جزئی) و تاك و تاکە کەساندا و ئەقڵ دروستی نەکردوون. بگرە هەن و بونێکی بابەتییان هەیەو بریتیین لە چەند( صفه) تێکی هاوبەش و ناو کۆیی کە لە ژمارەیەکی زۆری شتی تاك و تاکە کەسانی لە یەکتری چوندا هەن. ئەگەر بڵێین(جوانیی) بوونیکی سەربەخۆی جیاوازی لە شتە جوانەکە هەیە... ئەرستۆ ئەڵێ: ... بە پێچەوانەوە... ئەم جوانییە هەیە ... بەڵام لە جیهانی ئێمەدایەو لە شتە جوانەکە جیا ناکرێتەوە... ئەم جوانییە بریتییە لە (صفە) تێکی ناو کۆیی و هاوبەش لەنێوان چەند جوانێك تاکدا وەك سەربەخۆ و جیاوازیش لە جیهانی ئەقڵیدا هیچ جۆرە بوونێکی نیەو نابێت؟

**هەیولا و فۆرم:**

ئەبێ هەوین بوون چی بێت؟ ئەو شتانەی ئیستاکەدا هەن لە چییەوەو دروست بوون؟ ئەو کەرەسەیەی هەوێنی دروست بوونی شتە، کۆنە یاخود تازەیە واتە ئەزەلییە یان نا؟ لە وەلامی ئەم پرسیارانەدا ئەرستۆ قسەی فەیلەسوفەکانی پێش خۆی هەڵئەسەنگێنێ و تەتەڵەیان ئەکات و ئەڵێ :

ناگونجی (ئاو ، هەوا ، ئاگر، گڵ ) یاخود ( گەرم . سارد، وشك، تەر) هەوێنی سەرچاوەی بوون بن و شتیان لێوە دروست بووبێ، چونکە ئەگەر مەسەلەکە بەم شێوەیە بووایە، واتە کەرەسەیەك لەم کەرسانە شتی لێوە دروست بووبایە.... ئەبوو جیاوازیی لە نێوان هیچ شتێکادا نەبێ .... کەچی ئێستاکە ئەم جیاوزییە هەیە ... لەبەر ئەوەی بوونیش لە دووای نابوونەوە هاتۆتە کایەوە، ئەوا ئەمە جۆرە گۆڕانێکە، ئەم گۆڕانەش پێوستی بە سێ لایەن هەیە:

- بابەتێك گۆڕانەکەی تێدا روو ئەدات.
- ئەو بابەتە لە خۆیدا دیاری نەکراوبێ.
- دەست نیشانکردنی ئەم بابەتە دوای ئەوەی دیاری نەکراو بوو. یەکەمیان هەیولا یاخود یەکەم هەوێن و کەرەسەیە، دووەم نابوونە (العدم) سێیەمیش فۆرم واتا وێنەکەیەتی. هەموو شتێك لە کەرەسەیەکی دیاری نەکراوو ڕوخسارێك واتا (هەیولاو فۆرم) پێك هاتووە و دروست بووە.... بۆ ڕون کردنەوەی ئەم تیورە ئەرستۆ نموونەی پەیکەر ئەهێنێتەوە ئەڵێ : وەك ماددەو کەرسەیەکی خاو مەڕمەڕمان لەبەر دەست دایە هونەرمەندێك لەم مەڕمەڕە پەیکەرێك دروست ئەکات ... مەڕمەڕەکە هەیولایەو پەیکەرەکە واتا دوا ڕوخسارەکەی فۆرمەکەیەتی.. دەربارەی پەیوەندی هەیولاوفۆرم بەلای ئەرستۆوە(هەیوڵاوفۆڕم بەیەکەوەن ولەواقعدا لەیەکتری جیاناکرێتەوە.. بەلام لەبیرو مێشکدا جیائەبنەوە)...هەروەهائەگونجێ یەکەم فۆرم هەیوڵای فۆڕمێکی تربێ... ئەومەڕمەڕەی ئێمە پەیکەرمان لێ دروست کردووە... وەك مەڕمەڕ هەیوڵاو فۆرمی هەبووە...فوڕمەکەی وێنەو ڕوخساری ماددەی مەڕمەڕەکە بووە...کەئێمەش پەیکەرمان لەوە مەڕمەڕە دروستکرد فۆڕمێکی ترمان بەبەرداکرد کەفۆڕمی پەیکەرە بوو...کەوابوو فۆرمی مەڕمەڕەکە هەیوڵای فۆڕمی پەیکەرەکەبوو... لەم گۆشەیەوە کێشەیەکی تردێتە پێشەوە وئەرستۆ زانایانە چارەسەری ئەکات،ئەویش ئەوکێشەیەیە:

- هێزەکی[*] potentiality.
- کردەکی actuality.

ئەوبوون و شتانەی لەجیهاندا هەن دوو جۆرن.بەشێکیان وەك کەرەسەی خاو وان و ئامادەیی و توانایان هەیە ببن بەشت ..کەی ئەبن بەشت؟ ئەوکاتەئەبن بەشت کەوێنەوفۆرمی ئەو بوونەیان وەرگرت!

دەنکە بەرو وەك تۆوێك ئامادەیی و توانای هەیە ببێ بەداربەڕو ئەگەر دۆخ وباری گونجاوی خۆی بۆهەڵکەوت... کەوابوو ئەتوانین بڵێین ئەودەنکە بەڕووە بە ئامادە بوون (بە هێزەکی)دار بەڕووەو داربەڕووەکەش بە (کردەکیی) دار بەڕووە، (هەر وەك ئەرستۆ ئەڵێ). واتە فۆرم حالەتی (فیعلە)چونکەئەو بوونەی کەلە حاڵەتی ئامادە بووندایە ئەکات بە بوونی کامڵ کە(فیعلی)پێ ئەوترێ ...هەیۆلاسەبارەت بە فۆرمەکەی وەك ئامادە بوون وایە بەرامبەر بە(فیعل). ئەمەش وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوە کەئەپرسێ بوون لە چییە وە هاتووە؟ ئەرستۆ ئەڵێ: بوون،لەبوون و نابوونەوە نە هاتووە، بەڵکو بوونی تەواو(کردەکی)لە بوونی خاوو هێزەکی وناکامڵەوە (ئامادەبوون)ەوە هاتووە. دروست بوونی هەموو شتێك coming tobe گوێزرانەوەی ماددەیە کە تەنیا ئامادە بوون و توانایە بۆ وەرگرتنی فۆرمێك وجێگیربوونی وێنەیە لە ماددەکەدا(کردەکی) ...لێرەدا پرسیارێکی تردێتە پێشەوە: ئەگەر دارتاش وێنەی لە مێشکیدا نەبێت ئەتوایَ لە خۆیەوە کورسی دروست بکات؟ کەوابوو کامیان، کردەکی (فیعل) یاخود هێزەکی (ئامادەبوون) لە پێشەوە دێن؟

بە لای مامۆستای یەکەمەوە بوون لە حاڵەتی کردەکیدا ، لە پێناسە(تەعریف) و بایەخ و کاتدا لە پیش بوون و لە حاڵەتی هێزەکیدا دێت... چونکە " بوون لە حاڵەتی کردەکیدا لە بونێکی ترەوە هاتۆتە کایەوە و کە لە حاڵەتی ئامادەبووندا بووە....

بەڵام چ لایەنێك، یاخود کێ ئەم بوونەی هێناوەتەو کایەوە؟ بێگومان، لە وڵامدا ئەڵێین: بوونێك ئەمەی کردووە کە خۆی لە حاڵەتی (کردەکی) دابووە... ئادەمیزاد لە

---

[*] ئەم دوو وشەیە لە عەرەبیدا (القوە والفعل) یان پێ ئەوترێ، کە یەکەمیان وەك ئەرستۆ بەکاری هێناوە جۆرە ئامادەبوونێکەو دووەمیشیان شتەکە هاتۆتە دی.

ئادەمیزادو [1] ئاژەڵ لە ئاژەڵەوە پەیدا ئەبێت ... "هەیشە بزوێنەری یەکەم هەیەو ئەم بزوێنەرەش لە حاڵەتی کردەکی دایە "... هەروەها کورسیش.... لە کورسییەکی تر دروست نابێت.. بەڵکو دارتاشێك دروستی ئەکات و کە خۆی لە حاڵەتی ( فیعل) دایەو فۆرم و وێنەی کورسییەکە لە مێشکیدایە.

**ئیلاهییات :**

ئەرستۆ بایەخێکی زۆری بەم لقەی میتافیزیقا داوەو تێیدا باسی ئافەریدەکاری (الخالق) ئەکات به ( بزوێنەری یەکەم یاخود ئەم بزوێنەرەی کە خۆی ناجولێنێتەوە) ی دائەنێ... دەربارەی سەلماندن و ساخ کردنەوەی بوونی ئەم یەکەم بزوێنەرە Prime mover چەند بەڵگەو نیشانێك ئەهێنێتەوە...

بە لای ئەرستۆوە سێ جۆرە گەوهەر هەیە کە بەم شێوەیە:

- ئەو گەوهەرانەی هەست ڕێیان پێ ئەبات و لەناو ئەچن وەك( ئاژەڵ و ڕووەك).
- ئەو گەوهەرانەی هەست ڕێیان پێ ئەبات بەڵام لە ناو ئەچن وەك( ئەستێرەکانی ئاسمان).
- ئەو گەوهەرانەی هەست ڕێیان پێ نابات و لەناویش ناچن وەك (نەفسی ئاقڵ لە ئادەمیزاددا، خوا)[2].

دوای ئەم سەرەتایە مامۆستای یەکەم ئەڵێ :

کەوابوو ئەبێ ساخی بکەینەوە کە گەوهەرێکێ هەمیشەیی نا جولاوە هەیە " گەوهەرەکان سەرتاو بنچینەی بوونن... ئەگەر ئەو گەوهەرانە لەناو چووبانایە ئەوا هەموو بوونەکان لەناو ئەچون"... بەڵام بزوتنەوەی بازنەیی و کات هەرە کۆنن لەناو ناچن و هەر ئەمێننەوە..

بزوتنەوە خاسییەتی گەوهەرە و کاتیش پێوەری بزوتنەوەیە ... لەبەر ئەمە گەوهەری هەمیشەیی نا جولاوە هەیە[3]... بەڵگەیەکی تری بەهێزی ئەرستۆ لەم بارەیەوە بە کات و بزوتنەوە وە بەندە ... بەڵگەکەش بەم شێوەیەیە:

---

[1] الموسوعة الفلسفية المختصرة: ص٣٥، ترجمة :فؤاد كامل و جماعة، القاهرة، مكتبة الانجلو المصرية ١٩٦٣.

[2] برتراند رسل: هەمان سەرچاوە ل٢٧٠.

[3] یوسف کرم: هەمان سەرچاوە ل١٧٨.

" كات نه سەرەتای هەیەو نه كۆتایی، هەر هەبووە و هەر ئەشمێنی.. چونكە هەر ساتێكی ئەو كاتە پێش و پاشی[1] هەیە كە ڕابردوو و ئێستاو پاشە ڕۆژ بەیەكەوە ئەبەستێتەوە... كەوابوو كات لە هەرە كۆنەوە هەر ئەمێنێتەوە... كاتیش پێوەری بزوتنەوەیە كە ئەو كۆن بوو ئەبێ ئەمیش كۆن بێ...

لێرەوە ئەگەینە ئەو ڕاددەیەی بڵێین:

" هەموو جوولاویەك بزوێنەرێكی هەیە، چونكە ئەبێ شتێك هەبێ بیجولێنێتەوە ... ئەو بزوێنەرەش بەهۆی بزوێنەریكی ترەوە ئەجولێتەوەو ئەم زنجیرەیە هەروا بێ بڕانەوە بەردەوام نابێ و ئەگاتە بزوینەرێك كە هەموو شتێك ئەجولێنێتەوەو خۆی نابزوی... ئەویش یەكەم بزوێنەرە"[2].

ئەم یەكەم بزوێنەرە چییە؟ پەیوەندی بە جیهانی ئێمەوە چۆنە؟ ئەگەر خۆی لە ماددە پێك نەهاتووەو تەنیا فۆرمی ڕووتە و لە حاڵەتی (فیعل) دایە چۆن ئەتوانێ جیهانی ماددی ئێمەو هەموو ئەو شتانەی كە هەن بجولێنێتەوە؟

بە لای ئەرستۆوە یەكەم بزوێنەر لەش نییەو لە ماددەوە دوورە، چونكە ماددە لە حاڵەتی ( هێزەكی) دایەو ئەگۆڕێ... ئێمەش گەوهەری هەمیشەیمان مەبەستە كە لە حاڵەتی (فیعل) دا بێ و ئەگەر ماددە بوایە نەی ئەتوانی لە كۆنەوەو هەتا هەتایە شت بجولێنێتەوە..

ئەو یەكەم بزوێنەوە لە چێوە(محیط) ی جیهاتدا، ئارامی گرتووە.. گوێ بە هیچ شتێك نادات و ئاگای لە هیچ شتێك نییە... تەنیا بوونی خۆی بابەتی بیركردنەوەی خۆیەتی و بیر لە هیچی تر ناكاتەوە... چونكە بیر ژیانە، بۆیە ئەم یەكەم بزوێنەرە ژیانی ڕووتەو هەر هەبووە و هەر ئەمێنی و لە هەموو بوونێكی تر بەرزترە... پەیوەندیشی لەگەڵ جیهانی ئێمەدا وەك پەیوەندی نێوان _ شەیداو ئەو شتەی شەیدای ئەبێ_ وایە ... بزوێنەری یەكەم بوون كامڵیی ڕووتە بۆیە بەتەنگ جیهانەوە نییە... بە شێوەی سەرنج ڕاكێشان گەردوون ئەجولێنێتەوە... چونكە گەردوون ئەگۆڕێ و كەم و كورپی تێدایە... ئەم گۆڕانەو نا كامڵییەی وای لێ ئەكات لە نەگۆڕاوو كامڵیی نزیك بێتەوە و شەیدای ببێ وەك ئەو بژیاو لەو بچێ و لاسایی بكاتەوە ئەم دوو خاسیەتە (نەگۆڕان و كامڵیی) هی بزوێنەری یەكەمن ... جا بۆیە

---

1 الدكتورة امیرة حلمی مطر: هەمان سەرچاوە، ل٢٨٠.

2 الدكتور كریم متی: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٣، هەروەها سەرنجی ئەم كتێبە بدە: - ابن رشد، تلخیص مابعد الطبیعة ، تحقیق وتقدیم الدكتور عثمان امین، مكتبة، مصطفی البابی الحلبی واولادة بمصر، القاهرة١٩٥٨

جیهان و گەردوون ئەجوولێنەوەو یەکەم بزوێنەر ڕایان ئەکێشی ... ئەمەش نهێتی و هۆی جوولانەوی گەردوونن کە ئامانجەکی ( الغائیة) بە ئاشکرا تێدا دیارە. خۆ ئەگەر ئەم لایەنە ڕوونتر بکەینەوە ئەوا ئەڵێین:

خواوەندی ئەرستۆ تەنیا فۆرم، ئەقڵی ڕووتە، ماددەو هەیوّلای نییە، سادەیە دابەش نابێ... هەموو شتێك ئەبزوێنێ و خۆی ناجولێتەوە. .. جیگای نییە، نە نێرە نە مێیە[1] ، ناگۆڕێ... جیهانی ئافەریدە نەکردووە بەڵکو ئەیجولێنێتەوە. هیچ شتێك ناکات، ئارەزوو مەبەست و ئامانجی نییە... چونکە هەر شتێ ئەمانەی هەبێ کامڵ نییە.

جا بۆیە سەیر نییە کە خواوەندی ئەرستۆ هەر لە شای بەریتانیا بچێ ی و خوی لە کۆشکێکدا ئارامی گرتووە و گوێ بە هیچ شتێك نادات.

## لۆجیك

هیچ گومان لەوە ناکرێ کە ئەرستۆ داهێنەری ڕاستەقینەی لۆجیکەو ئەم بابەتی خستۆتە چوارچێوەیەکی ڕێکوپێك و هێناویەتە ریزی زانستەکانی ترەوە، هەر لەبەرئەمەشە کە بە مامۆستای یەکەم ناوئەبرێ. بەلام ئەمە واناگەیەنێ کەپێش مامۆستای یەکەم بیری لۆجیکانە نەبوبێ. بیری لۆجیکانە لەگەڵ بیری ئادەمیزاددا هاتۆتە کایەوەو هەموو چالاکییەکی سەرکەوتوانەی بیر چەند یاساو بنچینەیەکی لۆجیکیی هەیە .

"بەلام بەکارهێنانی ئەم یاساو بنچینانە لە چالاکییەکانی بیردا بەبێ هۆش و بێ هەست پێکردن شتێکەو دارشتنیان بەو ڕوونی و ڕێك و وپێکی لە پێناو کۆکرنەوەیاندا لەسەر شێوەی تیوری شتێکی ترە"[2] .

ئەو لێکولینەوە و تەتەڵە کردن و کۆکردنەوەی یاساکانی بیرو ڕێك و پێك کردنیان لە لایەن ئەرستۆوە دەستی پێ کرد کە بەرو بوومەی داهێانی لۆجیك بوو .. بە لای مامۆستای یەکەمەوە زانستەکان ئەکرین بە دوو بەشەوە :

---

[1] اول ديورانت:قصة الفلسفة ، ص١١٤، ترجمة د. فتح اللة محمد المشعشع، مكتبة المعارف، بيروت١٩٧٢.

[2] هانز: ريشنباخ: نشاط الفلسفة العلمية، ص ١٩٠ترجمة د.فؤاد زكريا، القاهرة-دارالكاتاب العربي للطباعة والنشر١٩٦٨.

- زانستی تیوری ( فیزیقیاو ماتماتیك و میتا فیزیقیا).
- زانستی پراکتیك( ئاکار، سیاسەت، هونەر...هتد).

بەلام لۆجیك بەشێك نیە لەم زانستانە چونکە ئامرازە Organonیاخود سەرەتاو پێشەکی دەست پێ کردنی هەموو زانستێکەو بایەخ بە فۆرم و ڕوخساری زانست ئەدات و ماددەکەی پشت گوێ ئەخات.

لە سەردەمی ئەرستۆدا ناوی لۆجێك باو نەبوو... شیشە ڕوّن ئەم وشەیە بە مانای دیالیکتیك بەکار هێناوە و ئەسکەندەری ئەفرۆدیسی وشەکەی گۆڕیوەو بە مانای لۆجیك بەکار هێناوە.

ئەرستۆ وشەی ئەنالۆتێکا ( شیکردنەوە) ی لە جیاتی لۆجیك بەکار هێناوە، واتا شیکردنەوەی چالاکی بیر بۆ ئیستسدلال و ئەمیش بۆ قیاس و قیاس بۆ فریز و حدود[١].

ماموستای یەکەم لە لۆجیك لەو لێکۆڵینەوەیەی لەم بابەتەدا کردویّتی بایەخ ئەدات بە شی کردنەوەی زانینی زانستانەو ئەو مەرجانەی کە پێوستە تێیدابن...

لەبەر ئەوە لەم مەیدانەدا باسی کاتیگۆریاس ( مقولە) و پرۆپوزیشن (القضیة) قیاس و ئیندەکشن (استقراء) و برهان ئەکات، وە بەردی بناخەی ئەو تیورە دا ئەنێ کە بە هۆیەوە لەسەر تەختی پاشایەتی دانراو تاجی شاهانەی کرایە سەر.

خۆ ئەگەر بە خێرای سەرنجێك لە لۆجیکی ئەرستۆ بدەین و پرۆپۆزیشنە (المنوجهة) کان بخەینە لاوە ئەتوانین بڵێین ئەم لێکۆڵینەوەیە لەم چوار بابەتە پێك هاتووە:

- بەرامبەریی پروپوزیشنەکان: ئەمەش لە چوار گۆشەی لۆجیکیی و لایەنەکانی.
- بەڵگە هیتانەوەی ڕاستەوخۆ : یاساو پێچەوانەو پەکخستنی بارو ترانس پۆزیشن.
- قیاس: جۆرو فۆرم و ئەو یاسایانە بەهۆیەوە ئەهێنرێتە کایەوە.
- گێرانەوەی قیاسەکان: ئەمە جۆرە بورهانێکە بۆ ساخکردنەوە ڕاستیی جۆرەکانی فۆرمی دووەم و سێیەم بە کار ئەهێنرێ بەوەی لە جۆروکانی فۆرمی یەکەمەوە بهێنرێنە کایەوە[٢].

---

[1] الدکتور محمد عبدالرحمن مرحبا: من فلسفة الیونانیة الی الفلسفة الاسلامیة،ص١٦٤،منشورات عویدات، ط١، بیروت١٩٧٠.

لێرەدا حدود( کە کۆی حد) ە لە جیاتی ئەم وشەیە بەکار هێنراوە termes

[2] د.محمد فهمی زیدان: المنطق الرمزی، نشاتة و تطور، ص ٣٢دار النهضة العربیة بیروت١٩٧٢.

لێرەوە هەوڵ ئەدەین بە پێ ی توانـاو ئـەو سەرچاوانەی لەبەر دەسـتدان باسـی تیێکرایی ئەم بابەتانە بکەین:

## کاتیگۆریاس:

بە لای ئەرستۆوە کاتیگۆریـاس فـراوانترین لایەنـەکانی بـوونن، جگـە لـە جەوهـەر، ئەوانی تر بارن، مانایەکی گشتین، ئەگونجێ_ مقولە_ لە پروپۆزشنێکدا بار(*) بێت، جنسی دوورە ، بەهۆیەوە هەموو بەشەکانی بوون ئەزانین...

ئەم مانا گشیتانەش ئەبەخشن:

جەوهەر:

وەك ئادەمیزاد.

چەند:

سێ مەتر .

چۆن:

سپی، سوور.

پەیوەندی:

دوو ئەوەندەی، نیو، گەورەتر،

جێگا:

بازار.

کات:

دوێنی، پار.

دۆخ:

دانیشتووە.

حاڵەت:

چەکدارە، پێلاوی لە پێدایە.

کردار:

ئەیبڕێ.

کارتێکردن:

---

* بار: محمول : predicate

براوه، شكاوه، سووتاوه.

ئەگەر سەرنج لە لایەنەكانی بوون بدەین بۆمان دەرئەكەوێ كە لەم دە لایەنە تێناپەرێ... سوقرات چییە؟ ئادەمیزادە، جەوهەرە، سوقرات سێ مەتر درێژە، ڕەنگی سوورە، لە ئەفلاتون گەورەترە، لەنێو بازاری یۆنان ژیاوە، نزیكەی بیست وسێ سەدە لەمەوبەر مردووە، زۆر جار بینراوە لەكۆڕە گشتیەكاندا دانیشتوە، پیلاوی لە پێدابوە، كاری لەخەڵكی كردووەو ژیانی ئەوساش كاری تێكردووە.

جەوهەر بایەخدارترین كاتیگۆرەو هەر نۆیەكەی تر هەڵئەگرێ و خۆی هەڵناگرێ و دوو جۆریشە.[1]

یاخود مانایەكی هەمەكییەو دەلالەت لە ماهییەت ئەكات (ئادەمیزاد و ئاژەڵ و بەشەكانی تری جنس و نەوع) ..

جەوهەری تا هەرگیز ناگونجی بی بە باری بابەتێك.. بەلاٌم جەوهەر كە بریتی بوو لە مانای هەمەكی و چەند تاكە كەسێكی گرتە خۆی ئەو ئەگونجی ببێ بە ( بار) وەك : سوقرات ئادەمیزادە.

## قیـــاس

لە باری ر ئەرمنیاسدا مامۆستای یەكەم سەرنجیك لە زمانی ئاسایی ئەدات. ئەو زمانەی خەڵكی ئەسینا لە ژیانی ڕۆژانەیاندا قسەیان پێ كردووە... لە ئەنجامدا بۆی دەركەوتووە زمان لە ڕستەو فریز (العبارة) پێك هاتووە... فریز لە چی پێك هاتووە؟ فریز لە ناو و كرداروو ئامرازی پەیوەندی پێك هاتووە.. "پێویستە لەسەرمان لەسەرەتاوە بزانین ناوو وشە چین، لەبارو نالەبار (سلب و ئیجاب)، فرمان و قسە كامانەن "بە لای ئەرستۆوە فریز دوو جۆرە:

لە پەیوەندی( زمان و لۆجیك ) و كردار ( مثبت و منفی) و ناو پێكهاتووە كە بە پێی پێكهاتن و دەلالەت جیاوازن.

لێكداراو :

ئەمەش ئەكرێ بە دوو بەشەوە:

أ- ڕستە: لە داخوازی و دوعاو پرسیارو بانگكردن پیك هاتووە.

---

[1] د. یاسین خلیل: نضریة ارسطو المنطقیة، مطبعة اسعد، ص ٣٤، بغداد١٩٦٤.

ب – پرۆپۆزیشن: بە پیی لێکدران و سلب و ئیجاب و چەندو هەمەکی و هەندەکی ئەگۆڕدرێ [1].

دوای ئەمە ئەرستۆ لە باسی ( منفی و موثبت ) ئەپرسێ: ئایا ئەگونجی(صفە) تێکی دیاریکراو بدەینە پاڵ شتێکی دەستنیشان کراو یاخود ئەو (صفة) تەی لێ بستێنێتەوە؟ ئایا ئەو (صفة) تە بە شێوەیەکی چارە ناچاری یاخود لابەلایی(عرضی) پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە؟ [2] لێرەو و لە ولآمی ئەم پرسیارانەدا مانا و زاراوەو چەمکی " چارەناچاری، ئەگونجی، مەحاڵە" لە مەیدانی لۆجیکدا هاتنە کایەوە .

دەربارەی پروپوزیشن، مامۆستایی یەکەم ئەڵێ: بیرو بیرکردنەوە بریتین لە بەیەکترییەوە بەستنەوە و لەیەکتری جیاکردنەوەی کاتیگۆریاس لە ڕستدا.. ئەگەر ئەو کاتیگۆریانە لەسەر شێوەی ئەو شتە بوون کە دەری ئەبرن و لە واقیعدا هەن، ئەوا ئەو ڕستەیە ڕاستە خۆ ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بوو ئەوا ڕستەکە درۆزنن و هەڵەیە[3].. چەند ڕستەیەکی تر هەن ناتوانین بڵێین ڕاستن یاخود دروزنن و ئەو فرمانەش نایان گرێتەوە، وەك ڕستەی داخوازی و دوعاو بانگکردن و پرسیار... هتد. ئەمانە هیچ جۆرە فرێکیان بەسەر لۆجیکەوە نیەبەڵکو کەرەسەی شیعرو (خطابة)ن و ئێمەش پشتگوێیان ئەخەین .

پروپۆزیشنی باریی ناوەڕوکی هەرە گرنگی لۆجیکی ئەرستۆیەو خۆی بەم جۆرەیە: ( لە کێشەکەیدا – صفەت، کردارێك، ئەدرێتە پاڵ موصوف یاخود بکەرێکی دیاریکراو.. یان لە بابەت و بار پێك هاتووە) ئەم جۆرە پروپوزیشنە بە پێی چەندو چۆن و هەمەکی هەندەکی نالەبار و لەبار ئەکرێن بە چوار بەشەوە

- هەمەکی لەبار (موجب) هەموو کەسێك ئەمرێ.
- هەمەکی نا لەبار (سالب) : هیچ کوردیك ئەفریقایی نییە.
- هەندەکی لەبار: هەندێ کەس فەیلەسوفن.
- هەندەکی نالەبار: هەندیَ کەس فەیلەسوف نین.

ئەم چوار بەشەش لە ئەنجامی دانانی چوارگۆشەی لۆجیکییەو دێنە کایەوە کە لەمەو بەر وتمان بەشێکی گرنگە لە لۆجیکی ئەرستۆ.

---

1 د.یاسین خالیل: هەمان سەرچاوە، ل٣٦.

2 د.امیرة حلمی مطر: الفلسفة عند الیونان، ص٢٥٥.

3 د.کریم متی: الفلسفة الیونانیة، ص٢٤١، مطبعة الارشاد بغداد ١٩٧١

لە لۆجیکی نوێدا زمانی ئاسایی کەمتر بەکار ئەهێنرێن چونکە مەترسی کەوتنە ناو هەڵەو ئاڵوزیی و تەم و مژاوی لێ ئەکرێت و لە جیاتی وشە ڕەمز بەکار ئەهێنرێ کە لە دەربرینیدا وردترە ..لەم ئاستەوە چوار بەشەکەی سەرەوە بەشێوەی نوێ ئەم ڕوخسارە وەرئەگرن:

- هەموو (أ) یێك ( ب) یێە.
- هیچ (أ) ییێك (ب) نییە.
- هەندی (أ) هەیە (ب) یێە .
- هەندێ (أ) هەیە (ب ) نییە.

لەو نمونانەدا جگە لە بابەت و بار شتێکی ترمان بەرچاو ئەکەوێت کە لەهەر چوار نموونەکەدا بەکارمان هێناون (هەموو، هیچ، هەندێ، نا هەندێ) ئەمانە لە لۆجیکدا بە شورە یاخود نەگۆڕاوی لۆجیك ناو ئەبرێن.
بە پێی ئەم دەست نیشان کردنەوەی جۆرەکانی پروپوزیشن، ئەرستۆ توانی سەرەتای قیاس Syllogism دەست نیشان بکات و لە دوایدا لە کتێبە شیکردنەوەی یەکەم تیۆری قیاس دابنێ کە پوختەی بابەتی لۆجیکەکەیەتی.

قیاسی باریی(*) لە سێ پرۆپۆزیشن پێك هاتووە یاخود مامۆستای یەکەم خۆی ئەڵێ: (قسەیەکە لە دوو پێشەکی و ئەنجامێك پێك هاتووە) ئەو ئەنجامەش بە شێوەی پێویستی و ناچاری بە دوو پێشەکییەوە بەندە و لێیانەوە دێتە کایەوە..
واتا ئەگەر دوو پێشەکی ڕاست و جێگای باوەڕمان هەبوو، ئەوا ئەبێ و پێویستە ئەنجامێکی لێ بێتە کایەوە:
سوقرات ئادەمیزادە
هەموو ئادەمیزادێکیش دەمرێ !
کەوابوو سوقراتیش ئەمرێ
هەر پێشکیەش شی ئەکرێتەوە بۆ (حد) .. وە بە پێ ی پێشەکیەکان لە قیاسدا حەد هەیە( گەورەو بچوك و ناوەڕاست) و هەر پێشەکیەش لە بابەت و بار (الموضوع والمحمول) پێکهاتوە کە ناوی (حەدی) لێ ئەنرێ
لە لای ئەرستۆ قیاس لە سێ فۆرم پێك هاتووە، واش زانراوە کە جالینۆسی پزیشك و حەکیم شێوەی چوارەمی داناوە.. هەر یەکێك لەو فورمانەی قیاس بە پێ ی شوێنی حەددی ناوەڕاست لە یەکتری جیا ئەکرێنەوە.

* قیاسی باری: قیاسی العلمی، محمول: بار.

واتا ( حەددی ناوەڕاست لەو قیاسەدا کە بارە یاخود بابەتە، فۆرمی قیاسەکە دیاری ئەکات.. ) [1].

بۆ نموونە لە فۆرمی یەکەمدا حەددی ناوەڕاست( ن) بابەتە لە پێشەکی گەورەدا (گ) و بارە لە پێشەکی بچوک (ب) دا. وە لە دووەم فۆڕمدا باری هەردوو پێشەکیەکەو لە سێیەم فۆرمدا حەددی ناوەڕاست بابەتی هەردوو پێشەکییەکەیەو لە چوارەم فۆڕما باری پێشەکیی گەورەو بابەتی پێشەکیی بچوکە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ن گ | گ ن | ن گ | گ ن |
| ب ن | ب ن | ن ب | ن ب |
| ب گ | ب گ | ب گ | ب گ |

چۆن ئەتوانین بزانین فلأنە پێشەکیە لە قیاسدا گەورەیەو ئەوی تریان بچوکە؟ لە وەلأمی ئەم پرسیارەدا چەند ڕایەکی جیاواز دێتە کایەوە، بە لای ئێمەوە ئەمەی خوارەوەیان نزیکترینیانە لە ڕاستییەوە :

- پێشەکی گەورە، ئەو پێشەکیەیە کە حەددی گەورەی تێدایە .
- پێشەکی بچوك: ئەو پێشەکیەیە کە حەددی بچوکی تێدایە.

باشە چۆن هەرسێ حەددەکە (گەورەو بچوك و ناوەڕاست) لە یەکتری جیا ئەکرێنەوە؟ لە وەلأمدا ئەڵێین:

- (أ) حەددی گەورەی قیاسە. واتا (أ) لە پێشەکیەك و ئەنجامدا بارە.
- (أ) حەددی بچوکە لە قیاسەکەدا . واتا (أ) بابەتە لە ئەنجامەکەدا.
- (أ) حەددی ناوەراستی قیاسەکەیە. واتا (أ) لە هەردوو پێشەکیەکە دەر ئەکەوی و لە ئەنجامەکەیدا ون ئەبێ.

هەموو ئادەمیزادێك ئەمرێ ....... پێشەکی گەورە.
سوقارتیش ئادەمیزادە...... پێشەکی بچوك.
کەواتا سوقراتیش ئەمرێ......... ئەنجام.

لە لایەکی تریشەوە هە ریپێشەکیەك لە پێشەکییەکانی قیاسی باریدا بە پێی چەند و چۆن و هەمەکی و هەندەکی و لەبارەو نالەبار ئەگۆڕدرێ... لەبەر ئەمە هەر فۆڕمێك لە سێ فۆرمەکەی قیاسی باری بەم جۆرانە (Moods) دابەش ئەکرێن:

---

[1] یان لوکاشیفتش: نظرية القياس الارسطية ، ص ٣٩، ترجمة:د.عبدالحميد صبرة، منشاط المعارف، الاسكندرية ١٩٦١.

- فۆڕمی یەکەم چوار جۆری هەیە.
- فۆڕمی دووەم چوار جۆری هەیە.
- فۆڕمی سێیەم شەش جۆری هەیە.

هەر جۆرێکیش لەم جۆرانە ناویکی ئەورووپی هەیە چەند پیتێك لەو ناوانە هەلبژێردراوە بو لەیەکتر جیاکردنەوەیان کە ئەمانەن:
( A هەمەکیی لەبار، Bهەمەکی نا لەبار،I هەمەکی لەبار، O هەندەکی نالەبار)

.ئەرستۆ چەند مەرجێك دا ئەنێ، ئەبێ لە قیاسی بارییدا پەیرەو بکرێن و نابێ بە هیچ جۆرەك چاویان لێ بپۆشرێ "ئەنجامی لەبار هەمیشە لە پێشەکی لەبارەوە دێتە کایەوە ... ناگونجێ و مەحاڵە ئەنجامی هەندەکیی لە دوو پێشەکی هەمەکییەوە دەربهێنرێن.

ئەگەر پێشەکیەك لە هەردوو پێشەکیەکە نالەبار بوو ئەوا ئەنجامەکەشی بە ناچاری نالەبار ئەبێت".

دوای ئەمە ئەرستۆ دەوری تێبینی و تاقیکردنەوە لە زانستدا هەڵ ئەسەنگێنێ.

ئیندەکشن(*):

لەبەرهەمەکانی مامۆستای یەکەمدا قیاس ئەکرێ بە دوو بەشەوە کەهەر یەکەیان خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیە:

- قیاسی تەواو: پێشەکی و پرۆپۆزیشنەکانی کامڵن و هیچ کەم و کوڕییان تێدا نییە گومان لە ڕاستییان ناکرێت. لەبەر ئەوەی پێویست بە ساخکردنەوە ( برهان) ناکەن.

- قیاسی ناتەواو : پێویست بە ساخکردنەوە (برهان) ئەکات . دوو جۆرەکانی فۆڕمی یەکەمBarbara و Celarent قیاسی تەواون، چونکە پەیوەندییەکی ناچاری لە نێوان پێشەکی و ئەنجامەکانیاندا هەیە. بەلاْ جۆرەکانی تری فۆڕمی دووەم و سێیەم ناتەواون و پێویست بە ساخ کردنەوە ئەکەن و ئەم ساخ کردنەوەیەش بە دوو ڕێگا ئەبێ:

أ-

هەموو ئادەمیزادێك شیر ئەخواتەوە .
ئەفلاتونیش ئادەمیزادە.
کەواتە ئەفلاتون شیر ئەخواتەوە .
یاخود وە ئەرستۆ ئەڵێ: قیاس هەوڵ ئەدات ساخی بکاتەوە کە حەددی گەورە بە هۆی حەددی ناوەڕاستەوە ئەگەڕێتەوە بۆ حەددی بچووك. جگە لە قیاس، لە بەرهەمەکانی ئەرستۆدا ڕێگایەکی تر بەدی ئەکرێ کە (ئیندەکشن) ی پێ ئەوترێ ئەو بەکاری هێناوە و لەم سەردەمەماندا لە مەیدانی زانستدا بایەخێکی زۆری هەیەو بە باشێ پەرەی سەندووە. ئیندەکشن بە پێچەوانەی قیاسەوە، لە شتی تاك و هەندەکیەو دەست پێ ئەکات، پەنا ئەباتە بەر تێبینی و تاقیکردنەوە بەرەو دانان و گەیشتن بە یاسایەکی هەمەکی[1].... وەك بڵێین:
ئاسن و مس و زیو بە ئاگر ئەکشێن.
ئەم سێیانە معدەنن .
کەوابوو هەموو مەعدەنێك بە ئاگر ئەکشێ .
بەهۆی تاقیکرنەوەی چەند نموونەیەکی هەندەکییە و (گەرم کرنی ئاسن) توانیمان یاسایەکی گشتی دابنێین( هەموو مەعدەنێك بە گەرمکردن ئەکشێ ) لەمەشدا تێبینی و تاقیکرنەوە لەبەر چاو گیراون. یاخود وەك مامۆستای یەکەم خۆی ئەڵێ: لە ئیندەکشندا ساخ ئەکریتەوە کە حەددی گەورە بەهۆی حەددی بچووکەوە ئەگەڕێتەوە بۆ حەددی ناوەڕاست. ئیندەکشنی ئەرستۆ تالیس کەم و کوڕی و کەلەبەری تێدایەو خاوەنەکەی نەیتوانیوە بە تەواوی پەرەی پێ بدات چونکە لەوە دڵنیا بووە کە قیاس ڕێبازێکی دروست و ڕاستەو ئەماگەیەنێتە زانینی ڕاست و گومان لێ نەکراو... جا ئەگەر هەندێ جار بایەخی بە تاك و هەندەکی (جزئی) دابێ ئەوا مەبەستی لە ( نوع) بووە[2] و تاکە کەسانی خستۆتە پشت گوێ :
مەڕو بزن و مامز ئاژەڵی کاوێژ کەرەن
ئەم سێ ئاژەڵەش قۆچیان هەیە
کەوابوو هەموو ئاژەڵێکی کاوێژکەر قۆچی هەیە.
ئەرستۆ لێرەدا مەبەستی لە تاکە (مەڕێك ، بزنێك، مامزێك) نیە بەڵکو مەبەستی لەو مەڕەیە کە نموونەی (نوعی) مەڕە بە گشتی... ئەمەش کەلەبەرێکی گەورەیە لە

---

[1] د.یاسین خلیل: المنطقة المعرفة العلمیة، ص،٢١٥ الجزء الاول من نضریة علم، لیبا ١٩٧١.
[2] د. زکی نجیب محمود: المنطقة الوضعی ،ج ٢، ص١٥٦-١٥٧،القاهرة، مکتبة الانجلو المصریة ، ط٤ ١٩٦٦.

ڕێبازەکەیدا، چەنکە سەرژمێرکردنی هەموو ئەندامانی نەوعی مەر یاخود مامز، لە خۆیدا شتێکی سادەو ئاسان نییە... پێویستیشە سەرژمێری هەموو ئەو ئەندامانە بکەین بۆ ئەوەی بۆمان ساخبێتەوە... ئایا نموونەی تاك هەیە کە بە پێچەوانەی پێشەکییەوە بێ کەوامان دانا و پشتمان پێ بەست؟
دوور نییە بە ڕێکەوت مامزێك هەڵبکەوێ قۆچی نەبێ و کاوێژ بکات. ئەمەش کەلەبەرێك ئەخاتە ناو گریمانەکەوە( فرضیة) ...لە لێکۆڵینەوەی ئیندەکشنی فیزیکدا ئەرستۆ سێ جۆرە شت باس ئەکات کە هەر بە ئیندەکشن ناو ئەبرێت....بەڵام ئەو تەنیا یەکێکیان بەو ناوە، ناوئەبات و ئەوانی تر ناوی تری بۆ هەڵ بژاردوون[1]:

- سەرژمێری کردنی هەموو نموونەیەکی تاك بۆ گەیشتنە ئامانجێکی گشتی ئەمەش بە لای ئەرستۆوە ئیندەکشنە.

- ئەتوانین لە تاکە نموونەیەکەوە بەگەینە یاسایەکەی گشتی چارەناچاری، کە دوور نیە تاکەکان پشتگیری بکەن نەك ساخی بکەنەوە. ئەمەش لە لای ئەرستۆ بە (حدس)ی[*] ڕاستوخۆ ئەبێت و پیویست بە ساخکردنەوەو سەلماندن ناکات.وەك بابەتەکانی ماتماتیك وئەندازە.

- شیکرنەوەی لۆجیکییانەی یاسا زانستییەکان لە مەیدانی ماناو وشەو پێکهاتن و لێك درانی فزێزەکانیەوە ، بۆ ئەوەی بۆمان دەر بکەوێ ئایا ئەو یاسایانە پەسەند ئەکرێن یانا ؟ ئەم بەشە لە لای ئەرستۆ بە دیالێکتیك ناو ئەبرێت.

## فیزیقـا

ئەرستۆ لەم بەرهەمەدا بە تێکرایی باسی ئەم بابەتانە ئەکات و وردبینانە بیرورای فەیلەسوفەکانی پێش خۆی شی ئەکاتەوەو ئەگاتە ئەنجام:

- بزوتنەوە.
- هۆیەکان.
- کات.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشو، ل١٦٥.

* Intuition

• گەردون.

ئەرستۆ بایەخێکی زۆری بە بزوتنەوە داوە، باسی کردووە. پەیوەندی لەگەڵ کاتدا چییە؟ کۆنە یاخود نوێیە؟ ئەگەر لایەکیان بوو لەم لایانە ئەنجامەکەی چی ئەبێت؟ ئەمجار چەند جۆر بزوتنەوەمان هەیە؟ ئەرستۆ لەم بارەیەوە ئەڵێ:

(هەموو ئەو گیانلەبەرانەی لە گەردووندا هەن لە خۆیاندا بنەڕەتی بزوتنەوەو وەستانیان تێدایە... جا ئەو بزوتنەوەیە گواستنەوە بێت لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر یاخود بزوتنەوەییەکی ناوەکی بێت وەك گەشە کردن و لەناوچوون... یاخود لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر بگۆردرێن[1]. ئەی ئەبێ بزوتنەوە لەخویدا چی بێت و چۆنە؟ (بزوتنەوە کردارێکە یاخود جێبەجێ بوونە یا کامڵی بوونە کە لەمەو بەر لە دۆخی ئامادەبووندا بووە... لەگەڵ ئەو جیاوازییە جۆراو و جۆرەی کە ئەگونجێ لەم بوونەدا هەبووبێ ... کەواتە گۆڕان بزوتنەوەی ئەو بوون و گۆڕاوەکەیە لەو بارەیەوە کە گۆڕاوە. گەشەکردن و کەمکردن، بزوتنەوەی ئەو بوونە کە گەشەی کردووە یان کەمی کردووە. دروست بوون و لەناچونیش بزوتنەوەی ئەو بوونەن کە دروست ئەبێ یاخود تێك ئەچێ... گواستنەوەش بزوتنەوەی ئەو بوونەیە کە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەگوازرێتەوە[2].. ) هەروەها ئەرستۆ لە تێکستێکی تردا ئەڵێ: ( هەر شتێك بجولێتەوە ئەبێ بەهۆی شتێکی ترەوە بجولێتەوە[3]) و ( بزوتنەوەش بەبێ کات و بە بێ جێگا مەحاڵە[4] )... لەم تێکستانەی ئەرستۆ بۆمان دەرئەکەوێ کە مامۆستای یەکەم ئەیەوێ بڵێ: هەرشتێك بجولێتەوە بزوێنەرێکی هەیەو هەموو گیانلەبەرێکیش ئەجولێتەوە ... بەمەش ئەیەوێ ساخی بکاتەوە کە ئەم گیالەبەرانە لە مادده دروست کراون و کەم و کوڕییان تێدایە بۆیە هەوڵ ئەدەن لە گیانلەبەرێك ، لە بزوێنەرێك نزیك بنەوە کە تەنیان فۆرمی ڕووتەو هەموو شتێك ئەجولێنێتەوە خۆی ناجولێتەوە... هەروەها ڕابەری میتافیزیقا بە پێ ئەم تێکستانە ئەڵێ: بزوتنەوە توند و تۆڵ بەکات و شوێنەوە گرێ دراوە... چونکە ئەبێ بزوتنەوە لە کاتدا بێ و کاتیش پێوەری جولانەوەیە و بزوتنەوە بزوتنەوەی ئەو شتەیە کە ئەجولێتەوە و ئەو شتەش لەکات و شوێنێکی دیاریکراودا هەیە.. دووبارە لەم

---

[1] ارسطو طاليس: علم الطبيعة، ك٢، ب١، ترجمة: المرحوم:احمد لطفى سيد، القاهرة لجنة التاليف والترجمة والنشر١٩٣٥.

[2] ارسطو: هەمان سەرچاوە ك ٣، ب١ ز

[3] ارسطو: هەمان سەرچاوە: ك٧ ،ب ١ڗ.

[4] ارسطو: هەمان سەرچاوە :ك٣، ب١.

تێكستانەدا وا دەر ئەكەوێ که چوار جۆر بزوتنەوە هەیە که بریتین لە گۆڕان و بەم شێوەیەن:

- گۆڕانێك كە كار ناكاتە سەر هەیولای ... تەختەیەك كورسی لێ دروست ئەكرێ .. كە بوو بە كورسی فۆڕمی كورسی وەرئەگرێ بەلاّم كەرەسە، تەختەكە، هەیولاكە هەروەك خۆی ماوەتەوە .
- گەشە كردن و كەم بوون...
- پەیدابوون و لەناوچوون . Coming to be -Passing away ئەمەش هەمیشەییە و بەردەوامە، وەك لەدایك بوون و هاتنە دنیاو دروستبوون و مردن و لە ناوچوون و فەوتان.
- گواستنەوە لە جێگایەكەوە بۆ جێگایەكی تر... هەر ڕوداوێكیش كە لەم جیهانەدا ڕوو ئەدات بە هۆی ئەم چوار گۆڕانەیە.

لێرەدا زانیمان بزووتنەوە چییەو چەند جۆرەو چۆن بریتییە لە گۆڕان ... بەلاّم با بزانین ئایا بزوتنەوە لە ساتێكدا دەستی پێكردووە كە لەوەو پێش نەبووە؟ ئەگەر بزوتنەوە لە ڕۆژێكی دیاریكراودا دەستی پێكردبێ ئەبێ ڕۆژێك بێت ئەم بزووتنەوەیە نەمێنی و هیچ شتێك نەجولێتەوە؟ یان ئەگەر بڵێین هەردوو وشەی سەرەتاو كۆتایی لێرەدا بێ مانان ئەوا ئەگونجێ بڵێین بزوتنەوە سەرەتای دەست پێكرن و كۆتای هاتنی نییە؟ ئایا ئەبێ لەو باوەڕەدا بین كە بزوتنەوە هەر هەبووە و هەر بە نەمری ئەمێنێتەوە و هەرگیزا و هەرگیز لەناو ناچێت....؟. بە باوەڕی ئەرستۆ بزوتنەوەی كۆنە، ئەزەلییە، سەرەتای دەستپێكردنی نییە،لەبەر ئەوە كۆتاییشی نایەت و ئەبەدییەو لەناو ناچێت ، چونكە ئەگەر وا نەبووایەو بزوێنەری یەكەم نەئەبوو تەواوو ئەزەلیی و ئەبەدی بێت و داهێنانی بزوتنەوەش لەكاتێكی دیاریكراودا نیشانی گۆڕانی ویستی (ارادە) خواوەند ئەبوو كە ئەویش لەمەوە دوورە(*). لە بارەی – هۆیەكانەوە– ئەرستۆ لەو باوەرەدا بووە كە چوار چەشنە هۆ هەیەو.. بەم جۆرە بابەتكە روون ئەكاتەوە:

---

* بە باوەڕی ئەرستۆ :بزوێنەربی یەكەم و كات و بزوێنەرەو هەیوّلا ئەزەلین. ئەم تیۆرە بنەڕەتی ڕێبازەكەی ماموّستای یەكەم.

با سەرنجێك لە پەیکەری سوقرات بدەین کە لە گورەپانێکی پایتەختی یۆنان دنراووە، با بزانین چەند هۆی تێدا بەدی ئەیکەین: پەیکەرکە لە مەڕمەڕ دروستکراوە و بیٚ گومان هونەرمەندیك دروستی کردووە؟... لەم پەیکەرەدا ئەم هۆیانە ئەبینین[1]:

یەکەم : مەڕمەڕەکە، ئەمەش پیٚ ئەوتریٚ هۆی ماددی .

دووەم: ئەو وەستایەی دروستی کردووە ئەویش پیٚ ی ئەوتریٚ هۆی بکەر.

سێیەم: مەبەست لە دروستکردنی ئەم پەیکەرە چی بووە. ؟ ئەمەش هۆی ئامانجەکی پیٚ ئەوتریٚ .

چووارەم: روخساری پەیکەرەکە کە تەواو بووە، هۆی فۆڕمیی پیٚ ئەوتریٚ.

ڕابەری لۆجیك دوای ئەمە ئەڵیٚ:

ئەگەر جارێکی تر بەم چوار خاڵە بچینەوە و لە پەیکەرو کەرەسەو دروست کردن و ڕوخسارەکەی وردبینەوەو ، بۆمان دەرئەکەویٚ کە هۆی دووەم و سێیەم و چوارەم (بکەرو ئامانجەکەی و فۆڕم) پەیوەندیان بە یەکترییەوە هەیە چونکە هەرسێکیان لە ئەنجامی دروستکردنی پەیکەرەکەوە هاتونەتە کایەوە لەبەر ئەوە ئەبیٚ هەر سێکیان بەیەك هۆ دابنرێن و پێیان ئەڵێن هۆی فۆڕمی، یەکەمیشیان هۆی ماددییە... کەوابوو دوو هۆمان هەیە:

هۆی ماددی و فۆڕمیی.... جا بۆیە دیسانەوە گەیشتینەوە ئەو ئەنجامەی کە باسی میتافیزیقادا پێی گەیشتبووین وتمان هەموو شتێك لە هەیولا و فورم پێك هاتووە تەنیا خواوەند نەبیٚ کە لە ماددەوە دوورەو تەنیا فۆڕمی ڕووتە.

بە باوەڕی ئەرستۆ چەند بەڵگەیەك بوونی جێگاو شوێن ساخ ئەکەنەوە و لە مانەوە ئەگەینە ئەوەی باسی جێگا بکەین:

من ئێستا لەسەر ئەم کورسییە دانیشتووم و توٚزێکی تر هەڵئەستم و یەکێکی تر لەسەر هەمان کورسی دا ئەنیشیٚ ... واتا " یەك لە دوای یەك هاتنی ئەو لەش و کەسانەی بە نۆرە لە یەك جێگا دائەنیشن "[2] بەڵگەی بوونی جێگایە ... تەنانەت ئەگەر سەرنجێکیش لە ماتماتیك بدەین هەمان بەڵگەمان دێتە دەست ... " ماتماتیك هەر چەندە بابەتێکی ڕووتە واتا پەیوەندی بە ماددەوە نییە بەڵام ساخی ئەکاتەوە کە جێگا هەیە....هەر چەندە ئەو شتانە کەرەسەو بابەتی ئەم ئەڵقەن بابەتی مێشکن و

---

[1] ئەرستۆ: هەمان سەرچاوە ن ك٢ ، ب٣ (ل:١٣١) ... ئەو پەیکەرەی ئەرستۆ لەو کتێبەیدا باسی ئەکات لە مەعدەن دروست کراوە و هیٚ سوقرات نییە... بەڵکۆ ئێمە خۆمان ئەو ناوەمان لیٚ نا.

[2] ئەرستۆ: علم الطبیعة، ك٤، ب٢، ( ل:١٨٢).

له بیردا هەن بەڵام سەبارەت بە ئێمە ئەو بابەتانەی ماتماتیك جێگایان ئەكاتەوە و مێشك جیایان ئەكاتەوە... بەو شێوەی كە بە پێی پێویست لە لای ڕاست یان لە لای چەپ دایان ئەنێ..."[1] كە زانیمان جێگا هەیەو بە بەڵگە بۆمان ساخ بۆوە پێوستە بزانین چەند جۆرو جێگا هەیە.

جێگا بە مانای گشتی.

جێگا بە مانای تایبەتی[2].

كە ئەڵێین تۆ لە ئاسمانی ئەوا تۆ لە هەواش دای چونكە هەوا لە ئاسماندا هەیە، دووەمیش كە ئەڵێی من لە سەر زەویم تۆ لەسەر زەویی... جێگاش درێژیی و پانیی هەیە چونكە تەنیا ڕووە...بۆ نموونە ئەگەر ئاو لە پەرداخدا بێت چۆن ئەتوانین ئەم جێگای ئاوە كە پەرداخەكەیە دەست نیشان بكەین... لە وەڵامدا ئەڵێین جێگای ڕووبەری ئەولەشەیە كە شتی تێدایە ... واتا ڕووی ناوەوەی ئەو شتەیە كە بەر ئەوشتە ئەكەوێ كە تێیدایە... واتا جێگای (پەرداخەكە) بریتیە لە ڕووبەری ناوەوەی پەرداخەكە كە بەر ئاوەكە ئەكەوێ ئاویش لە پەرداخەكە دایە... باشە ئەو ژوورەی كە ئێستا منی تێدام و بە جێگا ناو ئەبرێ لە تەختایی و زەوی و چواردیوارو بنمیچ پێك هاتووە.: ئەگەر هەڵی وەشێنین و تێكی بدەین... ئایا ئەوكاتە ژوورەكە ( بەجێگا) ئەمێنێتەوە یان نا؟ ئەم پرسیارە بۆ بابەتێكی تر ڕامان ئەكێشێ .. چونكە ئەبێ لەسەرەتادا بزانین جێگا چەند بەشەو ئەو مەرجانەی كامانەن كە جێگایەتی جێگا ساخ ئەكەنەوە؟

لەبارەی كاتەوە ئەرستۆ بە بەڵگەی بەهێز ساخی ئەكاتەوە كە كات هەیە ... كات پێوەری بزوتنەوەیە و بزوتنەوەش هەیە جا لەبەر ئەوە:

مەحاڵە كات نەبێ یاخود لەناو بچێ... چونكە بزوتنەوە ئەزەلی و ئەبەدییە[3] و هەردوكیشیان توندوو تۆڵ بە یەكەوە بەستراونەتەوە هیچیان بە بێ ئەوی تریان نابن و :

(كات پیوەری بزوتنەوەیە سەبارەت بە پێشكەتن و دوا كەوتن ... كەوابوو كات لەلایەكەوە بزوتنەوەیەو لە بزوتنەوە دێت و بزوتنەوەش بە ژمارە ئەپێورێ...

---

1 ئەرستۆ: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ك٤ ، ب٢(ل:١٨٣) . كە ئەلێن سێگۆشەو دوو لاكێش... مێشك بە پێی پێویست یەكێك لەم دوو شتانە لە لای ڕاست یاخود لە لای چەپدا ئەنێ . لای چەپ و لای ڕاست جێگان، كەوابوو جێگا هەیە

2 ئەرستۆ: هەمان سەرچاوە پێشو، ك٤ ، ب٤ ،(ل:١٨٥).

3 ئەرستۆ: علم الطبیعة ك٤، ب١٩، (ل:٣٢١).

بەڵگەش ئەوەیە کە ئیمە بە ژمارە حوکم ئەدەین  کە ئەو شتە زۆر ترەو ئەوی تریان کەمترە. بەڵام لەکاتدا حوکم بەسەرگەورەیی و یاخود بچووکی بزتنەوەدا ئەدەین[1] .
لە مەسەلەی باسکردنی سروشت بە گشتی، ئەرستۆ کەوتۆتە هەندێ هەڵەوە، بەڵام ئۆباڵی ئەم هەڵانە ئەکەونە ئەستۆی ئەو دۆخەی کە تێیدا ژیاوە و باروزروفی ئەوساو پەرەسەندنی کۆمەڵ هەر ئەوەندەی هەڵگرتووە، بۆ نموونە ئەو هەڵانەی ئەرستۆ کردوونی... لەو باوەڕدابووە کە کێشە کردنی شت (الجاذبیة) بریتییە لەوەی هەرشتە لە شوێنی سروشتی و شیاوو گونجاوی خۆی ئەگەڕێ، ئاگرو دووکەڵ بۆیە بەرەو سەر ئەچن چونکە جیگایان لە ئاسمانەوە یاخود لەسەروی فەلەکی مانگەوەیە بەردیش بۆیە ئەکەوێتە خوارەوە و چونکە جێگاکەی خوارەوەو لەسەر زەوی خوارەوەی  فەلەکی مانگە... یاخود وەك ئەرستۆ باسی کێشەکردنی مانگ ئەکات ...
(بە پێی قانوونی سروشت لەشی سووك.ئارەزووی لەبەرەو ژووروو بەرەو سەر چوونەلەشی قورسش هەر ئارەزووی لەبەرەو خوار چوونە[2] و هەموو شت ( بە پێی چارەنووس و سروشتی خۆی بۆ شوێنی تایبەتی خۆیی را ئەکیشرێت).
ئەرستۆ گەردون ئەکات بە دووبەش .

١.  سەرو فەلەکی مانگ
٢.  خواروو فەلەکی مانگ

سەرو فەلەکی مانگ لە ئەستێرەو ئەسیر پێك هاتووە، ئەستێرەکان زیندوونو بە شێوەی بازنەیی  ئەجوڵێنەوە.. بەڵام جیهانی خواروو فەلەکی مانگ بە پێچەوانەی، یەکەمەوە جیهانی گۆڕانە. جیهانی چوار کەرەسەکەیە( ئاو ، هەوا، گڵ، ئاگر) ، جیهانی دروست بوون و لەناو چوون و ماددەیە.. گەردونیش لەسەر شێوەی گۆیەك وایەو هەموو شتێك تیایدا لە هەرە کۆنەوە بە یەك شێوەی نەپساوە ئەجوڵێتەوە.. ئەرستۆ بە پێچەوانەی ئەفلاتونەوە باوەری بە پەرەسەندن هەبووە، هەموو شتێك بە پێی ئەو هێزەی شاراوانەی تیایاندان پەرە ئەسێنێ و ئەو پەرەسەندنەش گۆڕانە بەرەو کامڵ بوون، بەرەو وەرگرتنی وێنەو فۆرم... واتا پەرەسەبندن دروستبوونی شتێکی تازە نییە بەڵکو گواستنەوەیە لە بوونەوە  لە حاڵەتی هێزەکی بۆ حاڵەتی

---

[1] ارسطو: علم الطبیعة، ك٤، ب٧، ص١٩٦.

[2] ارسطو طالیس: الكون والفساد، ك٢، ب٨، ف٥، ص٢٤١، ترجمة: احمد لطفی السید، القاهرة، لجنة التالیف واترجمة والنشر١٩٣٢.

کردەکـی(فیعـل) یـاخود وەك هێگـلْ ئـەڵێ پەرەسـەندن بریتییـە لـە( گواسـتنەوە لـە شاراوەوە بۆ حاڵەتی ئاشکرا بوون [1]..

ئەو پەرەسەندنەش بە هۆی، هۆکـانی ماددییـەوە نییـە کـە بـەرەو ئـەنجامی سروشـتی بەرن لە دواوە پاڵی پێوە نێن... بەڵکو بە هۆی هۆکانی ئامانجەکییەوە [2] ( الغائیـە) کە لە پێشەو ە ڕای ئەکێشن و ... هەموو گیان لەبەرەکان بەرەو مەبەستێك ڕائەکێشن و ئەو ئامانجەش لە ئەسڵدا بە شێوەی نادیارو شاراوە هەیە. گەشەکردنیشی هـەر بـە پێی ئەو ئامانجەیە پەیدا بوونی جیهـانیش بـە هـۆی ئامـانجێکی سـەروویە یـاخود بـە هـۆی چـاوەدێری خواوەندەوەیـە.. بـە پێیـە سروشـت پارچـەیە و تۆپەڵەیـەك (کتلـە) ڕووداوی بێ سەرو شـوێن نییـە بـەڵکو ئـەو شـتانیە ڕوو ئـەدەن سـاخی ئەکەنـەوە کـە ئامانجێکی هەیە بۆ ئەو ئامانجە هەنگاو ئەنێ، ئەگەر بپرسین بۆ چی ئەم گوللەیە بەر کەللە سـەری ئـەو چـەتەیە کـەوت؟.. ئەرستۆ لـە وەڵامـدا ئـەڵێت : ئامـانج و شـوێنی سروشتی ئەم گوللەیە کەللە سەری ئەو چەتەیە!!

## نەفس و دەروون

ئەرسـتۆ بـۆ ئـەم بابەتـە کتێبێکـی بـە نـاوی De Anima واتـا نـەفس و دەروون، داناوە... لەو کتێبەدا نەفس و ئەقڵ و بایەلۆجی تونـدوتۆڵ بەیەکـەوە بەسـتۆتەوە ... چـونکە وای بـۆ چـووە کـە نـەفس سەرچـاوەیی و مەبـدەئی زینـدوویتی هـەموو لاشەیەکی زیندوو گشت هێزەکانیەتی. هەروەها ڕابەری میتافیزیقا لەم کتێبەدا بیرو ڕای فەیلەسـوفەکانی پـیش خـۆی شـیکردوتەوە و لـە بیـژنگی داون بـۆ ئـەوەی بگاتـە ئەنجام کە ناساندنی نەفس و دەست نیشانکردنیەتی .

ئەرسـتۆ نـەیتوانیوە خـۆی لـە دوو فاقییەکـەی ئـەفلاتون ڕزگـار بکـات بۆیـە نـەفس لـە لەش جیا ئەکاتەوە و ئەگاتە ئەو ڕادەیەی بلێ نەفس و لەش وەك هەیولا و فۆرم وان.

---

[1] امام عبدالفتح امام: المنهج الجدلی عند هیجل، ص٧٧.شهرستانی بە زمانی عربی بەم جۆرە ئـەم رستەیەی نوسیوە:" کون بعد کمون".

[2] جورج سارتون: تاریخ العلم ، ك٣، ص١٩٢.

" نەفس یەکەم ئەنتلێخیای لەشێکی سروشتی ئۆرگانیکییە کە بە هێزێکی ژیان و زیندەگییە"[1].

واتا نەفس یەکەم پلەیە لە پلەکانی بوون لە لەشێکی سروشتیدا کە بە هێزێکی ژیان لەو لەشەدا هەیە و لەشیش بەم پێیە ئەندام و دەست و قاچ و سەری... هتد، هەیە. یاخود وەکو ئەرستۆ تالیس خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێ: نەفس گەوهەرە، فۆرمی لەشێکی تەبیعیە کە بە هێزێکی زیندووە... ئەو گەوهەرەش یەکەم ئەنتلێخیایە... ئەم یەکەم ئەتلێخیایە دوو مانا هەیە:

- جارێك وەك زانست .
- جارێکی تر وەك بەکارهێنانی زانستەکە.

لێرەدا نەفس وەك یەکەم جار دەرئەکەوێ(زانست)ە .. نووستن و بەخەبەربوون، چونکە بەخەبەربوون بەکارهێنانی زانستەکەیەو خەوتنیش لە بوونی زانست ئەچی بە بێ بەکارهێنانی. کە ئەڵێین لەشی سروشتی ئۆرگانیکی .. مەبەستمان جیاکردنەوەی ئەو لەشەیە لە لەشی نا سروشتی و ... ئۆرگانیکییەش ئەوەیە لەش یاخود لاشە ئەندامانی هەیە وەك دەست و قاچ ...هتد.

ئەرستۆ لەو باسەیدا وای دەرئەخات کە نەفس وێنەی گەوهەریانەو یەکەم کرداری لەشە هەروەك چوون بینین یەکەم کرداری چاوە. بە باوەری ئەرستۆ چەند جۆرە نەفسێك هەیە کە لە سادەترین جۆرەو دەست پێ ئەکەن و بە بەرزترین جۆر کۆتاییان دێت :

نەفسی خۆراك خواردن:

ئەمەش لە هەموو زیندەوەرێکدا هەیە.

نەفسی هەستکار:

لە دوای نەفسی یەکەمەوە دێت و لە هەموو زیندەوەرێکدا هەیە و ئەرکەکانیشی چیژو بۆن کردن وبیستن و بینینە .

نەفسی ئاقڵ:

[1]ئەم رستەیە بە عەربی بەم شێوەیەیە ( كمال اول لجسم طبيعي الى ذي حياة بالقوة) بڕوانە: ارسطو طاليس : كتاب النفس، ك٢، (٤١٢، ١، ٢٥)، ص٤٢-٤٣، ترجمة المرحوم الدكتور احمد فواد الاهواني، القاهرة، ط٢، مطبعة عيسى البابي الحلبي١٩٦٢.

ئەمەش لە ئادەمیزادا هەیە لە هەموو نەفسەکانی تر بەرزترو پێشکەوتووترە. بە بڕوای ئەرستۆ نەفس سادەیەو دابەش ناکرێ و یەك پارچەیە، بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە:

" ئەگەر لقی درەختێك ببڕین درەختەکە وشك نابێت، هەروەها مێش و مەگەز ئەگەر قاچێك [1] یان دەستێکی لێ بکەینەوە هەر ئەژیا".

بەلآم لەگەڵ ئەمەشدا نەفس چەند ئەرك و فرمانێکی تایبەتی هەیە کە بە زنجیرە لە خوارەوە بەرەو سەر ئەمانەن

یەکەم: هێزی خۆراك خواردن.

یەکەم هێزە لە هێزەکانی نەفس... ئەمەش لە نەفسی نەباتییدا هەیە و بریتییە لە خۆراك خواردن و گەشەکردن و لە دایك بوون. سێ لق لەم لایەنەدا بەدی ئەکرێ :

- ئەو گیانلەبەرەی خۆراك ئەخوات.
- ئەو خۆراکەی ئەیخوات
- ئەو خۆراکەی ئەیدات.

یەکەمیان ئەو لەشەیە کە نەفسی تێدایەو دووەمیان خۆراکەکەیەو سێیەمیان یەکەم نەفسە کە خۆراکی ئەدرێتێ [2]

دووەم: هێزی هەست کار: [3]

بە باوەڕی ئەرستۆ جیاوازی نێوان هێزی خۆراك خواردن و هێزی هەستکار لەوەدایە کە یەکەمیان ماددەی لەگەڵ دایە و هێزی هەستکار تەنیا وێنەی فۆڕمی شتەکە وەرئەگرێ.. ئەمانەش بریتییە لە پێنج هەستەکان جگە لە خەیاڵ و بیرکردنەوە... خەیاڵیش ئەو وێنە جۆر بە جۆرانە بەکار ئەهێنێ کە لەمەوبەر بەهۆی هەستەکانەوە دروست بوون و دور نییە بەرەو پاشە ڕۆژیش پڕ بکات و... خەیاڵ بنچینەی بیرکردنەوەیە لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا کە بیر کەوتنەوە تەنیا پەیوەندی بە ڕابردووەوە هەیە.

سێیەم: هێزی ئەقڵ:

ئەم هێزە تەنیا لە ئادەمیزادا هەیە ... ئەکری بە دوو بەشەوە:

- هێزی کارتێکراو .

---

[1] ارسطو طاليس: كتاب النفس ، ك٢، ٤١٣ ب١٠.

[2] ارسطو: هەمان سەرچاوە ل ٥٨، (٤١٦ ب٢٠ و٢٥) .

3 ارسطو: هەمان سەرچاوە ل٥٩، (٤١٧-٤٢٥).

یەکەمیان ئەقڵێکی هەیولاییەو بەبێ شتێکی تر کە هەمیشە کردەکیی (فیعل) بێت ناتوانێت پەی بە شت بەرێ... بۆ لەیەکتر جیاکردنەوەی ئەم دوو هێزە ئەقڵە ئەرستۆ نموونەی تیشك ئەهێنێتەوە و ئەڵێ: تیشك لە لایەکەو، ئەو ڕەنگانەی هێزەکین ئەکات بە ڕەنگی کردەکی (فیعل) ئەمەش ئەقڵیی کاریگەرە.. ئەو ئەقڵە نەمروو ئەزەلییەوە لە لەشەوە جیاوازەو ئەوەی پێشوشیان تێك ئەچی و نامێنی و ئەفەوتی... بەڵام هەردووکیان لە نەفسی ئادەمیزادە هەن.

هەر چەندە ڕەخنەی توندو تیژ ئاڕاستەی ئەرستۆ بکرێت دەربارەی ئەم بەشەی فەلسەفەکەی کە سایکۆلۆجییە نابێ ئەوە لە بیر بچێ کە لە سەردەمی ئەرستۆدا بە پێی قۆناخی ئەوسای کۆمەڵ و پەرەسەندنی زانست لە توانادا نەبووە ئەقڵێکی لە ئەقڵ و مێشکی ئەرستۆ زیرەك تر بێتە کایەوە.

---

1 ارسطو: هەمان سەرچاوە ...ل ١١٢( ٤٣٠ ا ١٠ و١٥ و ٢٠ و ٢٥ ).

ئەگەر سوقراتی دانا فەلسەفەی لە ئاسمانەوە هێنابێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی ئەوا بێ هیچ سل'کردنەوەیەك ئەرستۆ یەکەم فەیلەسوفە کە بەردی بناغەی ڕێبازیکی ڕێکوپێکی زانستی ئاکاری داناوە.. ئەرستوی زانا کتێبێکی بۆ ئەم مەبەستە داناوە ناوی ناوە(ئاکاری نیقۆماخوس[1]) تیایدا باسی ئاکارو چاکەو بەختەوەری و فەزیلەت و ئەرك و فرمان و وەزیفە ئەکات. کتێبەکەش لە دەفەسلْ پێك هاتووە کەخۆی بە دەکتیبی داناوەو ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیەیە:

فەسلْی یەکەم: باسی چاکەی مروڤایەتی ئەکات و فەسلْی دووەم تاوەکو پێنجەم باسی فەزیلەتەکانی ئاکارە کە ئەیانکات بە دوو بەشەوە: فەزیلەتەکانی ئاکار و فەزیلەتەکانی عەقل. فەسلْی شەشەمیش دەربارەی فەزیلەتی عەقلییەو فەسلْی حەوتەم دەربارەی داوێن پاکیی و شەهوەت و لەزەتەو فەسلی هەشتەم و نۆ دەربارەی دۆستایەتیە و فەسلْی دەییەم دەربارەی لەزەت و بەختەوەرییە.

ئەرستۆ دەریا عیلم لە سەرەتای کتێبی ئاکاری نیقوماخوسدا باسی ئەوە ئەکات کە ئایە ئەبێ مەبەست لە ڕەفتارو کرداری ئادەمیزاد و زانست و هونەرو لقەکانی تری بیری ئادەمیزاد چی بێ؟ ... دووای لێکۆڵینەوەیەکی ورد ئەگاتە ئەو باوەڕەی کە هەموو شتێك ئامانجێکی تایبەتی هەیەو لە هەموو شتێکدا ئامانجەکیی بە ئاشکرا بەدی ئەکرێ:

( لە هەموو هونەرەکاندا، لە هەموو لێکۆلینەوەی ئەقلْییە ڕێك و پێکەکاندا، لە هەموو کردارێکماندا و لە هەموو مەبەست و مەرامێکی ئاکاریماندا ( وا دەر ئەکەوێ ) کە ئامانجەکانیان شتیکە لە -چاکە- کە ئەمانەوێ پێی بگەین جا بۆیە دەست نیشانکردنی چاکە لە جێگای خۆیدایە بەو پێیەی کە: بابەتی هەموو هیوایەکمان بێت[2]) .

بەلاْم ئێمە ئەزانیین کە کرداری ڕۆژانەی ئادەمیزاردو زانست و هونەرەکان زۆرن... کە وابوو دەبێ ئامانجی ئەم کردارو زانست و هونەرانەش کە چاکەیە، زۆر بن و لە ژماردن نەیەن؟! لە وەلاْمی ئەم پرسیارەدا ئەرستۆ وای بۆ ئەچێ کە ئەم ئامانج و

---

[1] ئەم کتێبە لەلایەن خوا لێخۆشبوو (احمد لطفی السید)وە کراوە بە عەرەبی و لە سالْی ١٩٢٤ لە میسر چاپ کراوە. icomachiane ethica.

[2] ارسطو طالیس: علم الاخلاق الی نیقوماخوس، ص١٦٨، (ك١ ل١) القاهرة: ترجمة: احمد لطفی السید مطبعة الدار الكتب المصرية ١٩٢٤.

چاکانە زۆرن بەڵام ئەگونجێ بە جۆرێك ڕیز بکرێن کە هەر یەکەیان ڕێگا بێ بۆ ئەوی تریان... ئەگەر دکتورێك دەرمانێك بدۆزێتەوە، وەك ئامانجیك، ئەوا ئەو دۆزینەوەیە ئامانجێکی تری لە دواوەیە کە چاکردنەوەی نەخۆشە و چاك کردنەوەی ئەو پیاوە نەخۆشەش وەك ئامانجێك، ئامانجێکی تری لە دواوەیە کە ئەویش ئامادەکردنی نەوەیەکی ساخ و سەلامەت و لەش ساخ و دوور لە نەخۆشییەوەیە... دیسانەوە ئەرستۆ ئەڵێ:

(... لەبەر ئەوەی هەموو زانین و بریارێك کە مێشکمان بیدات.. بە ناچاریی بە مەبەستی جۆرێکە لە چاکە- خێر-. کەواتا با ئەو چاکەیە ڕوون بکەینەوە کە بە باوەڕی ئێمە پێەیستە سیاسەت باسی لێوە بکات. ئنجا لە ئەنجامدا بێینە سەر چاکەی باڵا کە ئەتوانین لە هەموو کردارێکی ژیانمادا پەیرەوی بکەین... واتای ئەم وشەیە بە لای کەمەوە لە لای هەموو خەڵکی پەسەندە... نەخوێندەوار و ڕووناکبیر ئەم چاکە باڵایە بە بەختەوەری دا ئەنێن و لەو باوەڕەدان کە خۆشترین چین و چاکترین کردار ئەوەیە کە ئادەنیزاد بەختەوەر بێت[1]).

هەروەك وتمان بە باوەری ئەرستۆ ئامانج و چاکە وەك زنجیرێك وان کە ئەڵقەکانی بەیەکەوە بەستراونەتەوە و یەك لەدوای یەك دێن... بەڵام ئەم زنجیرەیە هەتا هەتایە هەروا بڕ ناکات بەڵکو لە ڕادەیەکدا ئەوەستێ کە ئەویش چاکەی بەرزەو بە باوەڕی هەموو خەڵکیی ئەم چاکەی بەرزە بەختەوەرییە.. ئەم بەختەوەرییەش لە لای هەموو کەس شیرین و پەسندەو ئاواتی بۆ ئەخوازن و هەوڵی بۆ ئەدەن... ئەرستۆ دووای ئەمە ئەڵێ:

دووای ئەوەی بۆمان دەر ئەکەوت کە ئامانجی بەرزو چاکەی بەرز هەن کە ڕێگایەك نین بەرەو چاکایەکی تر کە لە سەرویانەوە بێت و... دوای ئەوەی بۆمان ساخ بووەوە کە ئامانجی ژیان بەختەوەرییە... پێویستە بزانین بەختەوەری خۆی چییەو خەڵکی چۆنی بۆ ئەچن و چۆنی لێك ئەدەنەوە؟ بە باوەری مامۆستای یەکەم، هەرکەسەو بە پێی جۆری بیرکردنەوە و بۆچوون و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەختەوەری لێك ئەداتەوە، هەندێ کەس لەزەتی هەستەکان و هەندێکی تر ماڵ و دەسەڵات و پارەو هەندێکی تر دانایی بە بەختەوەریی دا ئەنێن... بەڵام ئەمانە تا ڕادەیەك لە بەختەوەرییەوە دوورن... چونکە بەختەوەریی نابێ ڕێگا بێت بەرەو شتێکی تر و نابێ وەختەکی بێت... بەڵکو ئەبێ لە خۆیدا ئامانج و هەمیشەیی و

---

[1] ارسطو: هەمان سەرچاوە ... ك١ ب٢ ( ل١٧٥)

بەردەوام بێ و درێژە بکێشێ... کەوابوو ئەبێ سەرلەنوێ بپرسینەوە و بڵێین بەختەوەری چیە؟ ئەم پرسیارە ڕامان ئەکێشێ بۆ ناو جەرگەی فەلسەفەی ئاکاری ئەرستۆ... چونکە ئاکاری مامۆستای یەکەم، ئاکاری بەختەوەرییە... جا بۆیە ئەرستۆ بایەخی بەم لایەنەداوە... ئەرستۆ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە کێشەی بەختەوەری توند و تۆڵ بە مەسەلەی ئەرك و فرمان ئەبەستێتەوەو ئەڵێ[1]: هەموو شتێك لەم جیهانەدا فەرمان و ئەرکی خۆیی لەسەر شانەو جێبەجێیان ئەکات... چاو بۆ بینین و گوێ بۆ بیستن و خامە بۆ نووسین وچرا بۆ ڕووناك کردنەوە.... ئەو شتەش ئەگەر بە باشی ئەرکی سەرشانی خۆی جێ بە جێ کرد، ئەوا ئەو شتە (خامەکە یاخود چرایەکەیە) باشە... لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا ئادەمیزاد، بە گشتی و بە بێ دەست نیشان کردن، وەك ئادەمیزادێك ئەرکی تایبەتی خوی هەیە کە جێ بە جێی ئەکا تو نەبات و ئاژەڵ بەشداری ناکەن؟ ... ئەرستۆ لە وەڵامدا ئەڵێ: بەڵێ ئەم ئەرکەش چالاکی ئەقڵ یاخود ژیانی ئەقڵە بە شێوەیەکی گشتی... ئەو کەسەش کە بە پێی ئەقڵ ئەژیاو ئەقڵ بەکار ئەهێنی ئادەمیزادێکی چاکە( واتا فاضل)ە ... ئەرستۆ ئەڵێ:

(بە باوەڕی ئێمە بەختیاری چالاکی و کاریگەریی نەفسەکە بە فەزیلەتی کامل بڕوات بە ڕێوە.... کەوابوو پێویستە لەسەرمان لە فەزیلەت بکۆڵینەوە.. ئەمەش ڕێگایەکی خێرا ئەبێت بۆ پتر و باشتر تێگەیشتن لە بەختیاریی... فەزیلەت وا دەرئەکەوێ کە لە پێش هەموو شتێکی تردا بابەتی کارکردنی سیاسی ڕاستەقینەیە... واتا وای لە خەڵکی کردووە باش گوێ ڕایەڵی یاسابن).

لە لایەکی ترەوە نابێ ئەوەمان لەبیر بچێتەوە کە ئەرستۆ نەفسی کردووە بە دوو بەشەوە( بەشێکیان خاوەن ئەقڵەو ئەوی تریان لێی بێ بەشە[2] ) و ئادەمیزاد هەردوو خاسییەنی ئاژەل و ئادەمیزادی تێدایە جا بۆیە دوو جۆرە فەزیلەت هەیە:

فەزیلەتی ئاکاری.

فەزیلەتەکانی ئەقڵ.

لە یەکەمیاندا پێویستە ئەقڵ بۆ ڕاگیرکردنی پارسەنگی ئاسودەیی ئادەمیزاد لەگەڵ لایەنەکانی تردا هاوکاری بکات ئەو لایەنانە بریتین لە ( ویژدان و غەریزە و هەڵچوون و ئارەزوو) ... دووەمیشیان بریتییە لە بەکار هینانی تێفکرین و سەرنجدانی بیریی

---

[1] الدكتور امام عبدالفتاح: محاضرات في الفلسفة الاخلاق ص ٦٧، القاهرة دار الثقافة للطباعة والنشر ١٩٧٤

[2] ارسطو طاليس: هەمان سەرچاوەی پێشو : ك١ب ١١ (ل٢١٠).

بۆ گەیشتنە دانایی... بە باوەڕی مامۆستای یەکەم ئەم دوو جۆرە فەزیلەتە لە یەکتر جیاوازن چونکە هەروەك خۆی ئەوڵێ :

( فەزیلەتی ئەقڵ بە هۆی ڕاهاتن و فێربونەوە دەست گیر ئەبێ و پێویستی بە تاقیکرنەوە و کات هەیە. بەڵام فەزیلەتی ئاکاری بەهۆی نەریت و ڕەوشتەوە دیتە کایەوە[1]) ... ئەگەر بڵێین ئەم قسانە تا ڕادەیەك لە جێگای خۆیاندان .. پرسیارێك دێنە پێشەوە ... ئایا بە چ پێوودانگێك ئەتوانین فەزیلەتەکان دەست نیشان بکەین؟ ..یاخود چۆن ئەزانین ئەم کردارە فەزیلەتەو لە نافەزیلەتی جیا ئەکەینەوە؟ بە باوەڕی ئەرستو بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەبێ پەیڕەوی ڕێبازی ناو ڕاستی زێرین بکەین[2].

بە لای مامۆستای یەکەمەوە هەموو فەزیلەتێك ڕاددەی ناوەڕاستە لە نێوان دوو ڕەزیلەتدا کە یەکێکیان زیاد ڕویشتن و ئەوی تریان کورت هێنانە...(فەزیلەت خوو نەریتە، چۆنییەتیەو بە ویستمانەوە بەستراوەتەوە... ناوەڕاستی دوو ڕەزیلەت*[3]).... یەکیکیان زیاد ڕۆیشتن و ئەوی تریان کورت هێنانە.

---

1 ارسطو: هەمان سەرچاوە: ك٢ ب١ (ل٢٢٥).

2 Golden middle

3 ارسطو طالیس: هەمان سەرچاوە.. ك٢ ب ٦(ل٢٤٨).

## سەرەتا

ئەم قۆناخە لەگەڵ گەشتەکانی ئەسکەندەر بەرەو ڕۆژ هەلآت و فراوان بوونی ئیمپراتۆریەتی یۆنان و مردنی ئەرستۆوە دەست پێ ئەکات کە لە مێژووی فەلسەفەدا بە قۆناخی هلنستی ناو ئەبرێ و تیایدا دوو ڕێباز سەریان هەڵدا کە ئەمانەن:

ڕێبازی ئەپیقۆرس.

ستۆیسیزم[1].

پێش ئەوەی بچینە سەر باسکردنی فەلسەفەی ئەم دوو ڕێبازە وای بە باش ئەزانین کە سەرنجێکی خێرا لە دوخی سیاسی و کۆمەلآیەتی و فەلسەفی ئەو سەردەمە بدەین بۆ ئەوەی بتوانین بەپێی توانا چەند گۆشەیەکی تاریکی ئەم دوو ڕێبازە ڕوونـاك بکەینەوە...

وەك ئاشکرایە ئەسکەندەری گەورە دووای ئەوەی هاتە سەر حوکم هێرشێکی گەورەی هێنایە سەر ڕۆژهەلآت و چەند وڵاتێکی داگیر کرد و خستنیە سەر ئیمپراتورییەکەی خۆیی و .. لە ئەنجامی ئەم هێرشانەو لە ئاکامی ئەو وڵات خستنە سەر یۆنانەوە تێکەلآوییەکی بیری وگیانی لە نێوان گەلانی ڕۆژهەلآت ویۆناندا بەرپا بوو... واتا هەرچەندە ئەم هێرش و شەڕو شۆڕانەی ئەسکەندەر مەبەستی سیاسی وعەسکەری و ئابوورییانەی هەبوو بەلآم لایەنێکی تری گرینگیان گرتەوە کە لایەنی فیکریو فەلسەفە بوو، فەلسەفەی یۆنان گەیشنە ئەو وولآتانەی کە ئەسکەندەرو لەشکرەکەی داگیریان کردبوون.. .بیرو ڕاو ئەفسانەو نەریتی ئەو وولآتانەی ڕۆژهەلآتیش گەیشتنە یۆنان، بە تایبەتی باوەڕی زەردەشت و ئەفسانەو لاهوتی هیندستان. سۆفیزم و زوهدی ڕۆژهەلآت وورده وورده خۆیان خزاندە نێو بیرو ڕەوشتی گەلی یۆنانەوە... بەلآم دوای مردنی ئەسکەندەر ئەم قەرالیچەیە شەقوپەق کراو بەسەر چەند فەرمانداریکدا دابەش کرا.. وردەووردە ئاشوب و ئاژاوە جیگایان بە ئاسودەی وهێمنی لەقکرد...گرۆڵەی سەربەستی کەسایەتی جاران کەوتە لێژی وبە هۆی ڕۆژلآتەوە دیکتاتوریەت لە سیاسەت داو گیانی خۆ بەدەستەوەدان و ست

---

[1] بە عەربی – الرواقیە – ی پێ ئەوترێ وبە ئینگلیزی بە stoicism ناسراوە(الرواق) لە وشەی (دالآن)ەوە نزیکە.

بوون سڕیی و تەزین لە یۆناندا ڕەگی داکوتا.. جا بۆیە لە هەردوو ڕێبازی ئەپیقۆر و ستۆیسیزمدا ئەمانە ئەبینین: خۆبەدەستەوە دان و قبوڵ کردنی تێشکان و بەچۆکدا هاتن لەگەڵ تەقەلادان بۆ لەبیر بردنەوەی ئەم تێشکانە لە ئامێزی لەزەت و شادی وخۆشی فەلسەفی وتیۆری تایبەتی دەربارەی چۆنیەتی گەیشتە بەختیاری، جا با کۆیلەیەتی و سەرشۆڕی و چەوساندنەوەش لە ئارادابن...!!

گرنگ ئەوەیە (کەهەر چەندە ئەمانە وەك شتێکی سەلمێندراو وان)چۆن بەختیار ئەبین و چۆن سوود لە _لەزەت_ وشادمانی وەرئەگرین؟ زوهد لە ژیانی گشتیدا و ڕاکردن و دەست بە دامێنی دەروونەوە گرتن و گۆشەگیریش ڕەگ و ڕیشەیان داکوتاو ئاواتی خەڵکی_ بەتایبەتی فەیلەسوفەکانی ئەو سەردەمە _بە دیهێنانی دڵنیایی سەلبی بوو بۆتاکەکەسان کە لەلای ئەبیقۆر بە ئەتراکسیاو لەلای ستۆیسیزم بە ئەپاتیا ناوی دەرکردوو ئەم دڵنیاییە بریتییە لەم دوو لایەنە:

- گەرانەوە بوجیهانی ناوەوەو ناخ و دەروون و گوێنەدان بە هیچ شتێکی تر کە لەدەرەوە یاخوود لە گەردونەدا هەبێ ... بەم شێوەیە گوشەگیریی و گرژبوون بەسەرخۆو کربوون بەسەر ناخدا تەشەنەی کرد.
- ئاسودەیی و دەروون و هەڵنەچوون و دوورکەوتنەو لە هەموو شتێك کە کار بکاتە سەر نەفس و ویژدان.

لە لایەکی ترەوە دەسەڵاتی دەوڵەتی شار [1] نەماو خەڵکی گەیشتنە ئەو ڕادەیەی بڕوایان بەوە نەمێنێ کە پێویستە لایەنگیری شارێکی تایبەتی خۆیان بکەن یاخود شانازی بەوە بکەن کە خەڵکی ئەسینان و خەڵکی شارێکی تر نین... جیهان بوو بە نیشتمان... بەڵام بەبێ ئەوەی بایەخی پێ بدرێت...

گرنگ ئەوەیە شارەکەی جاران وەك لەمەوبەر وابوو ئێستاکە وا نەماوە و خەڵکی بە پیروزی دانێن و ڕێزی ناگرن... بە تێکرایی دیمەنە ئاشکراکانی ئەو سەردەمە ئالۆزە لە بوواری فەلسەفەدا و سەبارەت بە ئادەمیزاد لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا خۆیان نواند:

- ئەبێ چۆن سەرنجی کاروباری ڕۆژانە بدرێ؟
- ڕەوشت و ئاکار.
- ئاین و ژیانی ئەو دنیا و نەمریی.

---

[1] Ciyt state

- ترسی مەرگ و گیان دەرچوون و چۆنیەتی دڵنیابوونی دەرونی ماندوو شەکەت و بۆ ئاسودەیی و سەرفراز بوون.

ئەمە بوو بە تێکرایی ڕوخسارو ناوەرۆکی چەرخە هلنستی کە دوای ی مردنی ئەسکەندەر و پەرشو بلاوبوونەوەی ئیمپراتۆریەتەکەی هاتە کایەوە.

# ئەپیقوْرس

ڕابەر و دامەزرێنەری ڕێبازێکی فەلسەفەیە کە بە ناوی خوْیەو ناونراوە لە ساڵی ۳٤١ی پیش زاین لە دورگەی ساموس لە دایك بووە. لە ساڵی ٢٧٠ پێش زاین بە نەخوْشیی میزگیران و دیزانتریا کوْچی دوایی کردووە. لە شاری ساموسدا خوێندویەتی و هەر لە تەمەنی چواردە ساڵیەوە حەزی لە فەلسەفە کردووە. سەری لە شاری تیوس داوە و لەوێ نوسیفانس ناویك فەلسەفەی دیموکریتسی پێ وتووە کە کارێکی گەورەی کردوْتە سەر ژیان و فەلسەفەکەی.. لە تەمەنی سی ساڵیدا لە شاری میتلین جێگیر بووە.. لە دواییدا چووە بوْ شاری لامبساکوْس و دەستی یە فەلسەفە وتنەوە کردووە و قوتابی و لایەنگیرانی لە دەور کوْبوونەتەوە... لە ساڵی ٣٠٧ دا گەڕاوەتەوە بوْ ئەسینا... لە دواییدا خانوو و باخچەیکی لەشاری ملیاتا کڕیوەو تا مردووە لەوی ماوەتەوە.

ئەپیقورس فەیلەسوفێکی سەرنج ڕاکێشە.. هەندێك هیرشی ئەبەنە سەر و لە نرخی کەم ئەکەنەوە و هەندی کی تر بە پایەی بەرزی دائەنێن.. . بوْیە سەیر نییە کە کارل مارکس لە کتێبی ئایدیولوجیای ئەلمانیاییدا ستایشی ئەکات و ئەڵێ : هەوڵی داوە مێشکی خەڵکی ڕووناك بکاتەوە. ئەپیقوْرس بەرهەمێکی زوْری هەبووە بەلاّم هەموویان فەوتاون و لە سێ نامە بەو لاوە هیچی تری لە پاش بە جێ نەماوە... قوتابییەکی دلسوْزی هەبووە بە ناوی (لوْکریتس) و ئەو قوتابییە بە شیعر فەلسەفەی ماموْستاکەی توْمار کردووە.

ترسان لە پلارو دەستی قەدەر[1]

ئەگەر ئەم سێ ترسە لە دڵ و دەروونی ئادەمیزاددا نەمێنێ، نەفس ئاسوودە دەبیت و ئەتراکسیا دێتە کایەوە... ئیتر با بزانین ئەو فیزیقایە و سروشتە لە لای ئەپیقوْرس کامەیە؟

بەلای ئەپیقورسەو هەموو شتێك ( مادده بێ یاخود گیان) لە شتی وردیلە پێك هاتووە کە پێی ئەوتری ئەتوْم .. ئەم ئەتومانە شێوەی جوراو جوْریان هەیە.. لە هوموو شوێنیکدا بلاّ بوونەتەوە بەلاّم کوْبوونەتەوە بەڵکو جیا جیان و وە لە بوْشایدا هەن بوْ ئەوەی لە جێگایەکەو بوْ جێگایەکی تر بچن و بەر یەکتری بکەون... ژیان و پەیدا بون و دروست بوون یەك گرتنی ئەتوْمەکانەوە ئەگەر ئادەمیزادیش مرد ئەوا ئەو ئەتوْمان لێیانەوە دروست بووە جیا ئەبنەوە و پەرش و بلاّو دابەش ئەبن... تەنانەت خواوەند و نەفسیش هەر لە ئەتوْم پێك هاتوون... بەلاّم جیاوارزی نێوان (

---

[1] شارل فرنر : الفلسفة اليونانية ، ص ١٩٤.

خواوەندو نەفس و ئەقڵ) لە لایەك و ( گیانلەبەری تر) لە لایەکی ترەوە لەوە وە هاتوە کە ئەتۆمی خواوەند و نەس و ئەقڵ و ورد و ناسکترن لەوانی تر.... بەلای ئەپیقۆرسەوە ئەتۆم لە بزووتنەوە دایەو لەم جوڵانەوەیەیدا یاسایەکی نەگۆڕاوی نییە کە پەیرەوی بکات.. واتا لە ڕێ لادان لە بزووتنەوەی ئەتومەکاندا هەیە[1]...یاخود بە شیوەیەکی تر ئەتۆم جۆرە قورساییەی هەیە .

لەبەر ئەو قورساییەشی لەکاتی بەربوونەوەی دا تۆزێك لا ئەدات... لەو لادانەدا بەر یەکتر ی ئەکەون و کۆ ئەبنەوە و ئەم کۆبوونەوەشیات ئەبێتە هۆی دروست بوونی جیهان و بوون. خۆ ئەگەر ئەم لادانە نەبووایە ئەوا ئەتۆمەکان پەرش و بلاّو ئەبوون و بەر یەکتری نەئەکەوتن و لاشەی ماددی دروست نەئەبوو.

ئەپیقۆرس لەم هەڵوێستە ماددیەوە بۆ هێرش بردنە سەر ئایین و بیر و ڕای پڕوپوچ کە لە لای خەڵکی ئەو سەردەمە بە پیرۆز دانراون هەنگاو ئەهاوێژێ و لێرەوە ڕێگا بۆ ڕێبازی لەزەت و ئاکارە ماددیەکەی خۆش ئەکات. ئەپیقۆرس لەوباوەڕەدابوو کە خواوەندەکان هەن بەلاّم بەو شیوەیە نین کە خەڵکی باسی ئەکەن ...خواوەند بەیەکجار جیهانی دروست کردوەو ئنجا وازی لێهێناوەو دەستی لێ شتوە.. هەقی بەسەرەوە نییە.. هیچ کاروبارێکی جیهانی بەلاوەمەبەست وگرنگ نییە چونکە نایەوێ وەزعی خۆی تێك بدات وئاینیش بەو جۆرەی خەڵکی باسی ئەکەن درۆ و دەسەلەیە .. ژیانی خواوەند بەختەوەرترین ژیانە، بۆیە ئایین لەلای ئەپیقۆرس بریتییە لە سەرنجدان ولاسایی کردنەوەی ژیانی خواوەند.

بەلای ئەپیقۆرسەوە گومڕا ئەو کەسە نییە کە نکوڵی لەو شتە ئەکات کە خەڵکی ئەیپەرستن... بەڵکو ئەو کەسە گومرایە کە بڕوای بە قسەی پڕوپوچی خەڵکی سادە هەبێت کە هەموو درۆیە دەربارەی خوا ئەیکەن.. جا بۆیە نابێ بە هیچ جۆرێك لە کاروباری ئاییندا درۆ لەگەل خەڵکی سادە بکەین. چونکە بەتەنیا هەق و ڕاستەقینە ئازادیان ئەکات.

زانستی قانون:

زانستی قانون لەلای ئەپیقۆرس بریتییە لە پێودانکی جیاکردنەوەی ڕاستەقینە لە ناڕاستەقینە. ،

(بۆیە ئەم بابەتە لە تیوری زانین نزیکترە نەك لە لۆجیك[2]).

بەلای ڕابەری ئەم ڕێبازەوە هەستەکان_الحواس_سەرچاوەو ڕێگای گومان لێنەکراوی زانین کەوابوو چۆن ئێمە بە هۆی هەستەکان شت ئەزانین؟ ئایا زانین

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو... ل ٢٠٨.

[2] جورج سارتون:تاریخ العلم، ن٣، ص٣٦٧، ترجمة لفيف من العلماء.

جیهانی مەوزعی لەتوانادا هەیە؟ چۆن ئەتوانین لەوە دڵنیا بین کە ئەو شتانەی بە هۆی هەستەکانەوە ئەیانزانین و ڕاست و دروستن پلەو قۆناخەکانی زانین کامانەن؟ .
بە باوەڕی ئەپیقۆڕس ئەو شتانەی کە هەن وهەست بە بوونیان ئەکەین وئەیانزانین بەم شێوەیە توانیومانە بیانزانین: هەموو شتێك لە ڕووخساری ڕووکەیەوە وێنەیەکی خۆی ئەنێرێ وئەو وێنەیە ئەو ماوەیە ئەبڕێ کە لە نێوان ئێمەو ئەو شتە دا هەیەو ئەگاتە هەستەکانمان وکاریان تێ ئەکات، بەم جۆرە ئەم شتە ئەزانین... هەموو کاتێکیش هەستەکان ڕاستگۆن و خۆ ئەگەر هەڵکەوت و هەندێ جار شتێکمان بە پێچەوانەوە بینی ئەوا خەتا لە هەستەکانەوە نییە بەڵکو خەتا لەو وێنەوەیە کە شتەکە ئەینێرێ وئەو حوکمەش خۆی خەتا بارە کە داویەتی[*]... ئێمە بە هۆی هەستەوە وێنەی شتەکە ئەزانین نەك ئەو شتە خۆی. جا بۆیە هەستەکان پیوەرو پێودانگی ڕاستین و هەرگیز درۆ ناکەن.. .بەهۆی وەرگرتن و دووبارە بوونەوەی کومەڵە وێنەیەکی شتێك بۆ چوونێکمان (تصور) دەربارەی شتەکە دروست ئەبێ.. یاخود ئێمە کە وێنەی (داناو تواناو زانا) مان بینی کەئادەمیزادن یەکسەر مەفهومی ئادەمیزاد لە میشکماندا دروست ئەبێ.. هەست درۆناکات وئەقڵیش ڕستگۆیە چونکە ئەقڵ پشت بە هەستەکان ئەبەستێ.. بۆیە بەلای ئەپیقۆڕسەوە پێودانگی ڕاستەقینە سێ خاڵە:
زانینی شت بە هۆی هەستە کانەوە.
بۆچوون.
هەستی ویژدان[1] .
بەلای ئەپیقۆڕسەوە ئەگەر هەموو هەستەکانمان لەناو برد تاکە ڕێگایەکمان نامێنێ کە بتوانین بە هۆیەوە ڕاستی لە ناڕاستی و دروست لە چەوتی جیا بکەینەوە وئەگەر بمانەوێ خۆمان لە گومان کردن دەرباز بکەین پێویستە بڕیار بدەین کە هەرگیزاو هەرگیز هەستەکانمان بە هەڵەمان نابەن و ئەو هەڵەیەی تێی ئەکەوین بەهۆی ئەو قەناعەت وحوکمەوەیە کە خۆمان پێیان گەیشتووین و بەسەرشتیدا ئەدەین.

---

د.کریم متی: الفلسفة الیونانیة، ص٢٥٦.

* ئەم ڕایەی ئەپیقۆڕس لە گەڵ ڕایەکەی فەیلەسوفی هاوچەرخ (کارڵ پوپەر ) زۆر لەیەکەو نزیکن و پرۆفیسور( ئایەر ) یش شتێکی لەم بارەیەوە وتووە بە شێوەیەکی تر ئەم ڕایەی ئەپیقورس دووبارە ئەکاتەوە.

1 بول جانیيةو جبریل سیای: مشکلات ما بعد الطبیعة ، ص ٢٤، ترجمة : الدکتور یحیی هیودی مکتبة الانجلو المصریة .القاهرة-١٩٦١.

# ئاكـــار

زانستی ئاكار یاخود ژیانی بەختەوەر و چێژ و لەزەت وەرگرتن بەردی بناخەی فەلسەفەی ئەپیقۆریزم پێك ئەهێنن.كەواتا با بزانین بەختەوەری و لەزەت چین و چۆن دەستگیر ئەبن.

بە پێیی فەلسەفەی ئەپیقۆریزم تاقیكردنەوەكانی ژیان دەری ئەخەن كە ئێمەی سەودا سەری لەزەتین، زیندەوەریش بە بێ بیركردنەوەو فێربوون، وەك ئادەمیزاد بە شوێن لەزەتدا ئەگەرێ ،.. (كەوابوو لەزەت مەبەست و ئامانجە، ئەو رێگایەش كە بۆ گەیشتنە ئامانجی لەزەتەكە ئەگیرێتە بەر فەزیلەتە... ئەقڵ و زانست و دانایش زەمینەی دەستەبەر بوونی ئەم رێگایانەو ئاراستەكردنی خۆش ئەكەن بەرەو گە یشتنە ئامانجە خوازراوەكە... كە بریتییە لە ژیانی پڕ چێژو بەلەزەتی بەختەوەرە... جا بۆیە ناتوانین بڵێین ئەم لەزەتە جوانەو ئەوەی تریان چەپەڵە.... بەڵكو هەموو لەزەتێك چاكەیە) ... لەزەتیش بریتییە لە دوورخستنەوە و لەناوبردنی ئازار. بەم پێیەش دوو جۆرە لەزەت هەیە:

- لەزەتی لاشە كە لەش ساخیی بەرزترین وێنەیەتی:
- لە زەتی ئەقڵیی ئەگەر رزگار بوون بێ لەترس و پەشێوی.

ئەپیقۆرس بە نیازی پاك و بە چاوێكی داوێن پاكانەوە ئەڕوانێتە لەزەت و مەبەستی تەنیا تێركردنی پێویستییەكانی لەش و سك و وسێكس نییە بەڵكو هەروەك لە نامەیەكدا كە بۆ_ منیوس_ ی ناردووە ئەڵی[1]:
( كاتێك ئێمە ئەڵێین لەزەت دوا ئامانجە، مەبەستمان لەزەتی بێ ئابرووەكان نییەو مەبەستمان لەو لەزەتە نییە كە بریتین لە شەهوەتی هەستەكان... بەڵكو مەبەستمان رزگاربوونە لە ئازاری لەش و ئەو شتانەی ئاسودەیی ئەقڵ تێك ئەدەن. چونكە لەزەت هەمیشە خواردنەوەی مەی نییە و دەست بە دامێنی شەهوەتەوە گرتنیش نییە... بەڵكو بیركردنەوەیەكی هۆشیار وبە ئاگاییانەیە كاتێك لەو هۆیانە ئەكۆڵێتەوە كە هانمان ئەدەن كارێك هەڵبژێرین و یەكێكی تر رەت ئەكەینەوە)....

---

[1] الموسوعة الفلسفية المختصرة: ص١٥، ترجمة: فواد كامل وجماعتة، القاهرة، مكتبة الانجلو المصرية١٩٦٣.

شارەزایان لەو باوەڕەدان کە شاعیری بەناوبانگ لۆکریتس بە جوانترین شێوەی شیعر لە ژێر ناونیشانی ( دەربارەی سروشتی شتەکان)[1] فەلسەفەی ماموٚستاکەی توٚمار کردووە و پاراستویەتی و ئەم شیعرەش وەرگێردراوەتە سەر زوٚربەی زمانە زیندووەکانی جیهان.

[1] On the nature of things

ئەمەش پارچەیەکە لەم هەڵبەستەی:
هەموو ئادەمیزادێك لە دەست خوٚی ڕا ئەکات
بەڵام هیچ کەسێکیش ئەوەی بوٚ نەکراوە
ناچار هەر دەست بە دامێنیەوە بگرێت
لێی بێزارە... بە دەستییەوە دەردەدارە
کەچی ناتوانی هوی نەخوٚشییەکەی بدوٚزێتەوە
ئەگەر بیتوانیبایە....
هەموو شتێکی ئەخستە لاوە.....
یەکەمجار بایەخی بە لێکوٚڵینەوەی سروشتی
ئەم جیهانە ئەدا...
چونکە ئەوەی جێگای گومان لێ نەکردنە
حاڵمانە بەدرێژایی زەمانە هەتاهەتاییەکەوە...
نەك لەم ساتەی کە ئەگوزەرێ...
دوای ئەوەی دەستی مەرگ
ئەیانگاتێ
لەسەر ڕوٚڵەکانی لەناوچوون
پێویستە...
شان بدەنە بەر ئەم هەتا هەتاییەو بەسەری بەرن.

## ستۆیسیزم

ستۆیسیزم ڕێبازێکی فەلسەفەی چەرخی هیلنستییە لە کۆتایی سەدەی چواردمی پێش زایین هاتۆتە کایەوە، لە لایەن زێنونی ستۆیسیزمییەوە دامەزراوە... ڕێبازێکە تیۆری و بیرە جیاکان بەیەکەوە ئەگونجێنێ و( بیری کلاسیکی و بیری هۆشیار) و (ڕابردوو و ئێستا) و (فەلسەفەو ئایین) و (قانونی تەبیعی و قانونی مەدەنی) و (بیری نیشتیمان پەروەری و بیری ئینتەرناسیۆنالی) بەیەکەوە ئەگونجێنی و یەکیان ئەخات و هەوڵ ئەدات ئەم جیاوازیەیان لە نێواندا نەهێڵێ.

ئەم ڕێبازە بە سێ قۆناخدا تێپەڕیوە و چەندین فەیلەسوف بەشداری دامەزراندنیان کردووە... فەلسەفەی تایبەتی ڕێبازەکەی بریتیە

لە یەکخستنی فەلسەفەکانی پێشوو کۆکردنەو و بە یەکەوە گونجاندنی بیر و ڕا جۆر بەجۆرەکان.... سێ قوناخەکەش ئەمانەن

ستۆیسیزمی کۆن:

لە ساڵی٣٢٢ پیش زایین دەست پێ ئەکات و لە ساڵی ٢٠٤ پیش زایین کۆتایی دێت و زینون کلیانتس و کرۆسپوس ڕابەری ئەم قۆناخەن.

ستۆیسیزمی ناوەراست:

لە سەدەی دووەم یەکەمی پێش زاییندا هەبووە، بنیاتۆس و پۆیتۆس و بوزیدونیس ڕابەری ئەم قۆناخەن.

فەلسەفەی ئەم قۆناخەش بە تێکرایی بریتییە لە چەند بیر و ڕایەکی جیاواز کە بە گشتی سەرچاوەکانیان ڕێبازی ئەفلاتون و ئەرستۆیە.

ستۆیسیزمی نۆی:

لە سەدەی یەکەمی زاینیەوە دەست پێ ئەکات و لە ساڵی ٥٢٩ی زاینی کۆتای دێت، ڕابەرەکانی ئەمانەن:

سنیکا، ئەپیکتیتۆس و مرقوس ئۆریلۆس. ئەم قۆناخە لەگەڵ ئاییندا تۆزێ ئاشنایەتیی هەبووە[1].

ناوی ئەم ڕێبازە لە وشەی ستۆی stoy وەرگیراوە کە کاتی خۆی لە ئەسینا داڵانێك بووە و کۆڵەگەکانی بە وێنەو نەخش و نیگار ڕازاونەتەوە و شاعیر و ئەدیبان تێیدا کۆبوونەتەوە، ئیتر لەمەوە ناوی ستۆی، ستۆیسیزمیان بەسەردا براوە[1].

---

[1] الدكتور عثمان امين: الفلسفة الرواقية، ص٤٥_٤٦،ا لقاهيرة، ط٣،مكتبة الانجلو المصرية ١٩٧١.

زینۆن ڕابەرو دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەم ڕێبازەیەو خۆی خەڵکی( سیتیون)ە کە ئەوساکە لە ژێر دەستی فینیقییەکاندا بووە، باوکی بازرگان بووە... لە تەمەنی سی ساڵیدا چووە بۆ ئەسیناو نزیکەی بیست ساڵ تێیدا ماوەتەوە... وە ئەگێڕنەوە کە بە ڕێگای دەریادا هاتوە بۆ یۆنان و لە دەریا کەشتییەکەیان شکاوە ئەمیش هەر چۆنێك بێ خۆی گەیاندۆتە یۆنان و ئەو شتی پێ ی بووە لە دەریادا نوقم بووە، جا بۆبە خۆی وتوویەتی:" کاتی بەلەمەکەم شکا گەشتێکی سودبەخشم کرد" ئەویش مەبەستی لەوەیە ئاشناییەتی لە گەڵ فەلسەفەدا پەیدا کردووە وازی لە بازرگانیدا هێناوە و لە دواییدا ئەو فەیلەسوفەی لێ دەرچووە... زینۆن لە لای کراتس فەلسەفەی خوێندووە و چەند مامۆستایەکی تریش دەرسیان پێ وتووە... هەر چۆنێك بێت ئەگەر ئەپیقۆرس لە دیمۆکریتسەوە شتی وەرگرتبێ ئەوا زینۆن ڕێچکەی هیراکلیتسی گرتۆتە بەر[٢]. وە ئەگێڕنەوە کە زینۆن لە تەمەنی ٩٨ ساڵیدا مردووە و مردنەکەشی بەم شێوەیە بووە:
لە قوتابخانەکەی هاتۆتە دەرەوە، ساتمەیەکی بردووە و کەوتووە پەنجەکانی قاچی شکاون و بە دەستی داویە بە زەویدا و هاواری کردووە... من دێم .... من دێم... بۆ چی بانگم ئەکەیت[٣]. ئنجا دڵی وەستاوە و هەناسی لێ بڕاوە.... لە دواییدا خەڵکی ئەسینا بە ڕێز و حورمەتەوە ناشتویانە و تاجێکی ئاڵتوون و مەزارێکی باشیان بۆ دروست کردووە و گۆڕکەیان بۆ هەڵبەستووە ئەمەش نیشانەی پایە بەرزیی و ڕەوشت باشیی ئەو فەیلەسوفە بووە... چونکە خۆی خەڵکی ئەسینا نەبووە و بێگانە بووە و ئەگەر وا باش نەبووایە ئەو ڕێزەی لێ نەئەگیراو بە چاوی بێگانە سەیر ئەکرا..
ڕێبازەکە:
بە باوەڕی سیتۆیسیزم فەلسەفە زانستی کاروباری خواوەندو ئادەمیزادە و ئەرکی فەیلەسووف دوو جۆرە :
ئەقلیی .
کردەوەیی
واتە ئەبێ فەیلەسوف هەموو ئەوشتانە بخاتە لاواوە کە بە پێچەوانەی ئەقڵەوەن، جا ئەوشتانە لە سروشتی گەردوون دا بن یاخود لە کرداری ڕەفتاری ئادەمیزادا ... بەختەوەریی دووا ئامانجی فەلسەفەیە، بۆیە فەلسەفە ئەکرێ بە سێ بەشەوە:

---

[1] لە نووسراوە کۆنە عەرەبییەکاندا ( اسحاب الرواق) یشیان پێ دەڵێن.

[2] جورج سارتون: تاریخ العلم ، ك٣ ، ص٢٨٥.

[3] هەمان سەرچاوە. ل ٢٨٦.

- لۆجیك: باسی ئەو ڕێگایانە ئەكات كە بەهۆیانەوە شت ئەزانین .
- فیزیقا: ( زانستی سروشت) باسی خواوەندو شتەكان ئەكات.
- زانستی ئاكار: بابەتەكانی لێكۆڵینەوەكانی ڕەوشتی ئادامیزادە[١] .

كەواتە با بزانین ناوەڕۆك و پوختەكانی ئەم سێ لقانە كامانەنو چین و ڕەسەنیی ئەم ڕێبازە لە چیدا دەر ئەكەوێ؟

## لۆجیـــك

ڕابەرانی ئەم ڕێبـازە هـەوڵیان داوە لۆجیك لـەو سەختی و ئاڵۆزییـە ڕزگـار بكـەن كـە بەدەسـت مامۆسـتای یەكەمـەوە دووچـاری هـاتبوو. كۆششـیان كـردووە لـۆجیكێكی نوێ دابنێن تێیدا زانینی هەستییانەوە زانینـی ئەقڵییانـە بـە پێچەوانەی یەكترییـەوە نـەبن. بـە بـاوەڕی زینـۆن و لایـەنگرانی (جـنس) و (نـوع) و (فـۆرم ) و [٢] ( نموونـەی بەرز) و مانا ( هەمەكی )یەكان چەند ناوێكی گشتین و لە واقیعدا نین بەڵكو ئەوەی بوونی هەیـە تـەنیان تاكـەكانن... ئـەو مانـا گشـتییانە تـەنیا لـە مێشك دا هـەن و تاكـە كەسان (دانا، توانا، زانا) لە واقیعدا هەن.. لە لایەكی ترەو بە پێچەوانەی ئەرسـتۆوە ئـەوان وای بـۆ ئەچـن كـە لۆجیـك دەروازەو ئـامرازی زانسـت و فەلسـەفە نییـە بـەڵكو لقێكی سەربەخۆیەو بابتی تایبەتی خۆی هەیە كە بەشێكە لە ڕاستەقینەو لە هەردوو زانستی سروشت و ئاكارەوە جیاوازە، جا بۆیە"بیری لۆجیك ڕاسـتییەكەو بـوونی لـە بوونی شتەكانی سروشت و ئاكار كەمتر نییـەو لۆجیـك ئـامراز نییـە بـەڵكو بەشـێكی بنچینەییە[٣] لـە فەلسـەفە، بـەڵام لـە ( پلـەو پایـەدا لـە فیزیقـا كـەمترە). سـتویسیزم لـە مەیـدانی لۆجیكـدا چـەند شـتێكی نـوێی دا هێنـاوە كـە ئـەتوانین بڵـێن بـە كـورتی ئەمانەن:

- لە جیاتی وشە ڕەمزیان بەكار هێناوە و بە جۆرێك سەیری لۆجیكییان كردووە كە سیستەمێكی ڕێك و پێكەو لە پێشەكییەوە ئەنجام دێتە كایەوە.
- لە مەسەلەی گریمانەیی یاخود (شرطی متصل ) و مەسەلەی لەبڕی واتا (شـرطی منفـصل) كۆڵیونەتـەوەو یاسـاو بنـچینەی ڕاسـتیی و درۆزنیـی ئـەم مەسـەلەیانەیان داناوە[٤] .

---

[١] الدكتور. عثمان امین:الفلسفة الرواقیة، ص ٨٥.

[٢] د. عثمان امین الفلسفة الرواقیة، ص ١٢٠.

[٣] هەمان سەرچاوە : ل٨٨.

[٤] مەسەلەی (شرطی متصل) بەم شێوەیەیە:

• له کاتی لێکولینەوەدا چەند نەگۆڕاوێکی لۆجیکییان داوەتە دەست و لە کێشە لێك دەرواوەکان کۆلیونەتەوە[1].

**فیزیقا:**

فیزیقای ستۆیسیزم بریتییە لە ماددییەت و (وحدەی وجود) و تیورییەکەیان دەربارەی گەردوون لە سنوری فیزیقای هیراکلیتسدا ئەسوڕێتەوە.

بەلای ئەم ڕێبازەوە جیهان بریتییە لە تێکرای ئەو شتانەی لە ئاسمان و زەویدان... بۆشایی دەوری جیهانی داوە بەلاّم لە جیهاندا بۆشایی نییە... جیهانیش نەفسی هەیە چونکە گیانلەبەرێکی زیندووی بیرکەرەوەی ئاقڵە... نەفسی جیهانیش لە هەموو شوێنێکدا بلاّو بۆتەوە..بەلاّم گەردوون لە تێکرای جیهان و بۆشایی دەورو پشتی پێك هاتووە .. جیهان لەسەر شێوەی فەلەکدایەو زەویش ناوەندو مەلبەندی ئەم فەلەکەیە.

بە پێچەوانەوەی ئەرستۆ و پیادەکانەوە(*) جیهان لە لای ستۆیسیزم کۆتایی و سەرەتای هەیە... جیهان لە ئاگری یەکەم دروست بووە... خواوەند ئاگرەکەی کردووە بە ئاو... بەشەکانی ئاوەکەش وەك یەك نەبوون ... بەشە قورساییەکەی نیشتوە و زەویی لێ دروست بووە، سووکەکەشی بووە بە هەلّم و هەوای لێ دروست بووە... هەوایەکەش سووك بوو تاوەکو بوو بە ئەسیر و ئاگری ئاسمان ... ئنجا چوار کەرەسەکە تێکەلاّو بوون :

---

hypothetical___conditional proposition.or

ئەگەر خۆر ئاوابوو شەو دێت

ئەوا خۆر ئاوابوو

کەوابوو شەو هات.

بە ڕەمزیش بەم جۆرە دەنووسرێ

" ئەگەر ... ئەوا" (م ل)

مەسەلەی ( شرطی منفصل) بەم جۆرەیە:

ئێستا کە یا ڕۆژە یا شەوە dis junctive

بەلاّم ئێستاکە ڕۆژە کەوابوو ئێستاکە شەو نییە Alternative roposition

1 بروانە:

الدکتور. محمود فهمی زیدان: المنطق الرمزی: نشاط وتطورة، ص ٥٠، دار النهضة العربیة ، بیروت١٩٧٣. الدکتور. کریم متی: منتطق: ص ٦١-٦٣، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧٠.

* ئەرستۆ و قوتابییەکانی بە پیادەکان (المشائین) ناو ئەبرێن و ئەم ناوەشیان لەوە وە هاتوە کە ماموّستای یەکەم بە پیاسە کردن و هاتن و چوونەوە دەرسی وتۆتەوە، هەروەك لەم سەردەمەدا ئەم جۆرە دەرس و دەورە لە حوجرەکاندا باوە.

( ئاگر، هەوا، زەوی، ئاو) و هەموو شتێکیان لێ دروست بوو[1] لە سروشتدا دوو لایەن هەیە :

- لایەنی کاریگەر.
- لایەنی کارتێکراو[2].

لایەنی کاریگەر، ئەقڵە کە لە ماددەدا هەیە و روخسار و فۆرم بە هەموو شتێك ئەبەخشێ. دووەمیشیان ماددەیە کە هیچ جۆرە( صفە) تێکی تێدا نییە... بە لای ئەم رێبازەوە هیچ شتێك ڕاستەقینە نابێت ئەگەر هێزێکی کاریگەر یاخود لەگەڵ توانای بزواندن یاخود بزوتنەوەدا نەبێت. ئەقڵ ، خواوەندی ئافەریدەکاری جیهانە ... جیهانیش پابەندی یاسایەکی دیاریکراوە و هیچ لێی لا نادات و بە پێی ئەقڵی گشتی بەڕێوە ئەچێ... هەر ڕووداوێك کە ببینرێ هۆیەکی هەیەو هەموو ئەنجامێك پێشەکی و هۆیەکی هەیە و توندو تۆڵ بە یەکەوە بەستراونەتەوە. بە لای ڕابەرانی ئەم رێبازەوە خواوەند و سروشت یەك شتن. گەوهەریش ماددەو گیانە یەکیان گرتووە... هەموو شتێك لە جیهاندا پێ بەندی چارە نا چاری و قەزاو قەدەرە ... بەڵام چارەناچارییەکی کوێرانە نا... بەڵکو چارە ناچارییەکی ئاقڵانە ... (خواوەند هێزێکی لە هەموو شتێکدا هەیە و بە هیچ جۆرێك ئەو هێزە لەو شتانە جیا ناکرێتەوە[3]) لە ماوەی هەموو ( ١٨) هەزارساڵێکدا ئاگر دا ئەگیرسێ و هەموو جیهان ئەسوتێ و هەموو شتێك ئەبیتەوە بە ئاگری خواوەندی و سەر لە نوێ شت دروست ئەکرێتەوە...

## ئاکـــــار

ئاکار گرنگترین لایەنی فەلسەفەی ئەم رێبازەیەو... بەرزترین چاکە فەزیلەتەو فەزیلەتیش لەوەدایە کە ئادەمیزاد جۆرێك بژی لەگەڵ سروشت و ئەقڵدا بگونجێ....فەزیلەت تاکە چاکەو رەزیلەتیش تاکە چەپەڵە ... شارەزایان لەو باوەڕەدان کە ستۆیسیزم ئاکاری لە سێ خاڵدا کۆکردۆتەوە:

- ژیان بە جۆرێك بێ کە لەگەڵ سروشتدا واتا لەگەڵ ئەقڵدا بگەونجی.
- زیان بە خەڵکی تر نەگەیەنێ .

---

[1] الدكتور عثمان امين الفلسفة الرواقية، ص ١٦٢.

[2] هەمان سەرچاوە... ل ١٥١... ئەم هەلوێستە لەگەل هەلوێستەکەی فەیلەسوفی هۆلەندی (سپێنۆزا) بەراورد بکە: natura naturata natura naturans

[3] جورج سارتون: تاريخ العلم ، ك ٣ ، ص ٣٨٨.

• هەر کەسە مافی خۆی بدەیتیٚ و هەر خاوەن مافە مافی خۆی بدرێتەوە[1].
واتا پێویستە ئادەمیزاد لە ژیان و گوزەراندا لەگەڵ سروشت و ئەقڵدا تەباو گونجاو بێت ... خۆ ئەگەر واشی کرد ئەوا مانای ئەوەیە کە بە پێی ئەو قانوونە ئەژیا کە حوکمی جیهان ئەکات... جا بۆیە چاکەو بەختەوەری ئادەمیزاد لەوە دایە کە بە جۆرێك بژیا لەگەڵ سروشتی هەمەکیی(کلی) دا گونجاو بێت.
بە پێی خاڵی دووەمیشبان _ کە ئەمەیان ڕای ستویسیزمی ڕۆمانەکانەو پەیوەندی نێوان خەڵکی باس ئەکات، نابیٚ هیچ کەسێك ئازار بە هیچ کەسێك بگەیەنی و ئەبیٚ ڕێزی ئادەمیزادی برای بگری و دەست دریژی نەکاتە سەری... چونکە ژیان و سەربەستی و ئابڕووی ئەوکەسەی دەست درێژی ئەکاتە سەری سەربەستی و ئابڕوو دەست درێژ کارەکەشە ... لە خاڵی سێیەمدا باسی ڕێزگرتنی موڵك داریەتی ئەکرێت و ئەبیٚ پەیڕەویی دادپەروەریی بکرێت و خەڵکی خاوەن ماف، مافەکانیان بدرێتەوە. ئەوی ڕاست بیٚ ڕابەرانی ئەم ڕێبازە شێوەیەکی نیمچە گەلییان هەیە و هەوڵیان داوە کە دەرگای فەلسەفە بۆ هەموو کەسێك بخەنە سەر گازی پشت و بنچینەی جێگیر بۆ ئاکارو ڕەوشت و ژیانی چاك بەو خەڵکە پێشکەش بکەن کە بە حەپەساوی لە کۆمەڵێکی وادا ژیاون کە ئاژاوە و پاشاگەردانی و تێك چوون دەستیان لە بێنە قاقەی گیر کردووە، جا بۆیە ئەم فەیلەسوفانە هەوڵیان داوە کە ساتێك بە ناخی خۆیاند شۆڕببنەوە و ماوەیەك بە ئاسودەیی ئارام بگرن و دوور بن لە کێشەو بەرەی جیهانی دەورو پشتیان... هەر ئەو دۆخە نالەبارەی ئەوساش بووە وای لەم ڕێبازە کردووە بڕوای بە (جەبر) هەبیٚ و ڕابەرانی لەو باوەڕەدابن ئەو و شتانە ڕوو ئەدەن هیچ جارێك نییە هەر ئەبوو ڕوویان دابایاو، هەر ئەم ڕاکردنەشیان بووە لە واقیع وای لێکردوون بڵێین: ئەگەر سەرکەوتن هەر بەدەست نەیەت ئەوا ئەبیٚ نەفرەتی لیٚ بکەین و گریٚ کوێرەی ئاشتی و ئاسودەیی لەوە دایە کە ئارەزوومان کەم بکەینەوە، وای لیٚ بکەین ئەوەندەی دەست رویشتنمان بێت.
جا بۆیە (سنیکا) لەم بوارەدا وتوویەتی: ئەگەر ئەوەی هەتە بەشی نەکردی و پێی قایلٚ نەبووی ئەوا کلۆڵ و هەژار ئەبیت ئەگەر هەموو دنیا ببێت بە موڵکی تۆ[2]!! .

---

[1] الدكتور عثمان امين الفلسفة الرواقية، ص ٢٢٥.

[2] ول ديورانت: قصة الفلسفة، ص ١٢٨ ، ترجمة: الدكتور فتح اللة محمد المشعشع، ط٢ ، مكتبة المعارف بيروت١٩٧٢.

## گومانکاران

هەروەك لەمەو بەر باسمان کرد دوای مردنی ئەرستو بە هۆی شەڕ و هێرشەکانی ئەسکەندەر و داگیرکردنی ولاتانی ڕۆژهەلات و فراوانبوونی ئیمراتۆرییی یۆنان و تێکەلبوونی گەلی یۆنان لەگەلّ گەلانی تری ڕۆژهەلات و لاوازبوونی هەستی بە گرنگ زانینی دەولەتی شار چەند دیاردەیەکی نوێ لە کومەلّی یۆناندا دەرکەوتن کە هەردوو ڕێبازی ئیپیقورس و ستۆیسیزم کۆرپەی دلسۆزی بوون... سەرەڕای ئەم دوو قوتابخانەیە گومان کردن و ڕێبازی گومان وردە وردە پەلی هاوێشتە ناو جیهانی فەلسەفەوە ڕابەر و لایەنگیری بۆ پەیدا بوون کە بە ئاشکرا جاڕ و بانگیان بۆ ئەدا، داکۆکییان لیّ ئەکرد لە ناو خەلکی و کوڕ و کۆمەلەکاندا بلاویان ئەکردەوە تا وای لێهات دوو ڕێبازی بە هێزی بۆ دروست بوو:

١. ڕێبازی پیرۆن [١].

٢. ڕێبازی ئەکادیمیای نوێ.

گومانکار مرۆڤێکی ماندووبووی پەککەوتەی ڕاڕای گوشەگیری و بڕوا نەبووە بە هیچ... چۆن بڕوای بە هیچ شتێك بمێنی لە کاتێکدا ئەوەی دوێنی بە پیرۆز دا ئەنرا ئەمرو ئەخرێتە ژێر پێوەو هیچ هێزێك نییە بلّیّ لەل...کەس داکۆکی لیّ ناکات... جا بۆیە گومانکار دوورە پەرێز وەستاوە و گۆشەیەکی گرتووە و سەرنج ئەدات گویّ بە هیچ شتێك نادات... هیچ شتێك پەسەند ناکات و هیچ شتێك ڕەتناکاتەوە ، واتا نە ئەلّیّ (ئا) و نە ئەلیّ(نا و) بەلّکو ئەلّیّ: نازانم[٢].

ڕێبازی پیرۆن :

ئەم ڕێبازە بە ڕێبازی گومانی ئاکارییش ناو ئەبریّ، ڕابەرو دامەزرێنەکەی پیرۆنەو دوو قوتابی هەبووە: ئەنسیدیمۆس و ئەگرێپا. پیرۆن لە سالّی(٣٦٥)بەر لەزایین لە شاری ئیلیس لە دایك بووەو لە سالّی ٢٧٥ی بەر لە زایین مردووە .. لەگەلّ لەشکری ئەسکەندەر دا بەرەو ڕۆژهەلات_هندستان_هاتووە... ئاکارو خوو ڕەوشتی

---

[1] شارەزایانی فەلسەفەو مێژووناسان لەسەر نووسینی ناوی پیرون جیاوازن، هەندیکیان بە (پیرۆ) هەندێکی تر بە(فیرۆ) و هەندێکی تریشیان بە (فیرۆن) و تاقمێك بە (پیرۆن) ئەینوسن کە بە لای ئێمەوە لە وانی تر ڕاسترە چونکە بە لاتینی بەم شێوەیە ئەنوسریّ: (PYRRHON)

[2] لە کوردەواریدا قسەیە، پەندێك هەیەو زۆر لەمەوە نزیکە.. پەندەکە ئەلّیّ: ( نازانم رەحەتی گیانم)

هەژارەکانی هیندستان زۆر کاریان تێکردوەو ئەویش ئەم زوهدو کارەی پەسند کردوون کە هیچ گویٚ بە ژیان نادەن و بەرامبەر بە هەموو شتێك کەم تەرخەمی نیشان ئەدەن و دلێرانە بەری ئازارو ئەشکەنجەو ناخۆشیی ئەگرن ... پیرۆن دوای مردنی ئەسکەندەر گەراوەتەوە وولاٚتەکەی ..لەوێش ڕیزێکی زۆری لێنراوەو دوای مردنی پە یکەریان بۆ دروست کردووە.

پیرۆن شتێکی وای لە پاش بە جێنەماوە جگە لەو چەند قسەیە نەبیٚ کەقوتابیەکانی و خەلٚکی تر بۆیان تۆمار کردووە .. ئاگادارن لەو باوەڕەدان کەپیرۆن لە ئەنجامی وەلاٚمدانەوەی ئەم سیٚ پرسیارەوە کەوتۆتە دەریای بیٚ بنی گومانەوەو تێیدا خنکاوە:

سروشت و حەقیقەتی شت چییە؟

هەلٚوێستمان بەرامبەر بە سروشتی شت و زانین ئەبیٚ چۆن بیٚ؟

ئەنجامی ئەمە چی ئەبێت وئەگەینە چ ئەنجامیك؟(١).

لە وەلاٚمی ئەم پرسیارانەدا پیرۆن ئەلیٚ: ئێمە ناتوانین هیچ شتێك دەربارەی سروشتی شتەکان بزانین.. چونکە ئێمە لە زانیندا پشت بە هەست یاخود ئەقلٚ ئەبەستین .. هەستیش لە ڕووالٚت بەولاوە ناتوانیٚ هەقیقەتی شتمان پیٚ بلٚێت و خۆشی بە پێی کات و دوخ و لەکەسێکە وە بۆ کەسێکی ترەوە ئەگۆرێت .. ئەقلٚیش پشتی پیٚ نابەستریٚ و دەسەلاٚتی نییە.. تەنانەت ئەقلٚیش پشت بە هەستە کان ئەبەستیٚ لەبەر ئەمە هەمان شت ئەویش ئەگرێتەوە.

جا لێرەوە ناچارین نە بلٚێین ( ئا) و نە بلٚێین ( نە) و ئەبیٚ هیچ هەلٚویستێك نەنوێنین و حوکمەکە بە کراوەیی بهێلٚینەوە... ئیتر بۆیە ئەگەینە ئەو ئەنجامەکە:

- ناتوانین هیچ دەربارەی سوست و هەقیقەتی شتەکا ن بزانین.
- نابیٚ هیچ حوکمێك بە چاك یا بە خراپ بدەین.
- ئەنجامی ئەمەش گوٚی بە هیچ نەدان و کەم تەرەخەمییە، ئەم ئەنجامەش لە خۆیدا فەزیلەت و بە ختەوەرییە(٢).

---

[1] الدكتور عبدارحمان بدوي: خريف الفكر اليوناني ، ص٧١، ط ٤ القاهرة_ ١٩٧٠.

[2] بول جاني و جبريل سياى: مشكلات ما بعد الطبيعة، ٢٦، ترجمة الدكتور يحيى هويدى، مكتبة الانجلو ا لمصرية١٩٦١.

بەم پێیە پیرۆن بەرەو بەختەوەریی و دڵنیایی سلبییانە پشت بە گومانکردن ئەبەستێ. دوور نییە لێرەدا هەندێ کەس بپرسن و بڵێن: ... کەسێك ئەمە بیر و ڕاو هەڵوێستی بێ گومان لە هەموو شتێك بکات، دوورە پەرێز بوەستێ، گوێ بە هیچ شتێك نەدات و باوەڕی بە هیچ نەبێ ئەبێ چۆن بتوانێ بژیا؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێین... پیرۆن لە سێ مەیداندا گومانی نەکردووە یاخود نەیهێشتووە گومانەکەی بگاتە سێ بووار کە ئەمانەن(*): مەیدانی شعور، مەیدانی ژیانی ڕۆژانە، مەیدانی ئاین. پیرۆن لەو باوەڕەدابووە کە ئەگەر زللەیەکی لێ بدەیت ئازاری پێ ئەگات و ناڵێ: نازانم ئایا ئازارم پێ گەیشت یان نا؟.... پیرۆن کە مەلە نەزانێ خۆی فڕی ناداتە ناو ئاوەوەو بڵێ دلنیا نیم لەوەی ئەخنکێم یا ناخنکێم... هەروەها لە بواری ئاینییدا پیرون باوەڕیی بە ئاین و خواوەندەکانی یۆنان هەبووە .جا بۆیە لەم بوارەدا وتوویەتی( گومان ڕوخسار و ڕوالەتی شت ناگرێتەوە ... چونکە گومانکار ئەزانی کە فلانە شتە لە سپی ئەچێ هەنگوین شیریینەو ئاگر شت ئەسوتێنێ.

( بەڵام گومانکار حوکم نادات و ناڵێ ئەم شتە سپییەو هەنگوین شیرینەو سروشتی ئاگریش سوتاندنە[1].

بیرو ڕای پیرۆن بە تەواوەتی لە لایەن ئەگریپاوە پەرەیان پێ دراوە. ئەگریپا بە پێنج خاڵ ساخی کردۆتەوە کە بۆچونی مامۆستاکەی ڕاستە و ئەبێ گومان سەرمەشق بێت و نابێ و نا گونجی لە هیچ کاریکدا حوکم بدەین پێنج خالەکەش ئەمانە:

- جیاوازی و ناکۆکی نێوان بیرو ڕای فەیلەسوف و خەڵکی و ئادەمیزاد بە گشتی...
- هەموو مەسەلەیەك کە لەبەر دەستتیایە پێویستی بە سەلماندن هەیەو دووەمیشیان وەك یەکەمیان و سێیەمیشیان وەك دووەمیان پێویستیان بە سەلماندن(برهان) هەیە. جا بۆیە مەسەلەی سەلماندنن هەتا هەتایە تەواو نابێ و کۆتایی نایەت[2].
- حوکم و بۆچونمان هەروەك ئەو بابەتانەی بونەتە کەرەسەیان یان نیسبین.

---

* ئەم گومانەی پیرۆن، بە گومانی روخێنەی و تێکدەر ناو ئەبرێ و لەو گومانەمان جیایە کە دیکارت کردویەتی... گومانی دیکارت سەرەتا بۆ دانانی بنەڕەت و پتەو و قایم کە بینای لەسەر بکرێ و گومانی پیرۆن، هەموو دارو پەردویەك هەڵتە تەکێنی و ئەجامێکی لەباری نابێت...

[1] يوسف كرم : التاريخ الفلسفة اليونانية، ص٢٣٥، ط٥ القاهرة _١٩٧٠.

[2] بول جاینە و جبریل سیای: هەمان سەرچاوەی پێشو (ل:٣٥ ).

- ئەو پێشەکی و سەرەتایانەی بۆ سەلماندنی مەسەلەیەك پشتیان پێ ئەبەستین خۆشیان پێویستایان بە ساخ کردنەوەو سەلماندن هەیە.
- هەموو پێشەکییەك پشت بە ئاکاموو هەموو ئاکامێکیش پشت بە پێشەکی ئەبەستێ جا بۆیە لێرەوە ئەکەوینە ناو بازنەی بۆشەوە و سەلماندن و ساخکردنەوە مەحاڵن و هەر نابن و ناگونجێن.

ئەگرێپا هەرچەندە ئەم گومانەی خستۆتە چوار چێوەیەکی دیالێکتیکییانەو بەو پەڕی توندو تۆڵی و ئەیخاتە ڕوو بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا لە تیرو توانج و ڕەخنە دەربازی نابێت....
لە پێش هەموو شتێکدا ئەقڵی ئادەمیزاد ناتوانی ڕێ بە (مطلق) بەرێت و بیرو ڕاو بۆچوونمان لە چاو سەرەتاو یاسا هەمەکیەکان نیسبین و ئەم نیسبییەتەش ڕوالەتی شت ئەگرێتەوە نەك ناوەڕۆك و کاکلەکە بۆیە ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕی... لە لایەکی تریشەوە کێشەی سەلماندن و ساخ کردنەوە خۆیان پێویستییان بە سەلماندن نییە و ئەبێ لەوانە جیا بکرێنەوە کە پێویستە بسەلمێنرێن و ساخ بکرێنەوە[١].

---

[1] ئەم بابەتە بە باشی لە لۆجیکی نویدا ڕوون کراوەتەوە کە (لۆجیك و میتا لۆیجیکی )پێ دەڵێن.

## سەرچاوەکان


بۆ نووسینی ئەم کتێبە سوودمان لە زۆر سەرچاوەی هەمە چەشنە وەر گرتووە... وا لە خوارەوە هەندێکیان ئەنوسین :

١) برتراند رسل: تاريخ الفلسفة الغربية ، ج ١، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محمود، لجنة التاليف والترجمة والنشر. القاهرة-١٩٦٧.

٢) جورج سارتونن: تاريخ العلم ،ج١، ترجمة : ابراهيم بيومي مدكور وجماعتة، دار المعرف بمصر -١٩٣.

٣) جورج سارتون: تاريخ العلم، ج٢، ط٢ ،١٩٧٠ القاهرة.

٤) جورج سارتون: تاريخ العلم، ج٣، القاهرة-١٩٦١.

- هەندی سەرچاوەی کۆن هەیە و ئەوەی شارەزا نەبێت بە تەواوەتی ناتوانێ سودیان لێ وەر بگرێ، چونکە بە تێکەڵ و پێکەڵی باسی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان ئەکەن و فەیلەسوفەکان پاشو پێش ئەخەن جگە لەوەی هەڵەی گەورەشیان تێدایە و وەك ئەم سەرچاوانەو چەندین سەرچاوەی تر:

حاجي خليفة :كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون.

الشهرستاني: الملل والنحل، ط٢،ا لقاهرة ١٩٥٦.

ابن النديم: الفهرست.

ابن القفطي: اخبار العلماء باخبار الحكماء .

صاعد الاندلسي: طبقات الاسم.

ابن ابي اصيبعة: عيون الانباء في طبقات الاطباء.

٥) جورج سارتون: تاريخ العلم، ج٤، القاهرة_١٩٧٠.

٦) جورج سارتون: تاريخ العلم ،ج٥، القاهرة_١٩٧١.

٧) هـ . فرانكفورت. جون.ا. ويس: ماقبل الفلسفة ، ترجمة: جبرا ابراهيم جبرا – دار المكتبة الحياة_بغداد ١٩٦٠.

٨) يوسف كرم.:تاريخ الفلسفة اليونانية،ط٥، القاهرة_١٩٧٠.

٩) يوسف كرم: الطبيعة وما بعد الطبيعة.لجنة التاليف والترجمة والنشر.

١٠) يوسف كرم: ومراد وهبة: المعجم الفلسفي، مكتبة يوليو- ا لقاهرة١٩٦٦.

١١) ارنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، ج١، الترجمة: لويس اسكندر، القاهرة-١٩٦٦

١٢) ارنست باركر: النظرية السياسة عند اليونان، ج ٢، القاهرة-١٩٦٦،سلسلة الالف الكتاب .مؤسسة سجل العرب.

١٣) الدكتور امام عبدوالفتاح امام: مدخل الى الفلسفة .دار الثقافة للطباعة والنشر، القاهرة-١٩٧٢.

١٤) الدكتور امام عبدالفتاح امام: محضرات فى فلسفة الاخلاق، دار الثقافة للطباعة والنشر، القاهرة -١٩٧٤.
١٥) امام عبدالفتاح امام: المنهج الجدلى عند هيجل -دار العارف بمصر ١٩٦٩.- ريسالة جامعية_
١٦) ماركس، انجلس: مختارات فى اربع اجزاء- دار التقدم-موسكو.
١٧) انجلس، فردريك: لودفيغ فورباخ ونهاية الفلسفة الكلاسيكية الالمانية ، دار التقدم، موسكو ١٩٦٧.
١٨) لينين: الدفاتر الفلسفة ٣،ج٢ ، ترجمة والتعليق الياس مورقس، دار الحقيقة، بيروت ١٩٧٤.
١٩) جان فال: طريق الفيلسوف- ترجمة الدكتور احمد حمدى محمود، القاهرة، سلسلة الالف كتاب.
٢٠) هانز ريشنباخ : نشاة الفلسفة العلمية، ترجمة: الدكتور فؤاد زكريا، دار الكاتاب العربي للطباعة والنشر ١٩٦٨(القاهرة).
٢١) الدكتور جعفر ال ياسين: فلاسفة يونانيون، منشورات عويدات-بيروت- ١٩٧٥.
٢٢) الدكتور كريم متى: الفلسفة اليونانية، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧١.
٢٣) شارل فرنر:الفلسفة اليونانية، ترجمة :تيسير شيخ الارض، دار الانوار، بيروت١٩٦٨.
٢٤) الدكتورة اميرة حلمى مطر: الفلسفة عند اليونان، القاهرة، دار النهضة العربية، ١٩٧٤.
٢٥) الدكتورة اميرة حلمى مطر:فى فلسفة الجمال من افلاتون الى سارتر،دار الثقافة للطباعة والنشر، القاهرة_١٩٧٤.
٢٦) عبدالرحمن البدويى: ربيع الفكر اليونانى، ط٤، مكتبة النهضة المصرية ،القاهرة-١٩٦٩.
٢٧) عبدالرحمن البدويى:خريف الفكر اليونانية: ط ، مكتبة النهضة المصرية. القاهرة-١٩٧٠.
٢٨) ازفلد كولبة :المدخل الى الفلسفة، ترجمة: ابو العلا العفيفى، ط٣، لجنة تاليف والترجمة والنشر، القهرة-١٩٥٥.
٢٩) كارل ياسبرز: مدخل الى الفلسفة ، ترجمة :جورج صدقنى:مكتبة اطلس ،بدون تاريخ.
٣٠) جوزيف بوخينسكى:مدخل الى الفكر الفلسفى، ترجمة الدكتور محمود حمدى زقزوق، مكتبة الانجلو المصرية، القهرة_١٩٧٣.
٣١) جون لويس: مدخل الى الفلسفة، ط٢، ترجمة:انور عبدالملك، دار الحقيقة للطباعة والنشر، بيروت ١٩٧٣.

٣٢) الدكتور احمد فؤاد الاهواني:معاني الفلسفة مطبعة عيسى البيابى الحلبى،١٩٤٧.
٣٣) هنترميد:الفلسفة انواعها ومشكلا تها، ترجمة: الدكتور فواد زكريا، دارنهضة مصر،الاهرة،١٩٦٩.
٣٤) الدكتور محمد علي ابو ريان: الفلسفة و مباحثها، دار المعرف بمصر ،القاهر،١٩٦٦.
٣٥) دكتور محمد عبدالرحمن مرحبا: من الفلسفة اليوناني الى الفلسفة الاسلامية ،منشورات عويدات ،بيروت١٩٧٠
٣٦) بنيامين فارتن:العلم الاغريقي ،ج١ ، ترجمة احمد شكرى سالم ،مكتبة النهضة المصرية، القاهرة١٩٥٨.
٣٧) بنيامين فارتن:العلم الاغريقى،ج٢، سلسلة الالف الكتاب، المكتبة النهضة المصرية،القاهرة ١٩٥٩.
٣٨) ويل ديورانت :قصة الفلسفة، ترجمة الدكتور فتح اللة محمد المشعشع، مكتبة المعلرف بيروت١٩٧٢.
٣٩) الدكتور محمود زيدان: مناهج البحث الفلسفي، لبنان ١٩٧٤.
٤٠) دكتور محمود فهمى زيدان: المنطق الرمزى، نشاتة وتطورة، دارالنهضة العرية ، بيروت١٩٧٣.
٤١) بول جانية وجبريل سياى: مشكلات ما بعد الطبيعة ، ترجمة: الدكتور يحيى هويدى،مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة ١٩٦١.
٤٢) دكتور توفيق الطويل : اسس الفلسفة، ط٥، دار النهضة العريبة، القارة١٩٦٧.
٤٣) جورج سباين:تطور الفكر السياسية ،ك١، ترجمة :حسن جلال الحروسى، دار المعارف بمصر ،ط٤، القاهرة ١٩٧٠.
٤٤) الدكتور محمد فتحى الشنيطى: المعرفة،ط٣، مكتبة القاهرة الحديثة ١٩٦٣.
٤٥) الدكتور ياسين خليل :نضرية ارسطو المنطقية، مطبعة اسعد بغداد١٩٦٤.
٤٦) دكتور ياسين خليل: منطق المعرفة العلمية(الجزء الاول من نظرية العلم)، ليبيا١٩٧١.
٤٧) دكتور ياسين خليل :منطق بحث العلمى (جزء الثانى من نظرية العلم)، بغداد ١٩٧٤.
٤٨) الدكتور زكى نجيب محمود: المنطق الوضعى،ج١ ، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة١٩٦٥.
٤٩) بول موى: المنطق والفلسفة العلوم، ترجمة: فواد حسن زكريا،مطبعة النهضة المصرية القاهرة،١٩٦٢.

٥٠) الدكتور عزمي اسلام: اسس المنطق الرمزى، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة. ١٩٧٠.
٥١) يان لوكا شيفتش: نظرية قياس الارسطية، ترجمة :الدكتور عبدالحميد صبرة، دار المعارف بالاسكندرية ،مصر ١٩٦١.
٥٢) دكتور زكي نجيب محمود: المنطق الوضعي ،ج١، ط٤ ،مكتبة الانجلو مصرية ، القاهرة ١٩٦٥.
٥٣) دكتور زكي نجيب محمود: المنطق الوضعي ،ج٢،ط٤ ،مكتبة الانجلو مصرية ، القاهرة١٩٦٦
٥٤) تارسكى، الفرد: مقدمة للمنطق ولمنهج البحث فى علوم الاستدلالية، ترجمة: عزمى اسلام، الهيئة المصرية للتاليف والنشر، القاهرة١٩٧٠.
٥٥) ا. هـ.بيسون، د.ج، اوكونر: مقدمة فى المنطق الرمزى، ترجمة: عبدافتاح الديدى، دار المعارف بمصر، القاهرة١٩٧١.
٥٦) دى.اف. بيرز: طبيعة الميطافيزيقا، ترجمة :الدكتور كريم متى، مطبعة الارشاد بغداد ١٩٦٨.
٥٧) امانويل كانت: مقدمة ميطافيزيقا يومكن انتسير علمة. ترجمة الدكتوقرة نازلى اسماعيل حسن، دار الكاتب العربى للطباعة والنشر،لقاهرة ١٩٦٧.
٥٨) امانويل كانت: تاسيس ميتافزيقا الاخلاق. ترجمة: الدكتور عبدالغفار مكاويل، الدار القومية للطباعة والنشر ،القاهرة١٩٦٥.
٥٩) نيتشة، فردريك : هكذا تكلم زرادشت، ترجمة ليكس فارس، المكتبة الاهلية، بيروت ، بدون التاريخ.
٦٠) عدد من الفلاسفة السوفييت :الجمال فى تفسيرة الماركسى، ترجمة : يوسف العلاق، دمشق، وزارة الثقافة والسياحة والارشاد، ١٩٦٨.
٦١) ديوى، جون: الفن خبرة ،ترجمة: الدكتور زكريا ابراهيم ،دار النهضة العربية القاهرة١٩٦٣.
٦٢) كولنجوود، روبين جورج: مباداء الفن، ترجمة :احمد حمدى محمود، مراجعهة على ادهم، الدار المصرية للتاليف والترجمة والنشر، بدون التارخ.
٦٣) جان مارى جويو: مسائل الفلسفة الفن المعاصر، ترجمة: د.سامى الدروبى دار اليقضة العربية .
٦٤) م. اوفسيانيكوف، ز. سمير نوفا: موجز تاريخ النظريات الجمالية، ترجمة: باسم السقا، دار الفارابى، بيروت ١٩٧٥.
٦٥) ر.ا. نيكلسون: الصوفية فى الاسلام، ترجمة: نورالدين شريبة، مكتبة الاخانجى، القاهرة ١٩٥١.
٦٦) قاسم غنى: تاريخ التصوف فى الاسلامى، ترجمة صادق نشاة. مكتبة النهضة العلمية، القاهرة ١٩٧٠.

٦٧) احمد توفيق عياد: التصوف الاسلامي، تاريخة ومدارسة والطبيعة واثرة، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة١٩٧٠
٦٨) ابوالعلا عفيفي: التصوف الثورة الروحية في الاسلام، دار معارف بالاسكندرية ١٩٦٣.
٦٩) د.كامل مصطفى الشيبي:الصلة بين التصوف والتشيع ،ج٢، مطبعة الزهراء ، بغداد١٩٦٤.
٧٠) افلاطون: الجمهرية ، ترجمة : الدكتور فواد زكريا، الهيئة المصرية العامة للكتاب ١٩٧٣.
٧١) افلاطون : تيتاتيتوس او عن العلم ،ترجمة : دكتورة اميرة علمى مطر، الهيئة المصرية العامة للكتابي١٩٧٣.
٧٢) افلاطون: بيروتاجوراس. ترجمة :محمد كماالدين على يوسف، دار الكتاب العربي للطباعة والنشر ،القاهرة- بدون التاريخ.
٧٣) جورج سارتون: العلم التقدم ولامدنية الحديثة، ترجمة: الدكتور عبدالحميد صبرة، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٠.
٧٤) افلاطون :المادبة، فلسفة الحب، ترجمة الدكتور وليم الميرى، مكتبة الدراسات الفلسفية ،مصر ١٩٧٠.
٧٥) افلاطون: فايدروس او عن الجمال ، ترجمة : اميرة حلمى مطر ، ط١، دار معارف بمصر ، القاهرة ١٩٦١.
٧٦) افلاطون : محاورات او طيفرون ، الديفاع، اقريطون، فى دون، ترجمة : د.زكى نجيب محمود، لجنة التاليف ولترجمة والنشر، القاهرة ١٩٦٦.
٧٧) افلاتون: الطيماوس و اكريتس، ترجمة : الاب فواد جرجي بربارة، دمشق ١٩٦٨.
٧٨) افلاطون : جورجياس ، ترجمة: محمد حسن ضاضا، الهيئة المصرية العامة للتاليف والنشر ،مصر ١٩٧٠.
٧٩) افلاطون: الفيلفس ، تعريب الاب فؤاد جرجي بربارة ، منشورات وزارة الثقافة ، دمشق ١٩٧٠.
٨٠) افلاطون: فى دون، ترجمة والتحقيق : الدكتورعلى سامى النشار وعباس الشربينى، دار المعارف بمصر ، قاهرة١٩٧٤.
٨١) افلاطون: السفسطائى، ترجمة الاب فواد جرجي بربارة، منشورات وزارة الثقافة والسياحة والارشاد القومى، دمشق١٩٦٩.
٨٢) ارسطو طاليس: النفس ، ترجمة : د. احمد فواد الهوانى ، ط٢، مطبعة عيسى البلبى العلبى و شركا ة ، القاهارة ١٩٦٢.
٨٣) ارسطو طاليس: علم الطبيعية، ترجمة: احمد لطفى السيد، للجنة التاليف والترجمة والنشر، قاهرة١٩٣٥.

٨٤) ارسـطو طـاليس: الـسماع الطبيعـى، ترجمـة: اسـحاق بـن حـنين مـع شـورح ابـن السمع وابـن عـددى و متـى بـن يـونس و ابـى الفـرج بـن الطيـب. (يقـع فـى جـزئين). تحقيـق عبـدالرحمن بـدوى. الـدار القوميـة للطباعـة وانـشر .القـاهرة١٩٦٤ و ١٩٦٥.

٨٥) ارسـطو طـاليس : الكونـة والفـسادط ، ترجمـة احمـد لطفـى وسـيد، لجنـة التاليف والترجمة والنشر ، ١٩٣٢، القاهرة .

٨٦) ارسـطو طـاليس: ( فـى ميليـسوس وفـى اكـسنوفان وفـى غرغيـاس ) ترجمـة : احمد لطفى السيد،مصر ١٩٣٢ .

٨٧) ارسـطو طـاليس: علـم الاخـلاق الى نيقـو مـاخوس ، ترجمـة :احمـد لطفـى الـسيد، مطبعة دار الكتب العربية، القاهرة ١٩٢٤.

٨٨) ابـن رشـيد: تلخـيص مـا بعـد الطبيعـة الارسـطو، تحقيـق الـدكتور عثمـان امـين، مطبعة مصطفى البابى واولادة فى مصر،القاهرة ١٩٥٨.

٨٩) ارسـطو : الـسياسات، ترجمـة الاب او غـستيمس بربـراة البولـسى، بـيروت ١٩٥٧.

٩٠) دكتـور عثمـان امـين:الفلـسفة الرواقيـة، ط ٣، مطكتبـة الانجلـو المـصرية، القاهرة١٩٧١.

٩١) لفيـف مـن الفلاسـفة : المـسوعة الفلـسفية المختـصرة، ترجمـة: فـواد كامـل والجماعة اخرين، مكتبة اللانجلو المصرية ١٩٦٣.

٩٢) الـدكتور زكـى نجيـب محمـود: الجـبر الـذاتى، ترجمـة: امـام عبـدالفتاح امـام، الهيئة المصرية العامة للكتاب- ١٩٧٣، القاهرة

(ئەم باسە لە ئەسلدا بە ئینگلیزی نووسراوە).

## بە ئینگلیـزی

1) BURNET.J:EARIY GREEK PHIGOSOPHY.LONDON.ADAM AND CHARLES BLACK.4TH EDETION.
2) ARISTOTLE:METAPHYSICA.OXFORDUNIVERSITY - PRESS>ENG TRANS1960.
3) NEUGEBAURE.O:THE EXACT SCIENCE IN ANTIQUITY LONDON 1952.
4) ZELLER . E: OUT LINE OF THE HISTORY OF GREEK PHILOSOP[HY . LONDON 1962.
5) STANCE W.T: ACRITI CA L HISTORY OF GREEK PHILOSOPHY. LONDON1962
6) ALLEN .REGINALD. E:GREEK PHILOSOPHY- NEWYOR 1977
7) FREEMAN .:THE PHRE- SOCRATIC PHILOSOPHY. OXFORD1946
8) JAEGER.W:THE OLOGY OF ERRLY GREEK PHILOSOPHERS OX FORD 1974
9) AYER. A.:LOGICAL POCITIVISM. 1960.
10) KHLYABICH. I"ANOUTLINE HISTORY OF PHILOSOPHY< PROGRECC PUBLESHERS MOSCOW.

## نـــــــاوەڕۆك